# پێرست

## سەرووتار

## ئەركی ئێمە و بیستەمین ساڵیادی ئەنفال

ئەنفال ئەو دۆسێیە كە ئێمە ئەمانتوانی لە بیستەمین ساڵیادی پەلامارەكەیدا وەكو هێمای جینۆسایدی نەتەوەی كورد لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیداو وەكو هێمای رێزگرتن وخزمەتكردنی كورد لە قوربانیان و خانەوادەی ئەنفالكراوەكان بناسرایە، وەلێ لە بیستەمین ساڵیادی ئەو پەلامارەدا نەتوانیومانە لۆبیەكی وادروست بكەین كە هێندەی گەورەیی ئەو كارەساتە بێت بۆ بەجیهانی ناساندنو نە توانیومانە لەسەر ئاستی ناوخۆش كارێكی وا بكەین كە كە هێمای رێز بێت بۆ ئەو سەدان هەزار قوربانیە و هێمای كارێكی باشی ئاماژە بۆ كراوبێت بۆ خانەوادەكانیان.

ئێمەی كورد تاوەكو ئێستا جگە لە شین گێڕانو پیشاندانی كەس و كاری ئەنفالكراوەكان وەكو مرۆڤێكی گوناحو شایستەی بەزەییو بە داماویی پیشاندانیان نەمانتوانیوە ئەنفال و دۆزی جینۆسایدی نەتەوەكەمان وەكو بەیداغی شەرەف بۆ خانەوادەكانیان و كارتێكی بەهێز بۆ مسۆگەركردنی ئاسایشی نیشتمانی بناسێنین.

ئەو كارانەی كە لەماوەی بیست ساڵی رابردوودا كراوە بۆ ئەنفال كە بەشێكی زۆری لەلایەن حیزبەوە كراوە، نە توانیویەتی ئامانج بپێكێت و نە توانیویەتی ئەنفال وەك خۆی بناسێنێت چونكە ئەو هەر لەبنەوەڕا خۆشی هێندەی قورسایی كارەساتەكە ئەنفالی نەناسیوە و لە ئەنفال تێنەگەیشتوە، كاركردن بۆ ئەنفال نە بەنوسینی بەیاننامەو نەبەسازدانی مەراسیمێكی سەرپێی و وتارخوێندنەوەیە، ئەنفال ئەو ئەركە ئەخلاقیو نەتەوەییو ویژدانیە ئەخاتە سەرشانمان كە چیتر بەم كارە رۆتینانەو بەم شێوە سەرپێیانە نابێت قسە لەسەر ئەنفال بكرێت، ئەمانە هێندە لە خزمەتی بچووككردنەوەی ئەنفالدان هێندە هۆكارێك نین بۆ تەعبیركردن لە ئەنفال، بەڵكو كاركردن لە دۆسیەی ئەنفالدا دەبێت بەبێ تموحی ساسی و بە بێ چاوبرینی ماددیو خۆبردنە پێشەوەو دەركردنی ناوو ناوبانگ بێت.

كورد دەبوایە لە بیستەمین ساڵیادی گەورەترین كارەسارەساتی قڕكردنی لەمێژودا خاوەنی چەندان كەناڵی جیاجیا بوایە بۆ قسەكردن لەسەر رەهەندەكانی ئەنفال، بەلانی كەمەوە دەبوایە لەپێناو بەزانستیكردنی ئەنفالدا ئێستا چەندین كۆلێژ و بەشی لە زانكۆكانی كوردستاندا هەبوایە بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر ئەنفال، خاوەنی دامەزراوەو سەنتەری زانیاری تۆكمە بوایەو ناوەندێكی گەورەی دۆكۆمێنتی هەبوایەو بەڵگەنامەو گێڕانەوەكانی تێدا ئەرشیف كردایە، خاوەنی چەندان كادری پرۆفیشناڵ بوایە لە بوارەكانی جینۆساید و ئەنفالدا، چەندان رێكخراو دەزگای نێوخۆو نێودەوڵەتی تایبەتی هەبوایە، دەبوایە ئێستا هەزاران لێكۆڵینەوەی زانستیو سەدان كتێبی نایابی لەبەردەستدا بوایە، لەڕووی ئەو قەیرانو كێشانەوە كە ئەنفال بە دوای خۆیدا هێنای دەبوایە ئێستا خانەوادەی ئەنفالكراوەكان لە شایستەترین شوێن و بەشایستەترین هۆكاری گوزەران بژینایە، لەرووی دەروونیەوە قەرەبووی مەعنەوی بكرانایەتەوەو مەدالیای شەرەفی نیشتیمانیان پێوە بوایە لەرووی كۆمەڵایەتیەوە دەزگای تایبەتو بڕی ماددی تایبەتیان بۆ تەرخان بكرابایەو چارەسەری كێشە كۆمەڵایەتیەكانیان بكرایە، لەرووی ئابووریشەوە لە ئاستێكی گوزەرانی باشدا بونایە. بەڵام ئەوەی ئێستا دەیبینین لەم ساڵیادەدا تەواو پێچەوانەی ئەو كارانەیەو بەرنامەیەكی واش لە گۆڕێ نیە كە لە ماوەی دەساڵی داهاتوودا ئەنجام بدرێت، كەوایە، ناشبێت هەموومان دەستەوەستان بووەستین و چاوەڕوانی هێزێكی بان سروشت بین تا لە جیاتی ئێمە كارەكان ئەنجام بدات، كاركردن بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم كارانە بە پلەی یەكەم لەسەر ئەستۆی حكومەتی كوردییەی و بە پلەی دووەم لەسەر ئەستۆی تەواوی چین و توێژەكانی كۆمەڵگەی كوردییە، ئێمە لە (گۆڤاری عەرعەر) كاركردن لە پێناو بە ئامانجگەیاندنی دۆزی ئەنفال ئەم كارانە بە ئەركێكی لە پێشینەی خۆمانی دەزانینو بێ وچان هەوڵی پراكتیكانەی بۆ دەدەینو گۆڤارەكەمان كردووە بە سەكۆیەك بۆ خستنە رووی بابەتە ئەكادیمی و زانستیەكانو بڵاوكردنەوەی گێڕانەوەی چیرۆكە راستەقینە مرۆڤ هەژێنەرەكان، هەروەها ئەو پەیامەی ئێمە هەڵمان گرتووە راگەیاندنی جەنگێك نیە بەرانبەر بەكەس، هێندەی گەراندنەوەی حورمەتە بۆ نەتەوەیەك و ئومێدە بۆ كەسانێك كە ساڵانێكە بە بێ ئومیدی رۆژ دەكەنەوە.

**سەرنوسەر**

# دۆزی جینۆسایدی خەڵکی کوردستان، ڕۆڵی کۆمپانیاو دەوڵەتانی بیانی و ڕۆژئاوایی لە جینۆسایدی خەڵکی کوردستاندا

ئەمیر قادر

**کورتەیەکی مێژوویی لەسەر کۆمەڵکوژی و جینۆسایدی خەڵکی کوردستان:**

ئەگەر لەم پێناسە سەرەتاییەی جینۆسایدەوە دەستپێبکەین کەلەبەندی دووی پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتوەکانی ساڵی ١٩٥١دا هاتووە، کەبەم شێوەیە پێناسەی دەکات (هەریەك لەم کردەوانەی کەمەبەستی لەناوبردنی هەموو یان بەشێك لە نەتەوەیەك یان ئێتنیکێك یان تیرەیەك یان گروپێکی مەزهەبی، لەچەشنی لەناوبردنی تاکەکەنی ئەو گروپە، سزادان و زیان لێدانی جسمی و ڕۆحی لەو گروپە، سازدانی بارودۆخێکی نالەباری وابۆ ئەوگروپە کەئامانج لێی لەناوبردنی فیزیکی هەمووگروپەکە یان بەشێکی بێت، سنووردانان یان بەرتەسك کردنەوەی منداڵ بوون و گەشەکردنی گروپێك، بەزۆر ڕاگوێزان یان گواستنەوەی یان کردنی منداڵانی سەر گروپێك بە گروپێکی تر).

ئەگەر بەم پێوەرە سەیری لانی کەمی مێژووی عێراق و دەوڵەتی عێراقی و ڕژێمەکانی بکەین و زۆر قووڵ نەبینەوە لەمێژوودا، تەنها لەساڵی ١٩٦١ بەدواوە سەیر بکەین و بکرێت سەرنجێکی کورت لەهەندێك حاڵەت بدەین نەك هەموو حاڵەتەکان دەتوانین لانی کەم لیستێکی بەم جۆرەمان دەستبکەوێت:

١- دەوڵەتی قاسم لەساڵی١٩٦١ تا ١٩٦٢، بەپاڵپشتی زۆرینەی سوپای عێراق ١٥٠ دێهاتیان لەکوردستاندا سوتاند و لەگەڵ زەویدا تەختیان کردن، زیاتر لە ٣٠٠٠ ژن و منداڵ و خەڵکی سیڤیل کوژران و بەهەزاران خێزان و ماڵ ئاوارەو سەرگەردان بوون.

٢- لەگەڵ هاتنەسەردەسەلاتی بەعسیەکاندا، هەر لەساڵی ١٩٦٣وە کۆمەڵ کوژی خەڵکی کوردستان پەرەسەندنێکی بەرچاوتری بەخۆوەبینی، هەرلەم ساڵەدا لەناوچەکانی کەرکوك و هەولێردا دەیەها گوندیان سوتاند وڕوخاندو لەسەرنەخشە سڕیەوەو سەدان کەسیان لەناوبردو هەزاران کەسیشیان ئاوارەکردو داواتر ئەوناوچانەیان تەعریب کردن و لەهەمولایەنێکەوە سیمای کلتوری و دیمۆگرافیان

گۆڕین و هیچ سیمایەکی کوردستانیان پێوەنەهێشتن، تەعریب کەدواتر بووبەیەکێك لەکۆڵەکەکانی سیاسەتی عەرەبی و بەعسیەکان لەعێراقداو یەکێك لەچەکە گرنگەکانی پاکتاوی ڕەگەزی و جینۆسایدی خەڵکی کوردستان لێرەوە چەکەرەی کرد، هەر لەبەرانبەر ئەمەدا یەکێتی سۆڤیەت یاداشتێکی دایە نەتەوە یەکگرتووەکان و تیایا مەسەلەی جینۆسایدی خەڵکی کوردستانی باسکردبوو.

٣- لەزۆرێك لەدۆکومێنتەکاندا باس لە شاڵاوەکانی دەوڵەتی عێراقی کراوە لەساڵانی ١٩٦٥ بەدواوە، کەهەرلەوێشدا باس لەبەکارهێنانی گازی ژەهراوی دەکرێت دژ بە خەڵکی کوردستان و دواتر گوند سوتاندن و کوشتنی بەکۆمەڵ لەلایەن ڕژێمەوە دەگاتە ئەوپەڕی خۆی.

٤- لە دژی شۆڕشی ١٩٧٤دا بەعس سەرجەم خاك و سروشت و خەڵکی کورستانی کردبوو بە ئامانج، بەهەزاران تەن ناپاڵم وبۆمب و چەکیان دژ بە هەرچەشنە زیندەوەرێك بەکارهێناو هەزاران گوندسوتان و بە هەزاران خەڵك بوونە قوربانی و سەرجەم خەڵکی کوردستان ئاوارەو سەرگەردان بوون، وەختێك ڕژێم بەم هەموو هێزەوەو بە پاڵپشتی مۆدێرن ترین چەکە کانی ئەوکاتەی سۆڤیەت و فەرەنساو غەربو ئەمریکادا نەیتوانی سەرکەوتوبێت، پەیمان نامەی جەزائیری لەگەل شای ئێرانداامۆرکرد، کەناوەرۆکی ئەوپەیمان نامەیە بریتیبوو لەدانی بەبەشێك لەزەوی و ئاوی عێراق بە دەوڵەتی ئێران لەبەرانبەر پشت شکاندنی شۆڕشی خەڵکی کوردستاندا، کە ئاکامەکەی دواتری شەڕی ٨ ساڵەی عێراق و ئێران بوو لەسەر هەمان ڕێکەوتن و هەر لەسەرەتای ڕێککەوتنەکەشداو لەگەڵ گەیشتنی دەستی ڕژێمی بەعس بەناوچە شاخاوی و دوورەدەستەکان، دەستی کرد بەسوتاندنی دێهات و ناوچەکان و ڕاگواستنی خەڵکەکەی بۆ ئۆردوگا زۆرەملێ و کۆنترۆڵ کراوەکان، نموونەی ناوچەکانی ئاوەژێ و چنارنێ و ناوچەکانی گەلاڵەو دۆڵی جافایەتی و...دروست کردنی ئۆردوگاکانی ناوچەی بازیان بوو، لێرەوە سیاسەتی ڕاگواستنی بەزۆرەملێ دەستی پێکرد، کەیەکێکی تر لە کۆڵەگەکانی سیاسەتی جینۆسایدی خەڵکی کوردستانە، ئەمە هاوکاتیش بوو لەگەڵ کۆنترۆڵ کردنی داهاتوو جۆری ژیان لە ئۆردوگاکاندا کەلەپەنایدا، سیاسەتی بەزۆر بەبەعسی کردن وپاداشت کردنی بەعسیەکان وسزادانی نابەعسیەکان وزاڵکردن وبەپیرۆزدانانی کەلتور و زمانی عەرەبی کە هاوکاتبوو لەگەڵ بەعەربی کردنی بەزۆری هەموو قۆناغەکانی خوێندن، کەدەکرێت بەڕوونی لەم قۆناغەدا کە قۆناغی پاشەکشەی

شـۆڕش و تێکـشکانی بـوو، زاڵ بـوون و پێـوانی هـەموو بارۆمێتـەرەکانی سـڕینەوەی فیزیکـی و نەتـەوەیی وفەرهـەنگی و دیمـۆگراف بـە ئاسـانی ببـینی و تیایـدا بنەماوڕەگـەزە گرنگەکانی جینۆساید ببینین.

٤- دوای وێرانکردنـی زۆرێـك دێهـاتی ناوچـەی بادینـان لەسـاڵی ١٩٨٣دا ڕژێمـی بـەعس لـەئۆردوگاکانی زۆرەملێـی بەحرکـەو قوشـتەپە ٨٠٠٠ بـارزانی سـەرنگوم کـردو لەبیابانەکانی خواروی عێراقدالەناوی بردن.

٥- هەشـت کـردەوە سـەربازیەکەی ئـەنفال لەلایـەن ڕژێمـی بەعسەوە لـە نێـوان سـاڵی ١٩٨٧. تا ١٩٨٩. بە ئامادەکاری و ئەنجامدانیـەوە، کتـێبی عێراق و تـاوانی جینۆسـاید، شالأوی ئەنفال دژی کورد بەم جۆرەئەم تاوانە پوخت ئەکاتەوە:

* تیربـارانکردنی بەکۆمـەڵ و سـەرنگووم کردنـی بەکۆمـەڵی دەیـان هـەزار لەخـەڵکانی شـەڕنەکەر، لەوانـە ژمارەیـەکی زۆر ژن و منـداڵ و هەنـدێ جـاریش تێکـڕای دانیـشتوانی گوندەکان.

* بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بەشێوەیەکی بەربڵاو، لەوانە گـازی مۆسـتەرد و گـازی ئەعساب یـان سـارین، لەهەڵەبجـەو دەیـان گونـدی کوردسـتان، کـە بـووە هـۆی کوشـتنی هەزارەهاخەڵك، کەزۆربەیان ژن و منداڵ بوون.

* وێرانکردنــی ٢٠٠٠ گونــد، کەلەدۆکومێنتــەکانی حکومەتــدا واباســکراون کــە: سـوتێنراون، کـاولکراون، تـەختکراون، پـاك کراونەتـەوە، وەهـەروەها بەلایـەنی کەمـەوە دەیان شارۆچکەو مەرکەزی ئیداری گەورەتر ی وەك ناحیەو قەزاکان وێرانکراون.

* بـەتێکڕایی وێرانکردنـی ناوەنـدە سـیڤیلیەکان لەلایــەن ئەنـدازیاری سـوپاوە، بـە قوتابخانەو مزگەوتو بیری ئاوو بینای تریشەوە لەگوندەکاندا کەدانشتوانیان تێدانەبوو.

* بەتالأنبردنی موڵك و ماڵ و ئاژەڵی کێڵگـەکانی خـەڵکی سڤیل بەشێوەیەکی فراوان لەلایەن هێزەکانی سوپاو میلیشیاکانی سەر بەحکومەتەوە.

* گـرتنی بـەگۆترەی گوندنـشینەکان لەناوچـە قەدەغەکراوەکانـدا هەرچـەندە ئەمانـە ماڵو موڵکی خۆشیان بوو.

* گـرتن و حجزکردنـی بـەگۆترەی دەیـان هـەزار ژن و منـداڵ و خـەڵکی بـەساڵأچـوو بۆچەندین مانگ لەهەلومەرجی نالەباردا بەبێ ئەمری دادگا...، کەدەیان هەزاریان بە هـۆی بەدخۆراکی و بە نەخۆشی مردن.

*بەزۆر ئاوارەکردنی سەدان هەزار لەگوندنشینەکان لەڕێگەی کاولکردنی ماڵەکانیان.

*** داڕوخاندنی ئابوری و ژێرخانی دێهاتەكان.**

**بەسەرنجدان لەكردەوەكانی دەوڵەتی قاسمەوە لەساڵی ١٩٦١ تا كۆتایی ساڵی ١٩٨٩و پەلامارەكانی ئەنفال و دواتر لەپەلامارەكانی بەعسدا دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١و ئاوارەیی چەند ملوێنی خەڵكی كوردستاندا، هێڵێكی هاوبەش هەیە، كوشتنی بەكۆمەڵی خەڵك بەژن و منداڵ و فەرق نەكردن لەهەر پەلامارو كردەیەكدا لەنێوان چەكدارو خەڵكی سیڤیلدا، سوتاندن و وێرانكردنی دێهاتەكان و سڕینەوەیان لەسەرنەخشە، ئاوارەكردن و ڕاگواستنی خە ڵكەكان و جێگرتنەوەیان لەزۆرحاڵەتدا بە خەڵكی عەرەب و پیاوانی دەسەڵات،گوڕینی دێمۆگرافیای ناوچەكان، گۆڕینی زمان و ناسیۆنالی خەڵكی كوردو بەكارهێنانی زەمینەو فشار بۆ ئەم كارەو هەمواركردنی یاسایی بۆ ئەم ئاڵ و گۆڕە..، كە ئەگەر هەر یەك لەمانە بخەینە ژێر گەردبینی پێناسەكەی كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە دەربارەی جینۆساید، مەسەلەی جینۆسایدی خەڵكی كوردستان و فاكتەكانی بەئاسانی دەبینین، كە ئامانج لەم كردانە نەهێشتن و لەناوبردنی مێنتاڵ و فیزیكی خەڵكی كوردستانە، سەرجەم دادگاكانیش كە تائێستالەبارەی تاوانەكانی كۆمەڵكوژی یان تاوانبارانی ئەم بوارە كراون بۆنمونە دادگای شاری دینهاخی هۆڵەندا تایبەت بە دۆزی بازرگانی تاوانباری چەكە كیمیایەكانی ڕژێمی بەعس فرانس ڤان ئانرات كە نزیەكەی ٣ ساڵی خایاندو تاوانبار سزای ١٧ ساڵ زیندانی وەرگرت باس لەوەدەكات كە فرانس لە دۆزێكدا بەشدارە كە بەباشی هێماكانی جینۆسایدی تیادا دیارە.**

**لەكاتی پێداچوونەوە بە دۆزی فرانس فان ئانراتدا لەدادگای لاهای پارێزەری گشتی و هەردوو ئۆفیسەرانی وەزارەتی داد (ئیَ.ڤان دای) و( ئێس.ئا، مینكس) لە ڕۆژی ٢٥-٠٤-٢٠٠٧ دا تاونبار فرانس ڤان ئانرات و مەسەلەی جینۆسایدی خەڵكی كوردستانیان بەدورودرێژی خستەڕوو پوختەكەی بەم شێوەیەیە كە زۆر بەڕوونی پیَ لەسەر جینۆسایدی خەڵكی كوردستان و دەوری فرانس ڤان ئانرات داداگرەێت، هێڵی تەئكیدەكان هی منە:**

**(فرانس ڤان ئانرات لەسەر داخوازی سەعدولا فەتحی* لەسەرەتای ساڵانی هەشتادا ماددەكیمیایەكانی لەوانە (تی دی جیTDG، پی ئۆ سی ئێڵ سری POCL3). لەڕێگای كۆمپانیای (سیۆرغی SEORGI) **ەوە داوە بە حكومەتی عێراق.**

– ئـەم دوو ماددەیـە بـەکارهاتوون وەك مـاددەی بنـەڕەتی بـۆ بەرهـەم هێنـانی گـازی ئەعساب و گازی مۆستەرد، وە ئەم گازانە لە گولەو تەقەمنیەکانی عێراقدا بەکار هاتوون.

–بڕی ئـەو ماددانـەی کـە تاوانبـار داویـەتی زۆر زۆرە، لانـی کـەم بـڕی ١١١٧مـەتر تـەن ماددەی (تی دی جی). ئەم بڕە بڕێکی زۆر لـەوە زیـاترە کـە بـۆ هـێچ ئامـانجێکی نۆرمـاڵ و مەدەنی بەکاربێت، ئەمە لەکاتێکدایە کە تاوانبار خۆی دانی بەوەداناوە لـەلای شـەریك و هاوکارەکەیدا کە عێراق لەو ساڵانەدا بـەهۆی جەنگـەوە پیشـەزایە مەدەنیـەکانی نـەمابوون یان زۆر زۆر کەمبوون.

–لەسـاڵی ١٩٨٤ وە زۆربـەی وڵاتـان بازرگانیکردنیـان بـەم ماددانـەوە قەدەغـەکردووە، بەهۆی ئـەوەی کـە زانیویانـە ئـەم مادانـە بـۆ بەرهـەم هێنـانی چـەکە کیمیایـەکان کـەڵکیان لێوەردەگیرێت.

–تاوانبـــار لـــەکاتی گواســـتنەوەو بـــەڕیکردنی ئـــەم مـــاددە بنەڕەتیانـــەی ســـەرەوەدا دۆکومێنـــت و نـــاوەرۆکی شـــتەکانی شـــاردۆتەوە و تـــەزویریکردوون، یـــان مەســـیری گەیـشتنەکانی بـەفێڵ و هەڵـەداوە، شـوێن و شـێوەی دانـی پارەکـانی شـاردۆتەوە یـان گۆڕیوە، بە شێوەیەکی ئاگاهانە زانیاری هەڵەی داوە بەو کۆمپانیایانەی کە ماددەکانی لێیان کڕیوە، لەوانە ماددەی (تی دی جی)، تائەو ڕادەیـەی کـە ئـەو کۆمپانیایانـە (لەگـەڵ پرسیاری بەردەوامیان لەسەر مەسیری ئەو ماددانە) ڕاستیەکانیان لێشاردراوەتەوە کە ئـەو مادانـە دەنێردرێن بۆعێراق! (کـە ئەمـەش ژێـر پـێ خستنی یاسای ناودەوڵـەتی بـووە کـە قەدە غەی ئەمەی کردبوو).

– بەهاوکاری و هۆی ئەم گازانەی فرانس ڤان ئانراتـەوە (مۆسـتەرد و گـازی ئەعسـاب) لانـی کـەم دەیـان هـەزار کـەس بوونـە قوربـانی لـە عێـراق و ئێـران، بەکاریگەریـەکانی ئـەم چەکانە تائێستاش هەزاران کەس دەناڵێنن و پەکیان کەوتووە.

–لـە عێراقـدا بـەکارهێنانی ئـەم گـازە ژەهراویانـە دەورێکـی گرنگیـان لـە کەمپـەینی جینۆسـایدی کوردەکانـدا بـووە کـە بـەم هۆیـەوە سـەدان هـەزار کـورد لـە دێهاتـەکانیان دەرپـەڕێنراون، لـەناوبردراون، بـەهۆ و بەرئـەنجامی ئـەم بۆمبابارانکردنانـە دواتـر ڕەمـی کراوون یان لەکەمپەکاندا دەستبەسەربوون کە ئامانج لەناوبردنیان بووە.

–ئـەم کەمپـەینی جینۆسـایدە ئەنجامەکـەی لانـی کـەمی چـەندین هـەزار کـوژراو و قوربـانی لێکەوتۆتـەوە و بۆتـە هـۆی لـەناوبردنی ڕاسـتەوخۆی زۆربـەی دیهاتـەکانی کوردستانی عێراق.

–ئەگەر ئەو نەیزانیبێت و ئەوە بڵی کە ئاگادارنەبووە گازی مۆستەردو ئەعساب لە لایەن عێراقەو لە شەڕدا دژ بەئێران بەکارهاتووە بەشێوەیەکی بەربلاو، ئەو ئاگاهانە چاوی خۆی لە بەرانبەر ئەم ڕاستیەدا دادەخات، ئەگەر ئەو نەیزانیبێت و ئەوە بڵی کە ئاگادارنەبووە کە کوردەکان لەعێرقدا بەشێوەیەکی بەرفراوان هەلاوردراون، لەسەرماڵ و مڵکیان بەزۆر دەرکراون، لە کەل و پەلە زۆر سەرەتاییەکانی ژیان بێبەشکروان، کوژراون، وە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧وە بە گازی مۆستەرد و ئەعساب بۆمبابارانکراون، تاونبار زۆر ئاگاهانە چاوو گوێی لە بەرانبەر ڕاستیەکاندا داخستووە، بەو هۆیەی کە ئەوکات زۆر بەفراوانی لە میدیاکاندا ئەم شتانە هەبووە وە ئەویش ئاگاداربووە، ئەویش وەك بازرگان دەبوو وە ئەرك بوو لەسەری کە دەبوو ئەوە بزانێت کە نەدەکرا بارەکانی ئەو وە چەکەکانی ئەو بدرێن بە عێراق.

– تامانگی ٣–١٩٨٨فرانس ڤان ئانرات چانسێکی کەمی هەبووە کە باسی ئەوەی بکردایە کە چەکەکانی ئەو دەورێکی گرنگیان نەبووە لە تاوانی چەنگ و تاوانی جینۆساید دا.

–لە مانگی مارتی ١٩٨٨دا ڤان ئانرات وێنەکانی پەلاماردانەکانی هەڵەبجەی بینیوە. لەوێدا ئاشکرایە کە ژمارەیەکی زۆر منداڵ و ژن بوونە قوربانی ئەو پەلامارە بە چەکی کیمیایی، ئەو بۆ جاری یەکەم ڕووبەڕوو بوو لەگەڵ ئەوەی کە بەو چەك و مادانەی ئەو ئەم پەلامارەکراوە و ئیمکانی بووە.

–بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمەی زانیوە وەبینیوە فرانس ڤان ئانرات لە بازرگانی و کارەکانی خۆی نەوەستاوە وەبەردەوام بووە، ئەو لەمانگەکانی شەش و دواتریش زۆرجار چووەتە عێراق وە بەلایەنی کەمەوە تا مانگی دیسامبەری ١٩٩٨ بەردەوام بووە لەسەر بازرگانی و کارەکانی لەگەڵ کۆمپانیای (سیۆرغی عێراقی) تاگرتنەکەی لە ئیتالیا، تاوانبار بەلانی کەمەوە تا مانگی ئۆگستی ١٩٨٨ ماددەکانی داوە بەسیۆرغی و بەو مادانەش چەك بەرهەم هاتووە، ئەو بە لایەنی کەمەوە نزیکەی نیوساڵ دوای مارتی ١٩٨٨ بەهەمان گوڕو هەڵپەوە خەریکی بازرگانی و پەیداکردنی ماددەکانی کیمیایی بووە بۆ عێراق، لەوانە داواکاری و ڕێکخستنی و بەڕێ کردنی گازی (تی دی جی) بۆ عێراق، ڕێگەی نوێ دۆزینەوە بۆ بەڕێ کردنی ماددەکان و فێڵکردن لە دەزگاکانی کۆنتۆڵ و گومرگ، تەزویکردنی دۆکومێنتی ماددەکان، ناوی بەدرۆ و ناڕاست دۆزینەوە بۆ گازی

(تی دی جی)، گۆڕینی مەسیری بازرگانیەکان بەڕیگای زۆر سەیر و نائاسایدا، ئەو تا مانگی شەش و حەوتی ١٩٨٨ سەرپەرشتیاری کردووە و دەمسپی شەریکەی (سیۆرگی) بووە و مامەڵەی بۆیان کردووە وە پارەی لەپای ئەم کارانەی وەرگرتووە.

– پارێزەری گشتی پێی وایە کە ئەوان بە شێویەکی یاسایی وە یەك لاکەرەوە ئەوەیان سەلماندووە کە تاوانبار فرانس ڤان ئانرات تاوانبارە بە تاوانی هاوکاری کردن لە گەڵ ڕژێمی بەعسدا لە عێراق و جینۆسایدی خەڵکی کورد لەساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨دا، هەروەها هاوکارە لە تاوانی شەڕدا کە لە دژی خەڵکی ئێران کراوە لەساڵانی ١٩٨٦ تا ١٩٨٨.

– ئێمە لە داخوازی نامەکەماندا کەپێشتر داومانە و پلەی گەورەیی ئەو تاوانەمان ڕوونکردۆتەوە، وە ناشمانەوێت لێرەدا ئەوە دووبارەبکەینەوە، بەڵام پەنچە دەخەینە سەر ئەوە و لەسەر ئەوە جەخت دەکەین، کە هەڵس و کەوتەکانی تاوانبار وە تاوانەکە زۆر ئاشکرا و بێئەملاوئەولایە و گەورەیە کە شایانی گرانترین و توندترین سزایە، ئەگەر ئەو تاوانە ١٥ساڵیش بێت، ئێمە لامان وایە کە سزایەکی گران کە لەگەڵ ئەم تاوانەدا بێتەوەو هێمایەکیش بێت بۆ ئەوانەی کە ئەم کارە نابەجێیانە دەکەن، دەبێت ئەوەش بزانین کە هیچ سزایەك قەرەبوو یان بەرانبەر ناوەستێت لەگەڵ قەبارەی ئەو هەموو قوربانیە و ئەو هەموو زیانانەی کە بەرئەنجامی ئەم تاوانەن).

وێڕای ئەوەی دادگا بڕیاری سزایەکی زیاتری بۆ فرانس ڤان ئانرات بڕیەوە لەو سزایەی کە پێش پێداچوونەوەکەبوو کە لە ١٥ ساڵەوە بووبە ١٧ ساڵ و هەمان دادگاش لەسەر ئەوە دوودڵ نەبوو کە هێمای زۆر بەهێزهەن بۆ جینۆسایدکردنی خەڵکی کوردستان و بەتایبەتیش کە پەیوەندی تاوانبار لەدادگای عێراقدا لە ١٩-١٢-٢٠٠٦دا زیاتر ڕوون بوەوە لەگەڵ سابر دوری و عەلی حەسەن مەجیدا و نامە تایبەیەکەی فرانس بۆ سەدام و ڕوونکردنەوەی ئەوەش کەتاوانبار بۆ دەزگای مخابراتی عێراقی کاری کردووە، کەمترین گومانی هێشتەوە، بەڵام بەو هۆیەی کە دادگا بۆسزادانی تاوانبارێك پێکهاتووە و بەتایبەتی بۆ مەسەلەی جینۆساید کە مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆزە پێك نە هاتووە بۆیەلەبارەی مەسەلەی جینۆسایدەوە نەیتوانی بڕیاربدات، وێڕای ئەوەش ئەم دۆزە هێشتادا دانەخراوەو هەروو لا داوای پێداچوونەوە لەداگای باڵادەکەن و دادگای مەدەنی و ئەو لایەنانەی تر کەدەوریان هەبووە لەم تاوانەدا وەك کۆمپانیاو کەسایەتی

سیاســی و بازرگانیــەكان دوای بڕیارەكــەی دادگــای بــالاّ هــەنگاوەكانی داوتریــان دەردەكەوێت.

**دەوری بازرگان و كۆمپانیا بیانیەكان لە جینۆسایدی خەڵكی كوردستاندا**

پــرۆژەی بەرهــەم هێنــانی چــەكە كیمیاویــەكانی عێــراق تــازەنین، بــەعس هەرلەســەرەتای هاتنەســەركاریەوە پــرۆژەی هــەبووە، هــەموو لێكۆڵینــەوەكان لەســەر ئەوە یەكدەگرنـەوە كـەعێراق لەسـەرەتای سـاڵانی ١٩٧٠وە كـاری كـردووەو لەتاقیگـە تایبەتیەكانـدا خـەریكی گەشـەپێدان ودروسـتكردنی چەكە كیمیـاوی و بایەلۆژیـەكان بـووە، لـەدوای ١٩٧٤ توانیویـەتی بـەبڕێكی كـەم ئـەم گازەبەرهـەم بێنـێن ، ڕێكخـراوی (كامیپنی دژی بازرگانی چەك لەهۆڵەندا لەلێكۆڵینەوەیەكی تێروتەسەلدا كە لـەكتێبی هۆڵەنـداو ئەوچــەكە كیمیاویانــەی كــە بــەعێراق دراون) زۆر بــەوردی لــەم بــارەوە لێكۆڵیەنـەوەیان كـردووە لـەم لێكۆڵینەوەیـەدا بـاس دەكـات كـە عێـراق دوای میسر خـەریكی برەوپێدانی ئـەم گازانـەبووە، بەتایبـەت كەمیسر لەشـەڕدا لەبەرانبـەر یەمـەن ئەوگازانــەی بــەكارهێنا لــەكۆتایی ســاڵانی شەســتدا و دەوری گرنگــی ئــەم چــەكە لەشەڕدا بۆ ڕژێمی عێراق دیاربوو، هەر لەم لێكۆڵینەوەنەشدا دەردەكەوێت كـە میسر لــەدونیای عەرەبــدا دەوری زۆر گرنگــی بینیــووە لــەهاوكاری مــەوادو تــەكنیك و پـسپۆڕدا، لەگەشـە پێـدان و بەرهـەم هێنانـدا، عێـراق لەسـەرتای سـاڵانی هەشـتادا توانای ئەوەی هـەبووە كەبە ڕێژەیـەكی دیـاری كـراو گـازی ئەعساب بەرهـەم بهێنێت، ئەم بەرهـەم هێنانە لە سەرەتاوە لەكۆمپانایایـەك یـان پرۆژەیـەك بـەناوی- الحازن بن الحیتم- و كە لـە شاری مسەنا بـووە كە بە بەشێكی گرنگی و تایبـەتی پرۆژەكـانی ئەوشـارە پیـشەسازیەی عێـراق بـووە، هەنـدێك سەرچاوەباسـی ئەوەدەكـەن كـە ئـەم كۆمەڵگاپیشەسازیە بەیـەكێك لەگـەورەتین كۆمپانیاكـان دەنراوە لـەدونیادا بۆ بەرهـەم هێنانی چەكی كیمیـاوی لەدونیادا، سـەرجەم بەشـەكان كـەل و پەلـەكانی و لـەوڵاتانی دەرەوەو ڕۆژئاواوە هینراون لەلایەن بازرگان و كۆمپانیاكانەوە.

دەكرێت بەكارهێنانی ئەوگازانە لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە لەجەنگدا بەم شێوەیە كورت بكەینەوە، نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت كە لە هەندێك لەدۆكومێنتەكانی سریەكانی تاقی كردنەوەی ئەم چەكانە باس لـەوەدەكات كـە بۆ چەندین جار ئەم چەكانە لەسەر گیراو و دیلەكان و زیندانیە سیاسیە كوردەكان تاقی كراوەتەوە.

| ساڵی بەکارهێنان | جۆری گازو ناوچەکە |
|---|---|
| ساڵی ١٩٨٠ و ١٩٨١ | گازی ئەعساب لەکاتی جەنگی عێراق و ئێراندا ناوچەی ئەهواز |
| ساڵی ١٩٨٢ | گازی ئەعساب لەکاتی جەنگی عێراق و ئێراندا |
| ساڵی ١٩٨٣ | تاقی کردنەوەی گازی کیمیاوی لەسەر زیندانیە کوردەکان، بەکار هێنانی گازی مۆستەرد لە ناوچەی حاجی هۆمەران، بەکارهێنانی گازی کیمیاوی لەناوچەی پێنجوین |
| ساڵی ١٩٨٤ تاساڵی ١٩٨٦ | بەکار هێنانی گازی کیمیاوی لە دورگەکانی مەجنوون، گازی تابوون لەکاتی جەنگی عێراق و ئێراندا بۆیەکەم جار، بەردەوام بەکار هێنانی ئەم گازانە لەبەرەکانی شەڕداو ئاشکرابوونی ئەم کارە لە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاگادارکرنەوەی عێراق لەم بارەیەوە |
| ساڵی ١٩٨٦ تا ساڵی ١٩٨٧ | کیمایاباران کردنی ناوچە کوردیە سنوریەکانی ئێران بە گازی تابوون و ئەعساب لەوانە سەردەشت، بانە،مەریوان،زەردە،و ناوچەشاخاویەکانی تر |
| ساڵی ١٩٨٧ تا ١٩٨٨ | بەکار هێنانی بەشێوەیەکی فراوان گازە کیمیاویەکان (سارین، تابوون، گازی ئەعساب، سیانید) دژی دانیشتوانی کورد و دێهاتەکان (ناوچەکانی دۆڵی بالیسان، هەموو ناوچەکانی ئەنفالی یەك تا هەشت و دێهاتەکانی، لەناو ئەوانەشدا شاری هەڵەبجە.) |

عێراق ئەو وڵاتەی کە سامانێکی گەورەی هەیەو، خەزنێکی زۆری نەوتی هەیەو لەوساڵانەدا ژمارەی دانیشتوانەکەی لە ١٨ ملوێنی تێپەڕنەدەکرد و ناردنە دەرەوەی نەوتی یەکجار بەرزبوو و سەروەت و سامانی یەکجار زۆر بوو ئەگەر لەبەرانبەر ژمارەی دانیشتوانەکەی بیپێوین و سەیری بکەین!

ڕژێمی بەعس باوەڕی بە مانەوە لەدەسەلاَتدا هەتا مردن هەبوو، بۆ ئەمەش پێویستی بە باشترین سوپاو نوێترین چەك هەبوو بۆ خۆپاراستن لەبەرانبەر هەموو دوژمنێکی دەرەکی و ناوەکیدا، لەزۆر دۆکومێنتدا دەردەکەوێت کە سوپاو هێزە تایبەتیەکانی عێراق لە ولاَتانی ئەڵمانیاو فەرەنساو ڕوسیاو ئەوروپاو ڕۆژهەلاَت بارهێنراون و ئامادەکراون، لەدۆکومێنتەکاندا ئەوە دەردەکەوێت کە لەکاتی بۆمباباران و کیمیابارانی ناوچەیەکی کوردستاندا فرۆکەوانەکان فەرەنسی بوون وفرۆکە میراجەکانی عێراقیان لێخوڕیوەو فرۆکەوانە عێراقەکانیان بەڕێوەبردووە لەکاتی هەڵمەتەکاندا، عێراق بۆ خۆ ئامادەکردن و بردنەوەی شەڕو هێشتنەوەی دەسەلاَت لەدەستی ڕژێمی بەعسدا تۆڕێکی فراوان لە بازرگان و کۆمپانیاو ولاَت ودەسەلاَتدارانی ولاَتانی لەپشتەوە بووە. ولاَتێك کە توانای ناوخۆیی بۆ بەرهەم هێنانی خۆماڵی زۆر نزمبووە، یەکێك لە گەورەترین کۆمەڵگای پیشەسازی بەرهەم هێنانی چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی هەبووە لە دونیادا لە سالاَنی هەشتادا بازرگانەکانی چەکی کیمیاوی پارچەکانی پرۆژەکان و مادەکیمیاویەکانیان لە یابان و سنگاپورو ئەمریکاو ئەوروپاوە بەڕێگەی جۆراوجۆردا بەندەری ڕۆتەردام، ئەنتوێرپن، عەقەبە، ئیتالیاو ڕێگای ئاوی و وشکانی تورکیاوە گەیاندۆتە عێراق.

لەناو ئەو ولاَت و کۆمپانیایانەی بازرگانیان کردوە دەتوانین چەند کاتیگۆریەك جیابکەینەوە، ولاَتانی عەرەبی و بەرژەوەندی سیاسیان لە مانەوەی ڕژێمی بەعس و بەرگری لێکردنی لەپای یەکێتی عەرەبی و پارێزگاری لە دەرگای ڕۆژهەلاَتی دونیای عەرەبدا، لەبەرانبەر هێرشی دەوڵەتی ئێران و ئیسلام گەرای شیعیدا، ئەمە لە قۆناغی یەکەمدا بۆ هەندێك لە ولاَتانی ڕۆژئاواو ئەمریکاشدا ڕاست دەردەچێت ئەوان لەقۆناغی یەکەمدا هەتا لە بەرانبەر ڕاستیەکانی بەکار هێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراقدا لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا چاووگوێچکەیان داخستووە، یۆست هلتەرمانی هۆڵەندی ئەمریاکاناس و لە ئەمریکاژیاو لە کتێبە لەناوبانگەکەیدابەناوی(کارێکی ژەهراوی، هەڵەبجەو کیمیاباران) ئەم دۆزە هەتا ژێری گۆمەکە سەیردەکات و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لەپای کام بەرژەوەندیدایە کە لەسەرەتای کیمیابارانی هەڵەبجەدا ئەمریکایەکان ودەزگای هەواڵگری سیناریۆی ئەوە بەڕێوەدەبەن کە گوایە هەڵەبجە لەلایەن ئێرانەوە کیمیابارانکراوە؟!.

ئەوڕاپۆرتانـەی کـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـەکاتی سـەردانە جیاجیاکانیانـادا لـە پرۆسەی چەکداماڵینی عێراقدائامادەکراون و هەروەها ئەو لیستانەش کە عێراق داویێتی بـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان لەگـەڵ نامـەو دۆکومێنتـەکانی گـومرگی وڵاتـانی ئـەوروپی و بەشـێکیش لـەو زانیارایانـەی کـە کۆمپانایا ئەوروپیـەکان داویـانن بـە وەزارەتـی نـاوخۆو پیـشەسازی وێنەیـەکی ناتـەواو بـەڵام کـەمێك ڕوون دەدات بەدەسـتەوە لەسـەر ئـەو کۆمپانیایانە و ئەو مادانـەی کەداویانـە، دۆزی تاوانبـارای هۆڵەنـدی فرانس ڤان ئانـارات ئەم وێنەیەی کەمێك زیاتر ڕوونکـردەوە، وەزارەتـی داد زیـاد لەدووسـاڵ و نیـو لەسـەر ئـەم دۆزەو ئـەم کۆمپانایایانـە و کەسایەتیەکان لێکۆڵینـەوەیان کـردووە مـن کەشانسـی ئـەوەم هـەبوو لەکۆمیتـەی بەدادگاگەیانـدی فرانـسدا کاربکـەم لـە زۆربـەی دانیـشتنەگرنگەکاندا بەشداربم و ماف ئەوەشم هەبوو کەهەندێك لەدۆزەکان سەیربکەم و بخوێنمەوە، وگـوێم لـە زۆربەی شایەدو لێکۆڵەرەوەکانی وەك واڵتەر بێك و سـەفیری ئـەوکاتی هۆڵەنـداو کەسـانی تـر گرتـوو زۆربـەی ئەوانەشـم لای خـۆم یاداشـت کـرد، هـەموو ئەوانـەو لەگـەڵ ئەوانەشـدا کتێب و لێکۆڵینەوەکەی ئارنۆڵد کراسکێنس بەناوی (هیچ پەشیمان نیم)، کە یـەکێك لـە باشترین لێکۆڵینەوەکانـە لەسـەر ڤان ئانرات و کۆمپانیاکـان ئـەو وێنەیـەیی کەباسـم کـرد زیـاتر ڕوون کـردەوە، بـەڵام هێـشتاش زۆر بەشـی وونـەو هـەر بـە وێنەیـەکی ناتـەواو دەمێنێتەوە، من لەسەر هەموو ئەو ڕاپۆرت و داتایانـە ئـەتوانم زانیـاری و خشتەیەکی بـەم جۆرە ببخەمەڕوو.

**<u>وڵاتـی میـسر</u>:** سـەرجەم ئـەم کەرەسـانەی کـە لەمیـسرەوە چـوون بـەناوی(ئـەبوزابل) کەرەنگە کۆمپانیایەکی سەربەدەوڵەت بێت تۆمارکراوون.

| جۆری مادە و کەرەسە | بڕ بە تەن/ مەتری | کام گازی لێدروست دەکریت |
|---|---|---|
| PCL3 | 500 | mustardgas and Sarin |
| TMP | 700 | Sarin |
| HF | 225 | Sarin |
| NaCn | 200 | Tabun |
| IP | 300 | Sarin |
| KHF2 | 200 | Sarin |
| KF | 275 | - |

**ولاَتی هند:** سەرجەم ئەم کەرەسانەی کە لەهندەوە چوون بەناوی(ئێکسۆمێت پلاستك) کەڕەنگە کۆمپانیابێت تۆمارکراوون.

| جۆری مادەو کەرەسە | بڕ بە تەن/ مەتری | کام گازی لیّ دروست دەکریت |
|---|---|---|
| PCL3 | 300 | mustardgas and sarin |
| POCL3 | 250 | Tabun |
| NaCn | 50 | Tabun |
| Chloro | 192 | VX |
| ethanol | 250 | VX |
| P2S5 | 1000 | mustardgas and sarin |
| SOCL2 | 1 | Sarin |
| Cyclo-hexanol | 300 | Tabun |
| DMA-HCL | | |

**دوبەی/ سنگاپور:** ئەمە کۆمپانیایەکە کە لەودوولاَتە کاری کردووە بە ناوی(کیم الخليج) و ئەم مادانەی داوە بە عێراق:

| جۆری مادەو کەرەسە | بڕ بە تەن/ مەتری | کام گازی لیّ دروست دەکریت |
|---|---|---|
| Di-isopropylamine | 200 | VX |
| SOCL2 | 950 | mustardgas and Sarin |
| PCL3 | 3300 | mustardgas and Sarin |
| HF | 1,5 | Sarin |
| Morpholine | 15 | VX or Sarin |
| Triethylamin | 48 | VX or Sarin |

**ولاَتانی ئەوروپی:**

| | | ئەڵمانیا |
|---|---|---|
| precursor Tabun | 30 | POCL3 |
| precursor Tabun | 10 | POCL3 |

| | | |
|---|---|---|
| precursor CS | 10 | O-Chlorobenzaldehyde |
| precursor Mustard | 25 | TDG |
| precursor Mustard | 50 | TDG |
| precursor CS | 50 | O-Chlorobenzaldehyde |
| precursor VX | 39 | EtO |
| precursor VX | 50 | i-isopropylamine |
| precursor Mustard and Sarin | 5,12 | PCL3 |
| precursor Sarin | 15 | TMP |
| precursor Sarin | 15 | TMP |
| precursor Sarin | 15 | TMP |
| precursor Tabun | 10,26 | . POCL3 |
| precursor Tabun | 13,68 | POCL3 |
| precursor Tabun | 3,04 | POCL3 |
| precursor Tabun | 20 | NaCN |
| precursor Tabun | 16 | NaCN |
| precursor Sarin | 20 | KHF2 |
| chemical precursor | 20 | NaF |
| chemical precursor | 22,5 | NaF |
| chemical precursor | 20 | NaF |
| chemical precursor | 2 | NaF |
| chemical precursor | 17,6 | NaF |
| precursor Sarin | 50 | Cyclohexanol |
| precursor Sarin | 100 | Cyclohexanol |
| precursor mustardgas and Sarin | 32 | PCL3 |
| chemical precursor | 52,8 | NaF |
| chemical precursor | 54 | NaF |
| precursor Sarin | 38 | KHF2 |
| precursor Tabun | 60 | DMA-HCL |
| | | **وڵاتی لوکسمبۆرگ** |
| =Frans van Anraat | | Oriac Int. |
| precursor mustardgas, bought from Alcolac, see USA | 650 | TDG |
| | | **وڵاتی هۆڵەندا** |
| precursor mustardgas | 50 | TDG |

| | | |
|---|---|---|
| precursor mustardgas | 250 | TDG |
| precursor mustardgas | 100 | TDG |
| precursor mustardgas | 500 | TDG |
| precursor mustardgas (suspected) | 500 | TDG |
| precursor mustardgas and Sarin | 50 | SOCL2 |
| precursor mustardgas and Sarin | 100 | SOCL2 |
| precursor mustardgas and Sarin | 250 | SOCL2 |
| precursor Sarin | 20 | TMP |
| precursor Sarin (suspected) | 500 | TMP |
| precursor Tabun | 100 | DMA-HCL |
| precursor Tabun | 100 | DMA-HCL |
| precursor Tabun (suspected) | 10 | DMA-HCL |
| precursor Tabun (suspected) | 100 | DMA-HCL |
| precursor Tabun | 100 | NaCn |
| precursor Tabun | 500 | NaCn |
| precursor Sarin | 100 | IP |
| precursor Sarin | 150 | IP |
| precursor Sarin | 100 | KHF2 |
| precursor CS (suspected) | 7 | O-Chlorobenzaldehyde |
| precursor CS | 14,4 | Malononitril |
| precursor mustardgas | 500 | TDG |
| precursor mustardgas and Sarin | 100 | SOCL2 |
| precursor mustardgas and Sarin | 750 | SOCL2 |
| precursor mustardgas and Sarin | 1000 | SOCL2 |
| precursor mustardgas and Sarin | - | SOCL2 |
| precursor Sarin | 5 | HF |
| precursor Sarin | 150 | IP |
| precursor Sarin | 100 | KHF2 |
| precursor Sarin | 20 | KHF2 |
| precursor CS (suspected) | - | O-Chlorobenzaldehyde |
| | 600 | KI+CH2CL2+Chloramin T |
| | 600 | CH2CL2 |
| | | **ولاَتی ئیسپانیا** |
| *production equipment* | | *I.T.E.* |

| |
|---|
| *out of business/location unconfirmed* |
| **وڵاتی سویسرا** |
| precursor mustardgas (suspected) - TDG |
| 0,6 3-hydroxy methyl |
| **ئـەو مادانـەی کـە فـرانس ڤـان ئـانرات کڕیـونی لەڕێگـەو بـە هـۆی کۆمپانیـا سویسریەکانەوە** |
| precursor mustardgas and Sarin 50 PCL3 |
| precursor Sarin 100 TMP |
| precursor Sarin 56 TMP |
| precursor Tabun 130 POCL3 |
| precursor Tabun 250 POCL3 |
| precursor Tabun 250 POCL3 |
| precursor Sarin 200 HF |
| precursor Tabun 5 Dimethylamin |
| precursor mustardgas 400 TDG |
| precursor mustardgas 350 TDG |
| precursor Sarin 5 DMMP |
| *production equipment Georg Fischer*<br>*production equipment Sulzer*<br>*production equipment Frans van Anraat* |
| **وڵاتی بەریتانیا** |
| out of business/location unconfirmed Sigma |
| - - Lab. Chemicals |
| BDH<br>lab equipment |
| **وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا** |
| Alcolac |
| by Frans van Anraat TDG |
| Al Haddad |
| precursor Sarin (suspected) DMMP |
| - unknown chemical |
| unconfirmed. lab equipment Lummus |

ئەم زانیاریانەی سەرەوە لەتی شکاوی ئەو ئاوێنانەن، کەپڕن لە زانیاری وورد و تۆڕێکی نەهێنی و شەیتانی بەیەکەوەیان ئەبەستێت، ئەو تۆڕە تێکەڵ بە دەزولە خوێنەکانی قوربانیەکان دەبێت، پتر لە ١٨٠,٠٠٠ قوربانی، ئەم چەکە کوشندەیە هەرئەوەنەبوو خەڵك لەناوبەرێت، وەك هڵتەرمان لەکتێبەکەیدا باسی کردووە تۆقاندن و شکاندنی عەزمی خەڵك و خۆبەدەستەوەدانیان بووە بە سەربازو جاشەکان و ئەوانیش لەبیابانە دوورەدەستەکاندا گووم ناوو سەرنەگونیان کردوون، سەرجەمی ژینگەی ولاّتێك پیس بووە ئاوی ژێرزەویەکەشی پاك نیە، کانیاوەکانی وێرانەو هەزاران برینداروو نەخۆش بەدەست برینەکانیانەوە دەناڵێنن، مندالأنی ئەم ناوچانە ناساغ و نەخۆشن، ژنان سەرەتانیان زیاترە لەناوچەکانی تر، باری دەرونی ئەوانەی کا تێدانەچوون دەتوانرێت حسابی قوربانیان بۆ بکرێت، پرۆفیسۆر ئا.ئەندریکس، کە یەکێکە لەوانەی یەکەم کەسە کەچۆتە هەڵەبجە دوای کیمیابارانی و خاك و خۆڵی هەڵەبجەو قژی مندالأنی تێداچوو و پارچە قومبەلە لە تاقیگەیماڵەکەیدان و خۆی زۆریك لەوقوربانیانەی دواتر لەشاری خێنتی بەلجیکا تیمارکردووە، کە ساڵێك لەمەوبەر سەردانم کردوو نزیکەی ٤ کاتژمێر گفتوگۆمان کرد ئاوا باسی ئایندەی قوربانی و بیمارەکانی بۆ کردم، ئەوانەی ڕاستەوخۆو هەمان چرکە دەمرن بەختەوەرترن لەوانەی بەم نەخۆشیە بێ دەرمانەوە بە زەلیلی ژیان دەبەنەسەر!

کەسانێك کە ڕنگەسەریان لەهیچ لەو زانیاریانە دەرنەچووبێت وەنەیان توانیبێت سەر لە ئەلف و بێی کیمیاو تەکنیك دەربکەن و خۆیان وەك پێغەمبەرێکی بە دەسەلأت لەکوێرە دێیە دورەدەستەکانی کوردستان، و لەپاڵ شاخ و بن درەخت و پەنا قایمەکاندا کە لە فڕۆکە و تۆپباران و چەکە تەقلیدیەکان ڕاهاتبوون و پێیان وانەبوو بایەك بێت و هەموو ببنە قوربانی بۆگەنی سیرو سێوەکانی ولأتی ڤانکۆخ، تەکنۆلۆجیای ڕۆژئاواو قازانج پەرستی بازرگان و خاوەن سەرمایەکان، لەبەرانبەر ئەم تاوانەدا چ ماف و قەرەبوو کردنەوەیەکی مادی و مەعنەوی دەیانگرێتەوە، هڵتەرمان لە گفتوگۆیەکدا لەگۆڤاری میکیاڤیلیستەکاندا دەڵێت ولأتەنی ڕۆژئاوا هاوتاوانن یان دەستیان هەیە لە جینۆسایدی خەڵکی کوردستاندا، هەربۆیەش ئەرکی ئەخلاقی و ئینسانیان هەیە لەبەرانبەر قوربانیەکان وخەڵکی کوردستاندا، من تەنها زیادەیەك لەسەر بنەمای ئەومشتە زانیاریە دەخەمە سەر خەرمانی زانیاریەکانی تر، بەعس و دەوڵەتی عێراق دەمێك بوو پلانی

لەناوبردنی خەڵكی كوردستانیان هەبوو و لەهیچ شەڕو ناڕەزایەتیەكدا دژ بەم ڕژێمانە، هیچ كات جیاوازی نێوان كەسی مەدەنی و هێزی چەكداریان نەكردووە.

نەك هەرئەوە ژینگەو سەروەت و ئاژەڵی كوردستانیش لەم ژیان كوژیە بێبەش نەبوون.لەكاتی كیمیابارانادا شایەدەكان باسدەكەن كۆتر و چۆلەكەكان پێش مرۆڤەكان لەفرین دەكەوتن و گیانیان لەدەست دەدا، كۆمەڵكوژی و جینۆسایدی خەڵك و خاك و ژیان لە كوردستاندا هەرگیز بە بێ هاوكاری كۆمپانیاو بازرگانەكان و تەكنۆلۆژیای وڵاتانی ڕۆژئاوا ئیمكانی نەبوو و خەسارەتی گیانی وماڵیش قەت بە پشت بەستن بەچەكە تەقلیدیەكان نەدەگەیشتە ١٪ ئەم زیانانە.

*سەعدوڵا فەتحی: .یەكێك لە بەرپرسانی دەزگای بەرهەم هێنانەكەنی چەكە بەكۆمەڵ كوژەكانی عێراق بووە.

** سیۆرغی: شەریكەیەكی ڕوكەش بووە كە بۆ شاردنەوەی ناوی كۆمپانیای بەرهەم هێنانی پیشەسازی و پیشەسازی جەنگی بووە.

### سەرچاوەكان:


١- ساڵنامەی ئەنفالستان.

٢- ساڵنامەی هەشتاوهەشت ژمارەكانی(٤و٥، ٦و٧)

٣- جینۆسایدی گەلی كورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتیدا–د.مارف عومەر گوڵ.

٤- وەرگێڕدراوی دەقی بڕیارەكانی دادگای لاهای لەدۆزی تاوانبار فرانس ڤان ئانارتدا

http://www.nawandihalabja.com/ku/index.php?option=com_content&task=category&sectionid=5&id=14&Itemid=26-Nederland en de Chemische wapens van Irak—Campagine tegen wapenhandel
http://www.stopwapenhandel.org/publicaties/boekenbrochures/Irakrapport.pdf

5- -Geen cent spijt –Arnold Karskens٦-Revu-Nr.51

6- -Iraq's en crime of genocide –Human rights watch/middle east

7- - De Telgraaf Donderdag 10-mei-2007 (Van Anraat 17 jaar cel)

8- -Trouw-62ste Jaargang nr.18306

9- -Rechtbank's- Gravenhage Sector srafrecht Prcers-verbaal trechtzitting

10- -Wikipedia --http://nl.wikipedia.org/wiki/Genocide
-Mediacl Experiences of Iraq's Chemical warfare –A.Foroutan™

# ئەنفال وەك جینۆساید
# ئەنفال وەك برینێكی نەتەوەیی

™

مەریوان وریا قانیع™

### سەرەتایەكی گشتی

بەداخەوە تا ئەمڕۆش زۆرجار كە باس لە كارەساتەكانی ئەنفال دەكرێت باس لە گشتێتی ئەو چەوساندنەوە نەتەوەیی و سیاسی و فەرهەنگییە دەكرێت كە میللەتی ئێمە بەدرێژایی ساڵەكانی دەسەڵاتدارێتی بەعس، ئەگەر نەڵێم بەردێژایی ساڵەكانی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی، ڕووبەڕووی بۆتەوە. باس لەمێژووی پەیوەندییە توندتیژییەكانی نێوان بەعس و كورد دەكرێت، باس لەو ناهەمواریيە گشتییە دەكرێت كە بەعس بەسەر كوردستانیدا هێناوە. واتە ئەمڕۆ كە باس لە ئەنفال دەكرێت باس لە گشتێتی مێژوویەكی بریندارو پڕخوێن‌و پڕ فرمێسك دەكرێت، لەكاتێكدا ئەنفال یەكسان نییە بەمێژووی چەوساندنەوەی بەعس بۆ كوردو یەكسان نییە بەمێژووی بەكارهێنانی توندتیژیی بەعس دژ بەكوردو یەكسان نییە بەسەرجەمی ئەو سیاسەتە تایبەتانەی بەعس بەرامبەر بەكورد بەكارهێناوە. تاوانەكانی بەعس بەرامبەر بەكورد زۆرو فرەشێوەن، ئەنفال لەناویاندا تاوانێكی هێجگار تایبەتە. ئەنفال تەعبیر لە ساتەوەختێكی تایبەت و دیاریكراوی هێرشهێنانی بەعس بۆسەر كۆمەڵگای كوردیی دەكات، باس لە شێوازێكی تایبەتی پەلاماردان و شێوازێكی تایبەتی وێرانكاری و شێوازێكی تایبەتی بەكارهێنانی توندتیژی دەكات كە بەسەریەكەوە ئەنفال لە تاوانێكی ئاساییەوە دەكەن بە كارێكی جینۆسیادی. ئەوەی ئەنفال لە تاوانەكانی تری بەعس بەرامبەر بەكۆمەڵگای كوردی جیادەكاتەوە كاراكتەری جینۆسایدییانەی پەلامارەكانی ئەنفالە. گومانی تیانییە بەعس هێزێكی توندوتیژو وێرانكەربووە، هێزێك بووە توندوتیژ بەرامبەر هەریەكێك لەو هێزە سیاسی‌و دینی‌و فەرهەنگییانەی ناكۆك بوون بە خەیاڵی سیاسی ئەو و لەگەڵ دیدو بۆچوون‌و چاوەڕوانییەكانی ئەودا یەكیان نەگرتۆتەوە. بەڵام وێرانكاری و توندوتیژی بەعس بەرامبەر بەوانەی ئەو بەناحەز و نەیار و نادۆستی داناون تەنها لەپەلامارەكانی ئەنفالدا دەگاتە پلەی جینۆساید(1). تێكەڵكردنی كاراكتەری تایبەتی

سیاسەتی بەعس بەرامبەر بەکورد لە ئەنفالدا بەسیاسەتە گشتییەکانی بەعس لەقۆناغەکانی بەر لە ئەنفالدا نەك تەنها هەڵەیەکی فیکرییە، بەڵکو هەڵەیەکی سیاسی و ئینسانیشە. سەرەتا ئەم تێکەڵکردنە هەڵەیەکی فیکرییە چونکە ناتوانێت تایبەتمەندییەکانی ئەنفال بخوێنێتەوە و شێوازی ئەو وێرانکاری و توندوتیژییەی لە ئەنفالدا هەیە لە شێوازەکانی دیکەی وێرانکاری و توندوتیژی بەعس جیابکاتەوە. واتە ناتوانێت تایبەتمەندییەکانی ئەنفال وەك کارێکی جینۆسایدیانە دەستنیشانبکات. ئەم تێکەڵکردنە هەڵەیەکی سیاسیشە چونکە بەکارهێنانی چەمکی ئەنفال بۆ وەسفکردنی سەرجەم ئەخلاقیاتی توندوتیژانەی بەعس بەرامبەر بە کورد سیفەتی جینۆسایدیانەی پەلامارەکانی ئەنفال لاوازدەکات و تایبەتمەندێتییەکانی ئەم پەلامارانە تێکەڵدەکات بەو شێوازە باڵادەستەی چەوساندنەوەی نەتەوەیی کە مەرجنییە هەموو جارێك بگاتە ئاستی جینۆساید. سەندنەوەی کاراکتەری جینۆساید لە ئەنفال وەکچۆن بەعس لە کۆمەڵێك بەرپرسیاریەتی سیاسی ڕزگاردەکات، ئاوا کوردیش لەکۆمەڵێك داواکاری سیاسی بێبەش دەکاتو بڕو ڕادەو قووڵایی ئەو هەڕەشانەی لەسەریبووە لاوازو کەم بایەخ دەکات. هەروەها ئەم تێکەڵکردنە هەڵەیەکی ئینسانیشە چونکە بەجینۆسایدکردنی ئەنفال مانای ئەوەی ئەوانەی لە ئەنفال ڕزگاریانبووە، ئەوانەی ئەنفال ڕاستەوخۆ بەناو ژیانی تاکەکەسیو دەستەجەمعییاندا تێپەڕیوە، پێویستیان بە مامەڵەیەکی تایبەت هەیە، جیاواز لە مامەڵەی ئەوانەی کە شێوازی ناجینۆسایدییانەی توندوتیژیان ئەزموونکردوە. کە دەڵێم پێویستیان بە مامەڵەیەکی جیاواز هەیە مەبەستم ئەوە نییە بڵێم دەبێت بەمان گرنگی زیاتر بدرێت، یان فەزڵیان بدرێت بەسەر ئەوانەدا کە شێوازی تری توندوتیژی بەعسیان ئەزموونکردوە. ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە ڕزگاربووان لەدەستی جینۆساید کێشەی تایبەتی خۆیان هەیە و چارەسەرکردنی ئەو کێشانەش پێویستی بە مامەڵەی تایبەت هەیە. بۆئەوەی جینۆساید یان ئەو توندتیژییانەی کە لە جینۆسایدەوە دێن دووبارەنەبنەوە، کارکردن لەزیاد لە ئاستێکدا پێویستە، ئەم کارکردنەش مەحاڵە بەبێئەوەی لە خاسیەتەکانی جینۆساید و ئەو برینانەی جینۆساید دروستیاندەکات تێنەگەینو تێکەڵیاننەکەین بەشێوازەکانی تری بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە ئینسان[2].

ئەم سەرەتا گشتییە ناچارماندەکات بگەڕێینەوە بۆ دەستنیشانکردنی چییەتی ئەنفال و جیاکردنەوەی لە تاوانەکانی تری بەعس.

ئەنفال چییە؟ ئەنفال بریتییە لەو هەشت پەلامارە سەربازییە پلان بۆڕێژراوەی کە لەنێوان مانگی شوبات و مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨دا کرایە سەر ئەو بەشە تایبەتەی کۆمەڵگای ئێمە کە دەکرێت پێیبلێین کەرتی لادێ یان گوندەکانی کوردستان. واتە پەلامارەکانی ئەنفال ئەو کۆمەڵە پەلامارەن کە لە مێژوویەکی تایبەتدا دەستپێدەکەن و لە مێژوویەکی تایبەتدا کۆتاییانپێدێت و ڕووبەڕووی بەشێکی تایبەتی کۆمەڵگای ئێمە دەکرێتەوە. ئەم دەستنیشاکردنە تایبەتە وادەکات ئەنفال وەك ڕووداوێکی تایبەت تێکەڵنەکرێت بە ڕووداوە خوێناوییەکانی تری مێژووی هاوچەرخی ئێمە و شوناسێکی تایبەتی پێببەخشێت. وەك چۆن لەهەمانکاتدا مانایەکی تایبەت و قورساییەکی تایبەتیشی پێدەبەخشێت، بێگومان پەلاماری وێرانکەرانە بۆسەر کوردستان سیاسەتێکی دێرینی بەعس بووە و بەشێك بووە لەو ڕەوشتە سیاسییە باڵادەستەی ئەم هێزە مامەڵەی کێشەی کوردی لە عێراقدا پێکردوە. بەعس هێزێکبوو مەسەلەی کوردی وەك کێشەیەکی ئەمنی وێناکردوە و وەك کێشەیەکی ئەمنیش مامەڵەی لەگەڵدا کردوە. لای بەعس مەسەلەی کورد مەسەلەی میللەتێك نەبووە خاوەنی کۆمەڵێك ماف و داخوازی سیاسیی و کولتوریی و جوگرافی و ئابوریی نەتەوەیی، بەڵکو مەسەلەیەکی ئەمنی بووە کە بەردەوام مەترسی بۆسەر دەوڵەتی عێراقی و هێزە حوکمڕانەکانی دروستکردوە. دیدی بەعس بۆ مەسەلەی کورد دیدێکی سیاسی نەبووە، بەڵکو دیدێکی ئەمنی بووە. بەم کارەشی بەعس مەسەلەی کوردی لە کایەی سیاسەتەوە گواستواتەوە بۆ کایەی ئاسایش. واتە مەسەلەی کوردی لە مەسەلەیەکی سیاسییەوە گۆڕیوە بۆ مەسەلەیەکی ئەمنی، لە هەڵگری کۆمەڵێك داخوازی سیاسیی و کولتورییەوە کردویەتی بە هەڵگری کۆمەڵێك هەڕەشەی ئەمنی لەسەر دەوڵەتی عێراقی. بۆیە چارەسەری ئەم مەسەلەیەی وەك چارەسەرێکی سیاسی مامەڵەنەکردوە، بەڵکو وەك چارەسەرێکی ئەمنی دیویەتی کە پابەستبووە بە بەکارهێنانێکی بەرفراوان و بەردەوامی توندوتیژی. بێگومان بەعس تاقە هێزێك نەبووە لە عێراقدا کە پەیڕەوی ئەم سیاسەتە تایبەتەی بەرامبەر بە مەسەلەی کورد کردبێت و بەعس داهێنەری ئەم شێوازی مامەڵەیە لەگەڵ مەسەلەی کوردا نەبووە، حکومەتەکانی تری دەوڵەتی عێراقی بەر لە بەعسیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵ مەسەلەی کوردا کردوە. واتە بەعس داهێنەری ئەم کولتورە تایبەتەی بە ئەمنیکردنی مەسەلەی کورد نییە، بەر لە بەعسییش حکومەتە جیاوازەکانی تری عێراق کاراکتەری سیاسیان لە

مەسەلەی کورد سەندۆتەوە، بەڵام هیچ یەکێکیان بەئەندازەی بەعس مەسەلەی کوردیان لەکاراکتەرە سیاسییەکەی دانەبڕیوەو وەك مەسەلەیەکی ئەمنی ڕووت مامەڵەیاننەکردوە. بەعس چارەسەری مەسەلەی کوردیان ڕاستەوخۆ دایە دەست لەشکر و هێزەکانی ئەمن و موخابەرات‌و دەزگا توندوتیژەکانی تری دەوڵەتی عێراقی. یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی ئەنفال بە چڵەپۆپەگەیشتنی ئەم دیدە ئەمنییە بوو بۆ مەسەلەی کورد لەلایەن بەعسەوە. کە دیدی ئەمنی دەبێتە تاقە دیدێك بۆ مامەڵەکردنی کێشەیەکی سیاسی ئەوکات توندوتیژی دەبێتە ئەو ئامرازە سەرەکییەی بۆ مامەڵەکردنی ئەو کێشەیە پەنای بۆدەبرێت. توندوتیژی‌و ترساندن‌و سزادان‌و لەناوبردن دەبنە زمانی قسەکردنی دەوڵەت لەگەڵ ئەو کێشەیەدا. بەڵام ئەم زمانی توندوتیژی و ترساندن و سزادانە مەرجنییە هەمیشەو هەردەم‌و بەشێویەکی حەتمی بگات بەجینۆساید. توندوتیژی دەکرێت تەنها ستراتیژێکبێت بۆ سزادانێکی سنووردار بەمەبەستی بەرهەمهێنانی ترسێکی گەورە کە وابکات ڕێگە لە بەرزکردنەوەی داخوازی سیاسی و ئابوریی و فەرهەنگی بگرێت. بەڵام توندوتیژی کاتێك کاراکتەری جیۆنسایدییانە وەردەگرێت مانای وایە ڕووی لە گروپ یان پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوە بەنیازی لەناوبردنی یەکجاریان نەك بە نیازی سزادان یان ترساندن یان بێدەنگکردنیان. توندوتیژیی جینۆسایدییانە سزادان لە کاری ترسناندن و ماماڵەیەکی توندتیژیی جوزئییەوە دەکاتە سزادانی گروپێك یان هێزێك بەمەبەستی لەناوبردنی سەرتاسەریی ئەو گروپە. ئەوەی توندوتیژی بەعس لە ئەنفالدا لە توندوتیژییەکانی دەرەوەی ئەنفال جیادەکاتەوە ئەم خەسڵەتە جینۆسایدییەیە. لە ڕۆژگاری هاتنە سەر حوکمیانەوە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە مەسەلەی کورد و بەستنەوەی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە بە ئەگەری بەکارهێنانی توندوتیژیی دەوڵەتەوە بەشێکی دانەبڕاوبووە لە شێوازی مامەڵەکردنی بەعس لەگەڵ کوردا، بەڵام لە قۆناغێکدا هێرشە توندوتیژەکانی بەعس بۆسەر کوردستان سیفەتی هێرشی "ئاسایی" لەدەستئەدەن و دەبنە هێرشی ڕاستەوخۆ و بەردەوام بە مەبەستی لەناوبردنی گشتیی و کۆتاییهێنانێکی یەکجارەکی بە مەسەلەی کورد. ئەم شێوازە لە پەلاماری سەربازیی هەمەلایەن و بەردەوامی بەعس بۆسەر کورد لە مانگی سێی ساڵی ١٩٨٧ دەستپێدەکات و تا ساڵی ١٩٨٩ دەخایەنێت. لەم دوو ساڵەدا ڕادەی پەلاماری بەعس بۆسەر کۆمەڵگای کوردی بەشێوەیەکی بەرچاو

بەرزدەبێتەوە و سنووری چالاکی ڕەمزی و ترسان و سزای جوزئی تێدەپەڕێنێت و دەپەڕێتەوە بۆسەرزەمینی وێرانکردنی بەرفراوان و فرەلایەن و سەرتاسەری. لەم دوو ساڵەدا مەسەلەی کورد دەبێتە یەکێك لە مەسەلە ئەمنییە هەرە گرنگەکانی بەعس و هێزە سیاسییەکانی کورد وەك کۆمەڵێك هێزی جەردە و ناپاك و ترسناك مامەڵەدەکرێن. لەناو ئەم نەخشە فراوان و هەمەلایەنەی پەلاماردانی کوردستاندا ئەنفال بریتییە لەو پەلامارانەی کە لە لەنێوان بیست و سێی شوبات و شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨دا ڕوودەدەن. واتە مێژووی دەستپێکردنی پەلامارەکانی ئەنفال بە ئەنفالی یەك دەستپێدەکات لە ڕۆژی بیست و سێی شوباتدا و مێژووی کۆتاییهاتنیشی بە ئەنفالی هەشت کۆتاییدێت ڕۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨دا. هەموو پەلامارەکانی ئەنفال شەش مانگ و یازدە ڕۆژی پێدەچێت. ئەنفال بریتییە لە کۆی ئەو وێرانکاری و کوشتن و لەناوبردنەی بەعس لەماوەی ئەو شەش مانگ و یازدە ڕۆژەدا ئەنجامی ئەدات. پەلامارەکانی بەر لەو مێژووە و پەلامارەکانی دوای ئەو مێژووە بەشێك نین لە پەلامارەکانی ئەنفال. هەریەکێك لەو پەلامارانەش ڕووی لە ناوچەیەکی جوگرافی پێشوەخت دەستنیشانکراو بووە. ئەنفالی یەك ڕووی لەناوچەی سەرگەڵو و بەرگەڵو بوو کە سەرکردایەتی یەکێتی تێدابوو، لەکاتێکدا ئەنفالی هەشت ڕووی لە ناوچەی بادینان بوو کە هەندێك لە هێزەکانی پارتی تێدابووە .حەوت پەلامارەکانی تری ئەنفال بۆسەر ئەو ناوچانە بووە کە کەم تازۆر لەژێر دەسەلاٌتی هێزەکانی یەکێتیدابوون. ئەنفالی یەکەم سێ هەفتەی دەخایەنێت و ئەوانی تریان ماوەکانیان کەمتر بووە. ئەنفالی یەك تا ئەنفالی حەوت لەکاتی جەنگی ئێران و عێراقدا ئەنجامدارون، بەلاٌم ئەنفالی هەشت لە ناوچەی بادیناندا دوای وەستانی جەنگی ئێران و عێراق دەستپێدەکات و سەرجەمی ڕووداوەکانی دەکەوێتە دوای وەستانی ئەو جەنگەوە. ئەمەش نیشانی ئەدات کە پەلامارەکانی ئەنفال بەشێك نەبوون لە جەنگی ئێران و عێراق و ستراتیژە سەربازییەکانیان بەشێك نەبووە لە ستراتیژیەتی جەنگی ئێران و عێراق[4].ئەوەی گرنگە ئاگاداری بین ئەم سنووردارییە زەمەنییە و ئەو شوێنە پێناسکراوانەیە کە پەلامارەکانی ئەنفالیان تیادا پیادەکراوە. ئەمەش مانای تێکەڵنەکردنی زەمان و زەمینی پەلامارەکانی ئەنفالە بەزەمان و زەمینی پەلامار و ناشیرینییەکانی تری بەعس بەرامبەر بە کورد. ئەنفال کۆمەڵێك پەلاماری تایبەتە کە لە مێژوویەکی دیاریکراودا دەست پێدەکات و

ڕووشی لەبەشێکی دیاریکراو و پێشوەخت پێناسکراوی کۆمەڵگای کوردییە. ئامانجێکی پێشوەخت دەستنیشانکراو بەڕێوەیبردوە، کە بریتییە لە وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان و کوشتن و لەناوبردن و ڕاگوێزانی دانیشتوانی ئەو گوندانە. ئەنفال پرۆژەی لەناوبردنی لادێکانی کوردستانە، نەك پرۆژەی لەناوبردنی کورد هەمووی. ئەمەش مانای ئەوەی پەلامارەکانی ئەنفال ڕوویان لە هەموو کۆمەڵگای کوردی نەبووە، ڕووبەڕووی هەموو کوردیش نەکراونەتەوە، بەڵکو ڕوویان تەنها لە گوندەکانی کوردستان بووەو ویستویانە لادێکانی کوردستان و گوندنیشەکانی ئەم کۆمەڵگایە لەناوببەن، ئەگەرچی وێرانکردنی گوندەکان و کوشتن و گرتن و ڕاگواستنی گوندنشینەکان کاریگەریی گەورەو خراپ و هەمەلایەن لەسەر سەرجەمی کۆمەڵگای کوردیی بەجێدەهێڵێت. بەو مانایەی سەرەوە کیمیابارانکردنی شارێکی وەك هەڵەبجەو ڕوخاندنی شارێکی وەك قەڵادزێ بەشێك نین لە پەلامارەکانی ئەنفال. هێرش بۆسەر ئەم دوو شوێنە لەوانەیە لۆژیکی شەڕی ئێران و عێراقی لەپشتەوەبووبێت، یاخود بیرۆکەی تۆڵەکردنەوە یان ڕق یان هەرشتێکی دیکەی لەم بابەتە ئاراستەی کردبێت. هەرچییەك بووبێت لۆژیك و مەبەستی پەلاماردانی ئەو شارانە جیاوازن لە لۆژیکی جینۆسایدییانەی پەلامارەکانی ئەنفال بۆ سەر گوندەکانی و کوردستان. تاوانی ئەنفال پەیوەندی نییە بە توڕەبوونی ئەم یان ئەو سەرکردەی سەربازی، بەملهوڕی و نابەرپرسیارێتی ئەم یان ئەو ئەفسەر و جەنەراڵ و گوردانی سوپاوە، ئەنفال هێرشێکی پلانبۆداڕێژراو و پێشوەخت بیرلێکراوە بوو کە ئامانجی وێرانکردنی هەموو توانایەکی ژیان بوو لەگوندەکانی کوردستانداو ستراتیژیەتی لەناوبردنی گوند و گوندنشینەکانی لەپشتەوەبوو.ئەم جیاکارییەی سەرەوە جیاکارییەکی گرنگە، چونکە تەنها لەڕێگای ئەم جیاکارییەوەیە دەکرێت سیفەت و مانای جینۆسایدیانەی پەلامارەکانی ئەنفال دەربکەوێت.

### تایبەتمەندییەکانی ئەنفال

هەموو جینۆسایدێك حیکایەتی کوشتن و لەناوبردنێکی دەستەجەمعی دەگێڕێتەوە کە تیایدا بە هەزاران هەزار ئینسان لەسەربوون یان نەبوونی سیفەتێکی تایبەت یان لەسەر شێوازێکی تایبەتەی ئینسانبوون دەکوژرێن. بەڵام هەموو جینۆسایدێکیش کۆمەڵێك تابەتمەندی خۆی هەیە، هەلومەرجێکی مێژوویی دیاریکراو و کۆمەڵێك هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوریی تایبەت دەیخولقێنن. بەشێوەیەکی گشتی لەپشتی

جینۆسایدەوە وەك تاوان كۆمەڵێك هۆكار هەیە، بۆ نموونە ئامادەگی دەوڵەتێك كە كێشەی سیاسی و ئەتنی و دینی و كولتوریی هەبێت لەگەڵ بڕێك لە دانیشتوانی ئەو وڵاتەدا. دەوڵەتێك گەر دەوڵەتێكی تۆتالیتاریش نەبێت، ئەوا زۆر ڕەگەز و كاراكتەر و مەیلی تۆتالیتارییانەی بەهێزی تێدابێت. ئەم دەوڵەتە دەبێت كاراكتەرێكی مۆدێرنیشی هەبێت، واتە لەشكری مۆدێرن، دەزگای بیرۆكراتی مۆدێرن، تەكنۆلۆژیای پەیوەندی مۆدێرن، شتی دیكەی لەم بابەتەی هەبێت كە بەهۆیانەوە بتوانێت هەم جینۆساید ڕێكبخات و هێزی بۆكۆبكاتەوە هەم بشتوانێت ئەنجامیبدات. زۆربەی جینۆسایدەكان لە ئامادەگی حیزبێكی سیاسیدا ئەنجامدارون، حیزبێك كە خەڵك ڕێكبخات و هانیانبدات و هاریكاریانبكات بۆ پیادەكردنی جینۆساید. بوونی ئایدیۆلۆژیایەكی سیاسیش بۆ ئەنجامدانی جینۆساید یەكێكە پێداویستییە گرنگەكان، ئایدیۆلۆژیایەك ئەوانەی جینۆسایدیان بەرامبەر دەكرێت وەك كەسانی ناپاك و تاوانبار و تەنانەت نائینسان وێنا بكاتو بناسێنێت. بوونی دەزگای بیرۆكراتی تایبەتو تەرجەمەكردنی بڕیاری جینۆساید بە دەیانو سەدان و هەزاران بڕیاری بیرۆكراتی بچووك كە هەر یەكێكیان كەسێكو لایەنێكو دەزگایەكی تایبەتی پێیهەڵبستێت، بەجۆرێك گەر بمانەوێت وێنەیەكی گشتی كارە جینۆسایدیەكەمان دەستبكەوێت ناچارین ئەو هەموو بڕیار و دەزگا و لایەنە بچووك و لۆكاڵیانە پێكەوە لەناو وێنەیەكی گەورەدا كۆبكەینەوە. واتە جینۆساید كارێكە بەتەنها بەم یان بەو كەس یان بەم یان ئەو دەزگا ئەنجامنادرێت، بەڵكو تاوانێكە دابەشدەكرێت بەسەر چەندان دەزگاو لایەنو بڕیاری بچووكو لۆكاڵیدا[5].

سەرەڕای ئەم خاڵە گشتییانە ئەنفال لە عێراقدا هەڵگریی كۆمەڵێك تایبەتمەندییە كە من هەوڵئەدەم لێرەدا لەسەر چوار گرنگترین تایبەتمەندیان ڕابوەستم.

**یەكەم: بەشداربوونی دەوڵەت وەك گشتێك لە تاوانەكانی ئەنفالدا.**

خاڵێكی گرنگ كە ئەنفال لە تاوانەكانی دیكەی بەر لە ئەنفال و دوای ئەنفال جیادەكاتەوە و لەهەمانكاتیشدا تایبەتمەندییەكی تایبەتی پێدەبەخشێت ئەوەیە ئەوەی كە ئەنفال ئەنجامئەدات خودی دەوڵەتی عێراقییە وەك دەوڵەت. ئەنفال بەتەنها دەزگاكانی حیزبی بەعس، یان دەزگا نیمچە میلیتارییەكان یان ئەم یان ئەو هێز و ئەم سەركردەو ئەو گوردانی سەربازی لێیبەرپرسیار نییە، بەڵكو دەوڵەتی عێراقی وەك دەوڵەت، وەك گشتێكی ئۆرگانی، لە سەرەتای ئەنفالەوە تا كۆتایی ئەنفال بەشدارە لە

پلان بۆدانان و ڕێکخستنی تاوانی ئەنفال‌و کۆکردنەوەو دابینکردنی ئامرازو پێداویستییە تایبەتییەکانی ئەنجامدانی ئەم تاوانە. ئەم بەشدارییە چالاك و هەمەلایەنەی دەوڵەتە سیفەتی سەرەکی تاوانەکانی ئەنفال دەستنیاندەکات. هەر ئەم بەشدارییە ئۆرگانییەی دەوڵەتە ، بۆ نموونە، تاوانەکانی ئەنفال لە تاوانی جینۆسایدێکی گەورەی وەك ئەوەی ڕواندا جیادەکاتەوە. بەشداری سەرتاسەری دەوڵەتی عێراقی وەك دەوڵەت لە ئەنفالدا بەڕادەیەك گشتگیرە زەحمەتە بتوانین لەدەرەوەی دەوڵەتدا تاوانباری دیکە بۆ ئەنفال لەناو عێراقدا بدۆزینەوە، لەکاتێکدا لە ڕواندادا خەڵکی سادە و ساکاری دەرەوەی دەزگاکانی دەوڵەت بەشداریان لە کوشتنی قوربانییەکاندا کردوە، لە رواندا دراوسێ دراوسێ و ناسراو ناسراو هەندێکجار هاوڕێ هاوڕێی بە چەقۆ قەمە و تەور و داس کوشتوە. ئەو دەزگایانەی حکومەتی عێراقیش کە لە تاوانی ئەنفالدا بەشدارن ئەو دەزگایانەن کە پێکهاتەی سەرەکی ئەم دەوڵەتە پێکدەهێنن و شوناسی دەوڵەتی عێراقی وەك دەوڵەت دەستنیشاندەکەن. ئەو دەزگایانەش هەندێکیان سەربازین، هەندێکیان حیزبی و مەدەنین، هەندێکیان بەرپرسی کاروباری ئەمنین، هەندێکیان دەزگای نیمچە سەربازین .گرنگترینی ئەو دەزگایەنەی لە پەلامارەکانی ئەنفالدا بەشداربوون بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- لەشکری عێراق: فەیلەقی یەك و فەیلەقی پێنج.

٢- دەزگای ئەمنی: مدیریەتی ئەمنی عامە.

٣- حیزبی بەعس. بڕێکی زۆر لە دەزگاکانی حیزبی بەعس.

٤- هێزە ڕەسمییە کورییەکان. فەوجەکانی خەفیفە. هەریەکێکیش لەم دەزگایانە لە چەندان دەزگای بچووك و گەورە پێکهاتوە کە ئەرك و کاری جیاواز ڕادەپەڕێنن. ئەمانە هەندێکیان چەك بەدەستن، هەندێکیان دەزگای هەواڵگر و کۆکەرەوەی زانیارین، هەندێکیان شۆفڵ و بلدۆزەر و ئامێرەکانی تری ڕوخاندن ئامادەدەکەن، هەندێکیان ئەرکیان تەنها گواستنەوەیە هتد...

**دووهەم: کوشتنی بەکۆمەڵ بەڵام تایبەت.**

شێوازی کوشتن لە تاوانەکانی ئەنفالدا شێوازێکی زۆر تایبەتە و جیاوازە لەو شێوازانەی تری کوشتن کە بەعس لە عێراقدا پیادەیدەکرد. کە ئەمە دەڵێم دەزانم ڕەنگە کەسانێك هەبن بڵێن مردن هەر مردنە، گرنگ نییە ئینسانەکان بە چ شێوازێك دەکوژرێن،

گرنگ ئەوەیە ئینسانەکان دەکوژرێن. هەندێك لەم ڕووەوە زیاتر پێدادەگرن و باس لەوە دەکەن کە نابێت ئازارەکانی ئەنفال نمایشبکرێن، ناڕاستە کەسێك کە خۆی ئازارەکانی ئەنفالی نەدیبێت لەدەرەوەڕا باس لەو ئازارانەبکات، ئەوەی تەنها مافی قسەکردن و گێڕانەوەی ئازارەکانی هەیە قوربانییەکان خۆیانن. لەم دیدەدا باسکردنی ئەنفال و هەوڵدان بۆکردنی بە بابەتی تێڕامان و خوێندنەوە، ناهەقیکردنە بەرامبەر بەوانەی کە ئەنفالیان بەرامبەر کراوە و ئەنفالیان بەشێوەیەکی شەخسی ئەزموونکردوە. لەم دیدەدا ئەنفال یان جینۆساید شتێك نییە نمایشبکرێت و تاقە لایەنێك کە بۆی هەیە باس لە ئەنفال بکات ئەوانەن کە وەك قوربانی بەناو جەهەنەمی ڕووداوەکانیدا تێپەڕیون. بۆیە، لەم دیدەدا، ئینسان هەر لە ئەساسەوە بۆینییە باس لە ئەنفال بکات و نابێت بیکاتە بابەتی تێڕامان و خوێندنەوەی فیکری، چ جای ئەوەی هەوڵبدەی شێوازەکانی کوشتن لە ئەنفالدا پۆلینبکەیت و لە شێوازە "ئاساییەکانی" کوشتن جیایانبکەیتەوە. بەبۆچوونی من ئەم دیدە لە زیاد لەڕوویەکەوە نووقسان و هەڵەیە.

**یەکەم:** بۆ ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی تاوانە ترسناکەکان لە مێژووی مرۆڤدا پێویستە هەموو هەوڵێك بدرێت بۆ تێگەیشتن لەو تاوانانە و مۆتیڤەکانی ئەنجامدانیان، لۆژیکە ناوەکییەکەیان دەستنیشان و ئاشکرابکرێت، لەسەر ئەو بنەمایانەش هەوڵبدرێت دونیا و پەیوەندییەکان و مەبەستەکان وا ڕێکبخرێنەوە هیچ مەودایەك بۆ سەرلەنوێ ئەنجامدانەوەی تاوانی لەو بابەتە نەمێنێتەوە.

**دووهەم:** بۆئەوەی قووڵی تاوانەکان تێبگەین و پاڵنەرەکانی ئەنجامدانیان بناسین ناچارین دەست بۆهەموو ئەو ئامرازانە ببەین کە زانستە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان دەیانخەنە بەردەستمان. ئەمەش نەك وەك حەز یان تەحەدایەکی ئەکادیمی، بەڵکو وەك کارێکی ئەخلاقی کە بکرێت لەڕێگایەوە قووڵی برینە تاکەکەسییەکان و قووڵی برینە مێژووییە دەستەجەمعییەکان بخوێنینەوە. لەم دیدەوە قسەکردن لەسەر شێوازی کوشتن لە ئەنفالدا دەبێتە یەکێك لە ڕەهەندە گرنگەکانی قسەکردن لەسەر ئەم باباتە.بەعس لە ئەنفالدا بەشێوەیەکی تایبەت ئینسانەکان دەکوژێت تەواو جیاوازە لەو شێوازی کوشتنە باڵادەستەی بەعس ڕۆژانە بەکاریدەهێنا بۆ لەناوبردنی ئەوانەی بە ناحەز و نەیار و نادۆستی دادەنان. سەرەتا کوشتن لە ئەنفالدا کوشتنێکی پێشتر پلان بۆ دانراوە، وابەستەی تووڕەبوونی ئەم یان ئەو سەرکردە، دڵڕەقی ئەم گوردان یان ئەو گوردانی

لەشکری عێراقی نییە. کوشتنێك نییە خۆبەخۆ و لەپڕ ڕوویدابێت، بەڵکو کوشتنێکی بەبەرنامەیە و بەسەر چەندان هێز و قۆناغ و شوێنی جیاوازدا دابەشکراوە. بەر لە هەموو شتێك ئەوانەی پەلاماری گوندەکانیان داوە و ماڵ و قوتابخانە و مزگەوتەکانیان ڕوخاندوە، کانی و کارێزەکانیان دەمرێژ و تەقاندۆتەوە، خەڵکەکانیان کۆکردۆتەوە و گرتوە و گواستۆتەوە ئەوانە نەبوون کە خەڵکەکانیان کوشتووە. هەریەکێك لەم کارانە هێز و لایەن و گروپی تایبەت پێیهەڵساون. ئەگەرچی لەکاتی ئیشکردنی هەریەکێك لەم گروپانەدا هەر قوربانییەك بەو شێوەیە نەجوڵابێتەوە کە ئەمری پێکراوە، یان هەرکەسێك هەوڵی دەربازبوون یان بەگرییکردنی دابێت، کوژراوە. بەڵام سەرەڕای ئەم ڕاستییە شێوازی سەرەکی کوشتن لە ئەنفالدا کوشتنی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێ نەبووە. دەوڵەت یەکەمجار خەڵکەکانی گرتوە، دواتر بۆ ناو جەمەلۆن‌و ئۆردوگای تایبەت گواستونیەتەوە، نێری لە مێ جیاکردۆتەوە، دواتر لەوێوە دەستە بەدەستە بۆ شوێنی کوشتن گواستراونەتەوە و تیمی تایبەتی کوشتن تەقەی لێیانکردوە و کوشتونی. کوشتن لە ئەنفالدا کوشتنێکی درێژخایەن بووە و دەستبەجێ و خۆبەخۆ ئەنجامنەدراوە. هەموو ئەوانەشی لە ئەنفالدا بەشداربوون کاری کوشتنیان ئەنجامنەداوە، بەڵکو هەر یەکەیەك و وەزیفەیەکی تایبەتی هەبووە، دەوڵەت تیمی تایبەت و شوێنی تایبەتی بۆ کوشتن و لەناوبردن دروستکردوە. واتە دەوڵەت خەڵکانێکی دروستکردوە کە کاری ئەوان تەنها کوشتنی ئەنفالکراوەکان بووە دوای گرتن و ڕاگواستن و کۆکردنەوەیان لەلایەن هێز و تاقم‌و لایەنی جیاوازەوە.دووهەم کاراکتەری ئەم کوشتنە لەوەدایە کە کوشتنێکی دەستەجەمعییە و قوربانییەکان خراونەتە گۆڕی بە کۆمەڵەوە .بەمەش ئەم شێوازی کوشتنە هەموو سیفەتێکی کوشتنی تاکەکەسی و تایبەتی لەدەستداوە

ئەم کوشتەنە دەستەجەمعییە کوشتنێکە پەیوەندی نییە بەوەوە داخۆ ئەوانەی دەکوژرێن ئەم یان ئەو تاوانی شەخسیان ئەنجامداوە یان نا، ئەم کوشتنە کوشتنێکە ڕووی لە قوربانییەکانە وەك گروهێکی پێشوەخت پێناس‌و دەستنیشانکراو، وەك جۆرێکی تایبەت لەئینسان، وەك ناونیشانێکی گشتی. ئەم شێوازە لە کوشتن کوشتنێکی کاتاگۆریانەیە، نەك کوشتنێکی تایبەت‌و تاکەکەسیی. هەر ئەمە شێوازی کوشتنەشە تاوانەکانی ئەنفال دەکاتە تاوانێکی جینۆسایدییانە. باسنەکردنی ئەم تایبەتمەندیانە و تێکەڵکردنی ئەنفال بەتاوانەکانی دیکەی بەعس بەرامبەر بە کورد وادەکات ئەوەی ئەنفال دەکاتە جینۆساید، بزربێت.

**سێهەم: ئامارکاریی و بە هۆمۆساکەرکردنی قوربانییەکان.**

بەعس لەمانگی دەی ساڵی ١٩٨٧دا، واتە لە گەرمەی شەڕی ئێران و عێراقدا ئامارێکی گەورەی دانیشتوان ئەنجامئەدات. ئەم ئامارە هەر مەبەستێکی سیاسی یان مەدەنی یان ئابوریی لەپشتەوەبوبێت، لەوە کەمناکاتەوە کە ڕۆڵێکی هێجگار گرنگ دەبینێت لە پرۆسەی ئەنجامدانی جینۆسایدی ئەنفالدا. ئەم ئامارە هێڵێکی ڕاستەوخۆ دەکێشێت لەنێوان ئەوانەی بەعس بە هاولاتیان دادەنێت لەبەرامبەر ئەوانەدا کە بەعس نەك تەنها هەموو مافێکی هاولاتیبوونیان لێدەسێنێتەوە، بەڵکو وەك ناپاك و نادۆست و دوژمنیش پێناسیاندەکات. ئەوانەی لەم ئامارەدا بەشدارنابن نەك دەکرێنە کەسانی بێماف، بەڵکو مامەڵەی خائینیان لەگەڵدا دەکریٚ و سزای مردنیان بۆدهردەکرێت. بەپێی بڕیارێکی مەجلیسی قیادەی سەورە کە لە مانگی ئابی هەمانساڵدا دەرچوو بوو. ئەو ناوچانەی کە لەژێردەسەلاتی حکومەتدا نەبوون، واتە ئەوانەی کە سەرژمێریی دانیشتوان نەیدەگرتنەوە، داوایانلێکرابوو بگەڕێنەوە ڕیزی نیشتیمانی و ژێر دەسەلاتی بەعس. بەعس تەنها ئەوانەی بە هاولاتی دەزانی کە دەیتوانی کۆنترۆڵ و چاودێری و دیسپلینیان بکات. لەنێوان ئەو بڕیارە لە مانگی ئابدا و لەنێوان ئامارەکەدا دوو مانگ هەیە، بەعس ماوەی ئەو دوو مانگەی دانابوو بۆئەوەی هەموو ئەوانەی ناکەونە ژێر دەسەلاتی بەعسەوە بە ناعێراقی و ناهاولاتی و تەنانەت نائینسان ناوبنێت و ماف بەخۆیبدات بەناوی سەروەری نەتەوەیی و پاراستنی ئاسایشی عێراق و پاراستنی وتەوە بیانکوژێت.ئەو ناوچانەی کە حکومەت نەیتوانی بیانخاتە ژێردەسەلاتی خۆیەوە بە "ناوچە قەدەغەکراوەکان" ناونران و ئەوانەشی لەوێدا دەژیان لە دیدی بەعسدا هیچ پەیوەندییەکیان بەعێراقەوە نەمابوو و هەموو مافێکی ئینسانبوونیان لەدەستدابوو. واتە ئەوانە بووبوونە کەسانێك دەوڵەت کەی بیویستایەو چۆن بیویستایە دەیتوانێت بیانکوژێت. ئەگەر بکرێت چەمکێك لە فەیلەسوفی ئیتالی ئاگامبنەوە بخوازین دەکرێت بڵێین بەعس هەموو ئەوانەی کە دەکەوتنە ناو ناوچە قەدەغەکراوەکانەوە دەکردە "هۆمۆساکەر". ئاگامبن باس لەوەدەکات کە هۆمۆساکەر بریتیبوون لە کۆمەڵێك کەسی تایبەت کە لە ڕۆمای کۆندا ژیاون بەلام هیچ مافێکیان نەبووە، هەرکەسێك حەزی لێبوایە یان بیویستایە دەیتوانی بیانکوژێت بەبێئەوەی هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدابکرێت. ئەرکی سەرەکی ئەو ئامارەی بەعس لەو ڕۆژگارەدا دروستیکرد بریتی بوو لە

دروستکردنی ئەو ئینسانانەی کە وەك هۆمۆساکەر پرۆژەی کوشتن و لەناوبردنێکی بێلێپرسینەوەبن[6]. ئەو سەرژمێرە "ناوچە قەدەغەکراوەکان"ی نەگرتەوە کە زۆرینەی دێهاتەکانی کوردستانی دەگرتەوە و ئەو دێهاتەنش دواتر بوونە ئەو ناوچانەی بەر پەلامارەکانی ئەنفال کەوتن. لەم پەلامارانەدا هەموو ئەو نێرانەی تەمەنیان لەنێوان ١٥ بۆ ٧٠ساڵدا بوو، بڕیاری لەسێداردەن یان کوشتنیان بۆدەرچو.

پەلامارەکانی ئەنفال چوار مانگ دوای ئەنجامدانی ئەم ئامارە دەستپێکرد، ئەم ئامارە ئەو هێڵەبوو کە بەعس لەنێوان ئەوانەی ماڧ ژیانیان هەیە و ئەوانەی ماڧ ژیانیان نییە، کێشای، لەدوای ئەم ئامارەوە دەوڵەتی عێراقی نەك تەنها ماڧ هاوڵاتیبوونی لە ژمارەیەکی گەورەی خەڵکی کوردستان سەندەوە، بەڵکو ماڧ ئینسانبوونیشی لێسەندنەوە .لە ئەنفالدا گوندنشینە کوردەکان وەك ئەو هۆمۆساکەرانەی ڕۆمای کۆنیان لێهات و هەموو مافێکی ژیانیان لەدەستدا.

**چوارەم: بوونی مۆدێلێکی پێشین بۆ تاوانی جینۆساید لە عێراقدا.**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەنفال لەوەدایە کە لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە بە یەکێك لە تاوانە گەوەکانی بەعسەوە لە سەرەتای ساڵانی هەشتادا، تاوانی کۆکردنەوە و گرتن و کوشتنی بارزانییەکان لە ساڵی ١٩٨٣ دا بەعس نزیکەی ٨٠٠٠ پیاوی بارزانی دەگرێت و دواتر دەیانکوژێت. شێوازی کۆکردنەوە و دابەشکردن و کوشتنی بارزانییەکان ڕێك ئەو شێوازەیە کە دواتر ئەنفالی لەسەر بینا دەکرێت. دەکرێت تاوانی کوشتنی بارزانییەکان وەك پەراوەیەکی پێشین بۆ ئەنفال یان وەك مۆدێلێك بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانی ئەنفال ببینین. توندوتیژی بەعس لە تاوانی لەناوبردنی بارزانییەکاندا ڕووی لە خێڵێکی دیاریکراوبوو، واتە کوشتن لێرەدا دیسانەوە کوشتنێکی تاکەکەسی و تایبەت نەبوو، بەڵکو کوشتنێکی کاتاگۆریانەبوو. ئەوەشی پێناسی ئەو کوشتنەی دەستنیشاندەکرد بارزانیبوون بوو. بەعس لە ئەنفالدا سنوورەکانی ئەم کوشتنە فراونتردەکاتەوە تا هەموو لادێکانی کوردستان دەگرێتەوە. بەهەمان شێوازی ئەنفال، لە تاوانی کوشتنی بارزانییەکاندا، هەموو ئەو نێرینانەی تەمەنیان لە ١٢ ساڵ بۆ سەرەوەبوو کوژران و دایك و خوشك و برا بچووك و خێزانەکانیشیان لە ئۆردوگایەك لە نزیك قووشتەپە کۆکرانەوە. ئەم مۆدێلە لە کوشتن ئەو دەروازەیەیە کە بەعس لێیەوە دەچێتە ناو تاوانەکانی ئەنفالەوە.

### ئەنفال و تێکەڵووبنی سێ مێژوو بەناویەکدا

لەپشتی تاوانی ئەنفالەوە سێ مێژووی تێکەڵ بەیەك و بەناویەکداچوو ئامادەیە. یەکەمیان مێژووی عێراقە وەك دروستکراوێکی کۆڵۆنیاڵی. دووهەمیان مێژووی بەعسە وەك هێزێکی ناسیۆنالیستی پەڕگیر. سێهەمیان مێژووی سەدام حوسەینە وەك دیکتاتۆرێکی نارسیستی نەخۆش. بەبێ تێکەڵبوونی ئەم سێ مێژووە بەیەکدی لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەنجامدانی تاوانەکانی ی ئەنفال کارێکی هێجگار زەحمەت دەبوو.خاڵی هەرە ترسناك لە مێژووی عێراقدا بوونی کوردە بە کەمینەیەکی نەتەوەیی لەناو دەوڵەتێکی نادیموکرات و دەسەلاَتگەردا، دەوڵەتێك کە دروستبوون و مانەوەی بە پلەی یەکەم پرۆژەیەکی کۆڵۆنیاڵی بوو و پەیوەندی بە قازانجە ستراتیژییەکانی بەریتانیای دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە هەیە. مێژووی عێراق لە سەرەتاوە تا ساتەوەختی ئەنفال و تا ئەمڕۆش مێژووی دەوڵەتێکە کە نەیتوانیوە نەتەوەیەك بەناوی نەتەوەی عێراقەوە دروستبکات. عێراق دەوڵەتێکە بێنەتەوە، دەوڵەتێکە لەسەر کۆمەڵگایەکی پارچەپارچە دروستبووە و چوارچێوەیەکی گشتی بۆ کۆبوونەوەی هێزە جیاوازەکانی ناو وڵاتەکە پێنییە. لە سەردەمی بەعسدا ئەم دەوڵەتە لەباتی بەخشینی شوناسی هاوبەش بە گروپە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگایە، ترسی هاوبەشی پێبەخشیون. ئەوەی وڵاتەکەی بەیەکەوەگرێداوە بە پلەی یەکەم توندوتیژی و هێزی لەشکر و ترساندن و هەڕەشەی کوشتن و لەناوبردن بووە، لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا عێراق دەبێتە یەکێك لە دەوڵەتە نەوتییە گەوە و گرنگەکانی دونیا و لەگەڵ دەوڵەمەندبوونی ئابووریدا ڕادەی دیسپلینکردن و ترساندن و بەکارهێنانی توندوتیژیی لە وڵاتەکەدا ڕوو لەزیادبوون دەکات[7]، چەند توانا ئابوورییەکانی وڵاتەکە گەورەتربوویێت، ئاواش توانا سەربازییەکانی گەورەتر و دەزگاکانی کۆنترۆڵکردن و دیسپلینکرد و بێدەنگکردنی خەڵکیش تێدا گەورەتربووە، عێراق لە کۆتایی شەستەکانەوە هەنگاو هەنگاو دەبێتە دەوڵەتێکی مۆدێرن، دەوڵەتێك توانای دروستکردن و گەورەکردنی هەموو دەزگا تازەکانی سەرکوتکردن و لێپرسینەوە و کوشتنی تێدا دروستدەبێت، بەلاَم ڕێگە نادات لانی هەرەکەمی ئەو فەلسەفە سیاسییە ئینسانی و دیموکراسییەی تێدا دروستببێت کە بەشێکی دانەبڕاوی دونیای مۆدێرنە. تازەبوونەوەی عێراق تازەبوونەوەی دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقییە، بەبێ تازەبوونەوەی ئەو فەلسەفە

سیاسییەی کە دەشێت مەترسییەکانی ئەو دەزگا تازانە سنووردار بکات و بیانکاتە دەزگای کۆنترۆڵکراوو چاودێریکراو. بەپێچەوانەوە تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ و شێوازەکانی ڕێکخستنی بیرۆکراتی مۆدێرن عێراقیان تا دەهات بەرەو تۆتالیتاریزم دەبرد.

لەساتێك لە ساتەکاندا دەوڵەتی عێراقی دەبێتە دەوڵەتێکی تەواو تۆتالیتاری، بەعس دەبێتە هێزێك لەهەموو گەڕەك و شارۆچکە و شارە گەورەکانی عێراقدا ئامادەدەبێت، دەچێتە ناو ئاهەنگ و ئەدەب و تەنانەت زمانەوە، هەزاران هەزار بنکەی حیزبی و دەزگای ئەمن و دەزگاکانی تری کۆکردنەوەی زانیاری و دیسپلینکردنی خەڵك دروستدەبن و ئینسانی عێراقی دەبێتە بوونەوەرێك لەهەرشوێنێك بێت و چۆن بژی، ناتوانێت لەچاوانی دەوڵەت بزربێت. مەگەر لادێکانی کوردستان توانیبێتیان خۆیان لەم توانا تۆتالیتارییانەی دەوڵەتی عێراقی بەدوورگرتبێت و وەك شوێنێکی نا دیسپلینکراو و ئازاد مابووبنەوە.

لەڕاستیدا یەکێك لە ئامانجەکانی ئەنفال نەهێشتنی ئەم دونیا ئازادە بچووکەیە لەبەردەم تەماحە تۆتالیتارییەکانی دەوڵەتی عێراقیدا، لادێکانی کوردستان ئەو بەشەی کۆمەڵگای کوردیی و کۆمەڵگای عێراقیبوون کە لەدەرەوەی تەماحە تۆتالیتارییەکانی دەوڵەتدا دەژیان، توانایەکی گەورەی خۆژیان و خۆپارستنیان لەدەوڵەت هەبوو، ئەنفال کۆتایی هێنانبوو بەم توانای خۆژێنی و سەربەخۆییەی ئەو بەشەی کۆمەڵگای ئێمە کە تەماحە تۆتالیتارییەکانی بەعس بۆی کۆنترۆڵ نەدەکرا.

لە سەرێکی دیکەوە دەوڵەتی عێراقی لە هەفتاکان و هەشتاکاندا چەند تازەتردەبێتەوە، ئەوەندە ڕەهەندە میلیتاریی و توندوتیژییەکانی گەورەتردەبێت. جەنگی ئێران و عێراق نەك تەنها ئابووری عێراقی کردە ئابووریی جەنگ، بەڵکو هەموو کۆمەڵگای عێراقی کردە کۆمەڵگایەکەی میلیتاریی، خەونی بەعس لەو ساڵانەدا دەبێتە خەونی بونیادنانەوەی عێراق لەسەر مۆدێلی سەربازگە، ملیۆنان سەرباز و چەکداری تر لە وڵاتەکەدا هەبوو، لەشکری مناڵان و ژنان و میللی و پیشەیی بەشێکی زۆری خەڵکی وڵاتەکەی کردبوو بە سەرباز، ڕێکخراوەکانی قوتابیان و ئافرەتان و مناڵان و گەنجان دەسەڵاتی بەعسیان ڕاکێشابووە ناو برێکی هەرە گەورەی ژیانی تایبەت و ژیانی گشتی کۆمەڵگای عێراقییەوە.

ئەم بەسەربازگەکردنەی کۆمەڵگای عێراقی ئەو هەستەی لە بەعسدا دروستکردبوو کە هەموو کۆمەڵگای عێراقی لەگەڵدایە و ئەوەشی لەگەڵ بەعسدا نییە بریتین لە کۆمەڵێك لەڕێلادەر و ناپاك کە پێویستە لەناوببرێن. ئەنفال وەك جینۆساید لە پەیوەندییەکی ڕاستتەوخۆدایە بە مێژووی هاوچەرخی عێراقەوە وەك دەوڵەتێك کە توندوتیژی و میلیتاریزم و ترسناندن و دیسپلینکردن ئەو چوارچێوانەیە کە وڵاتەکەی بە یەکگرتوویی هێشتۆتەوە و ڕاگرتوە. لەگەڵ تەقاندنی یەکەمین فیشەکی شۆڕشی کوردیشدا لە سەرەتای ساڵانی شەستدا، ئیدی ڕەهەندە ئەمنییەکەی مەسەلەی کورد لەلایەن حکومەتە یەك بە دوای یەکەکانی عێراقەوە هەموو ڕەهەندەکانی دیکەی ئەم مەسەلەیە دادەپۆشێت.

کورد لە دیدی حکومەتەکانی عێراقدا، بەتایبەتی لە دیدی بەعسدا و بەتایبەتیتر لەدیدی سەدام حوسەین و خێزانەکەیدا، دەبێتە ئەو بوونەوەرە تێکدەر، موخەریبەی، کە دەوڵەت وەك هەڕەشەیەکی بەردەوام تەماشای دەکات. دەبێتە گەورەترین ڕێگر لەبەردەم خەونی بە سەربازگەکردنێکی تەواوەتی کۆمەڵگای عێراقیدا. ئەو خاڵانەی سەرەوە بەرەو قسەکردن لەسەر بەعسمان دەبات، بەتایبەتی لەسەر ئایدیۆلۆژیای بەعس وەك ئایدیۆلۆژیایەکی ناسیۆنایستی پەڕگیر.

ئایدیۆلۆژیای بەعس لە چاپە ئەفلەقییەکەیدا ئایدیۆلۆژیایەکە پڕە لە ڕەگەزی فاشییانە. تێکەڵێکە لە داروینیزمی کۆمەڵایەتی و ڕۆمانسیەت. داروینیزمی کۆمەڵایەتی نرخێکی هێجگار گرنگ بۆ هێز و دەسەڵات دادەنێت و ڕۆمانسیەتیش هەستی بێوینەیی و دەگمەنی و نارسیزم گەوردەکات.

بەعس ئەو بزوتنەوە ناسیۆنالیستییە کە لەسەر تێکەڵکردنی ئەم دوو شێوازی بیرکردنەوەیە کاردەکات، تێکەڵکردنی داروینیزمی کۆمەڵایەتی بەڕۆمانسیەت، هێزپەرستی بەنارسیزم، لەپەیوەندیدا بە هێزپەرسیتییەوە ئایدیۆلۆژیای بەعس هێزپەرستیەکەی نەك تەنها تەرجەمەکردوە بۆ دەوڵەتپەرستی، بەڵکو بۆ سەرکردەپەرستیش.

لەسەردەمی سەدام حوسەیندا ئەم هێزپەرستییە بە پلەی یەکەم گۆڕاوە بە سەرکردەپەرستی. لەم ئایدیۆلۆژیایەدا خەڵك گشتێکی وێکچووی بێکاراکتەرە کە سەرکردەیەکی مێژوویی دەستیاندەگرێت و بەناو مێژوودا بەرەو هێز و دەسەڵات و مەزنی دەیانبات. ئەم وێنەیە بۆ سەرکردە ڕادەی نارسیزم و خودئەڤینی سەرکردەکان بە پلەیەکی تۆقێنەر گەورە و ترسناك دەکات. مۆدێلی بسمارکییانەی یەکگرتنەوەی

ئەڵمانیا دەبێتە ئەو مۆدێلەی کە سەرکردە بەعسییەکان، بەتایبەتی سەدام حوسەین، خەونی بەردەوامی پێوەدەبینێت. بەعس دیموکراسیەت، کە وڵاتێکی فرە دین و فرە نەتەوە و فرە کولتوریی وەك عێراق لەهەمووشتێکی تر زیاتر پێویستی پێیەتی، وەك داهێنراوێکی ڕۆژئاوایی و ئیمپریالی مامەڵەدەکات. هەر هێزێکیش باسی لە دیموکراسیەتکردبێت بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆتە دوژمنی بەعس، یان بەعس وەك دوژمن مامەڵەکردوە.

لە ڕاستیدا دیموکراسیەت لە دیدی بەعسدا دژ بەو مەیلی هێزپەرستی و سەرکردەپەرستییەیە کە کۆڵەکە گەورەکانی ئایدیۆلۆژیای بەعس پێکدەهێنن. لەهەمانکاتدا خەونی پان عەرەبیزمی بەعس وادەکات ئایدیۆلۆژیای بەعس هەموو گروپە ئەتنی و دینی و کولتورییە ناعەرەبەکانی دونیای عەرەب وەك عەرەب ببینێ و مامەڵەبکات(8)، واتە پرۆژەی تواندنەوەی ئەم گروپانە لەناو قاڵبی عەرەبیزمدا ئەو دیدە ئایدیۆلۆژییەیە کە بەعس بۆ گروپە ناعەرەبەکانی هەیە. لەناو عێراق و لەسەر ئەرزی واقیع ئەم ئایدیۆلۆژیایە خۆی لە داهێنانی سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکاندا بینییەوە. بەعەرەبکردنیش سیاسەتی سەندنەوەی خاك و شوناسە لە هەموو ئەوانەی عەرەب نین، هێرشێکی ڕاستەوخۆیە بۆسەر شوناسی ئەتنی و نەتەوەیی ئەوانەی بەعس بە عەرەبیان نازانێت و مانەوەشیان وەك ناعەرەب وەك مەترسیی و کێشەیەکی ئەمنی تەماشادەکات، ئاشکرایە بڕێك لە ڕەگوڕیشە ئایدیۆلۆژییەکانی جینۆساید لەناو ئەم پێکهاتە ئایدۆلۆژییەی بەعس خۆیدایە، ئەوەی یارمەتی بەعس ئەدات شێلگیربێت لە پێداگرتن لەسەر ئەم ئایدیۆلۆژیایە لەپەیوەندیدا بە کوردەوە بڕێك لە کوردەکان خۆیانن، کەلەپوری بەجاشبوونی کورد یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بەبەعس ئەو هەلە ببەخشێت دووجۆر کورد لەیەکدیجیابکاتەوە، یەکەمیان کوردی باشە، واتە ئەوانەی کە لەگەڵ بەعسدا کاردەکەن و دڵسۆزی سیاسەتەکانین، بەرامبەر بەوانەی کە لادەر و خائین و ناپاکن، واتە کوردی خراپ،بوونی جاشی کورد ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە بەخائینکردن و بەناپاککردنی هەرچی زیاتری بەرگریی و شۆڕشەکانی کوردا، لەگەڵ بەهێزبوونی بەعسدا تا دەهات ڕۆڵی جاشەکان زیاتر دەبوو، نەك تەنها لەڕووی سەربازییەوە، بەڵکو لەڕووی چەسپاندنی زیاتری ئەو وێنەدا کە بەعس لەسەر کوردی نابەعسی هەیبوو.

بەعس پێیوابوو هەموو کۆمەڵگای عێراقی لەگەڵدایە و هەموو خەڵك دڵسۆزن بۆی، بە جاشەکوردەکانەوە، لەهەمانکاتدا ئەو هەستەشی هەبوو کە جەنگی ئێران و عێراق نیشانیداوە خەڵك ئامادەن گیانی خۆیان لەپێناوی بەعس و عێراقدا ببەخشن، بە هەزاران هەزار سەربازی عێراقی لە عەرەب و کورد و گروپە ئەتنی و دینییەکانی تر لە جەنگی ئێران و عێراقدا کوژران، بەعس ئەو کوژراوانەی وەك هاولاتییە ڕاستەقینە و دڵسۆز و بەوەفاکانی عێراق تەماشادەکرد، چا ئەگەر کوڕە باش و بەوەفاکانی عێراق بمرن، ئەی بۆ ئەو کەمە خائین و لەڕێلادەر و نادڵسۆز و بێوەفایانەش نەمرن کە کێشە بۆ دەوڵەت دروستدەکەن و دەدەنە پاڵ دوژمن.

جەنگی ئێران و عێراق وێنەی کوردی وەك لادەر و نادڵسۆز و بێوەفا و خائین بەڕادەیەکی ترسناك لە دیدی بەعسدا قووڵکردەوە. بەبۆچوونی من پەلامارەکانی ئەنفال لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدان بەم وێنەیەی کوردەوە کە ڕەگەکانی لەناو ئایدیۆلۆژیای بەعسدایە، بەلاّم جەنگی ئێران و عێراق مەودایەکی فراوانتر و توندتیژتری خولقاند بۆ قووڵبوونەوەی ئەم وێنەیە لە خەیاڵی سیاسی بەعسدا. تاوانی ئەنفال ناکرێت لە کەسی سەدام حوسەین خۆی وەك نارسیستێکی گەورە و دیکاتۆرێکی خوێناوی و بێبەزەیی جیابکرێتەوە، هەندێك لەوانەی شیکردنەوەی دەرونیان بۆ سەدام حوسەین کردوە وەك کەسایەتییەکی مەرگدۆست دەیناسێنن، بۆ نموونە کە عێراق کوێتی داگیرکردوو هەموو دونیا داوایان لێکرد بگەڕێتەوە دواوە بۆئەوەی ڕووبەڕووی لەشکری هەموو ناوچەکە و ئەمریکا و دونیا نەبێتەوە، واتە بۆ ئەوەی نەچێتە شەڕێکەوە کە ئەگەری دۆڕاندن و بەرگە نەگرتن تیایدا سەد دەر سەد بووە، لەو کاتەدا سەرۆکی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان جێڤری پێرێز دی کیولەر ووتی: "ناتوانم باوەڕبکەم یەکێك جەنگی ئەوێت تەنها بۆئەوەی چێژ لە کوشتنی خەڵکەکەی خۆی ببینێت".

ئارەزووی سەدام بۆ وێرانکردن ئارەزوویەکە زۆربەی ئەوانەی لەسەر کەسایەتی ئەویان نووسیوە باسیانکردوە، لۆژیکی سەدام ئەوە بوو یان ئەوەتە دەبێت بۆ عێراق بمریت، واتە لەشەڕەکانی بەعسدا بمریت، یان ئەوەتا بەعس دەتکوژێت، کەسە دڵسۆز و قارەمانەکانی بەعس لە شەڕەکانی سەدامدا دەمرن و خۆیان دەدەن بەکوشت، کەسە ناپاك و نادڵسۆز و دزێوەکانیش بەعس خۆی دەیانکوژێت، ئەم لۆژیکە سایکۆلۆژییە تەسکە کە دونیا بۆ دۆست و دوژمن دابەشدەکات و هەردووکیشیان لە دوو شێووە

مەرگەوە گرێدەدات، ئەو لۆژیکەیە کە تاوانەکانی ئەنفال ئاراستەدەکات. بەکورتی تێکەڵبوونی ئەم سێ هۆکارە بەیەکدی، مەبەستم تێکەڵبوونی مێژووی عێراق و مێژووی بەعس و مێژووی سەدامە بەیەکدی، وایانکرد کۆمەڵگای ئێمە ئەو کارەساتە گەورەیەی لە کۆتایی هەشتاکاندا بەسەردابێت، بەستنەوەی ئەنفال بەم سێ هۆکارە سەرەکییەوە یەکێکە لەو دەروازە گرنگانەی کە دەشێت بەرەو خوێندنەوەی ڕاستەقینەی ئەنفالمان ببات

## ئەنفال وەك برینێکی سایکۆلۆژی

لە کۆتایی ئەم نووسیەندا دەمەوێت چەند سەرنجێك لەسەر ئەنفال دەرببڕم وەك برین یان پرۆژەی برینێکی نەتەوەیی، ئەوەی گومانی لەسەر نییە ئەوەیە ئەنفال برینێکی سایکۆلۆژی گەورەیە لانیکەم لای ئەوانەی بەناو جەهەنەمی ڕووداوەکانیدا تێپەڕین و نەمردن، هەروەها ئەنفال برینێکی سایکۆلۆژی گەورە و کراوەیە لای زۆربەی ئەوانەی بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیان بە قوربانییەکانی ئەنفال و وێرانکارییەکانییەوە هەیە.

لە ڕاستیدا کۆمەڵگای کوردی دوای ئەنفال کۆمەڵگایەکی پڕ برینە[9] برین سەرەکیترین سیفەتی ئەو دونیایەیە کە ئەنفال لەدوای خۆیەوە بەجێهێشتوە. لەناو ئەم مێرگە گەورەیەی بریندا من هەوڵئەدەم دووجۆر برین لەیەکدی جیابکەمەوە، دوو جۆر پەیوەندیی ئینسانی ئێمە لە ئەنفالدا بەشێوەیەکی قووڵ و فرەلایەن برینداربوو، یەکەمیان پەیوەندی کوردە بە عێراقەوە وەك گشتێکی سیاسی و کۆمەلأیەتی و ئەخلاقی، دوهەمیان پەیوەندی کوردە بە خۆیەوە، وەك نەتەوەیەکی پارچەپارچە و دابەش و پڕ ناکۆکی، یەکەمیان پابەستی ئەو هێز و جەبرە جینۆسایدییەیە کە دەوڵەتی عێراقی لە وێرانکردنەکانی ئەنفالدا خستییەکار، دووهەمیان وابەستەی ئەو ڕاستییەیە کە بەشداربوونی کورد خۆی لەپەلامارو وێرانکارییەکانی ئەنفالدا بەشداربوونێکی بەرچاوە، ساڕێژکردنی ئەم دوو برینە پێویستی بەسەرلەنوێ داڕشتنەوەی دەوڵەتی عێراقیو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ئەو پەیوەندییانەوە هەیە کە کۆمەڵگای ئێمە بە دەوڵەتی عێراقییەوە گرێئەدات، هەروەها پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی هەمەلایەنی ماناکانی کوردبوون و ئەو وێنانەوە هەیە کە کورد لەسەر خۆی وەك نەتەوە هەیەتی، ئەنجامدانی ئەم دوو ئەرکەش پێویستە جەوهەری کاری سیاسیی کوردستانی دەستنیشان بکات و ببێتە کۆڵەکەی هەرەسەرەکی دروستکردنی کوردستان و عێراقی دوای ئەنفال، بەبێ

ئەنجامدانی ئەم کارانە زەحمەتە ئەنفال لە برینێکی سایکۆلۆژیی تایبەتەوە بکرێت بە برینێکی نەتەوەیی گشتی.

کردنی ئەنفال بە برینێکی نەتەوەیی بەناو ئاشتکردنەوەی ئینسانی ئێمە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ دونیای دەوروبەرییدا تێدەپەڕێت، ئەو هەستکردنە گەورەیەی بە ترس لای ئینسانی ئێمە دروست بووە، ترس لەخۆی و ترس لە هاوڕەگەزەکانی و ترس لەدراوسێکانی و ترس لەوانەی لە ناوچەکەدا لەگەڵیاندا دەژی، نەك تەنها پێویستی بە عەقڵانیکردن هەیە، بەڵکو پێویستی بە ڕەوانەوە هەیە، ئەم ئەرکە هاوشانە بە ئەرکی گەڕاندنەوەی هەستکردن بە ئەمن و ئاسایشی سیاسی و کۆمەڵایەتی لای کۆمەڵگای ئێمە بە گشتی و لای قوربانیانی ئەنفال بەتایبەتی.

کۆمەڵگای دوای ئەنفال کۆمەڵگایەکە پێویستییەکی گەورەی بە ئاسایشی کۆمەڵایەتی هەیە، ئەم ئاسایشە نەك تەنها هێمنی لە ژیانی خەڵکدا دروستدەکات، بەڵکو خاڵێکی هێجگار گرنگیشە بۆ گەڕانەوەی باوەڕ بەو دونیایەی ئینسانی ئێمە تێیدا دەژی، بۆ تێپەڕاندنی برینەکانی ئەنفال و بۆ دروستکردنی کۆمەڵگای دوای ئەنفال ئینسانی ئێمە پێویستی بەوەیە هەستبکات کە بوونەوەرێکی خاوەن ڕێز و قورسایی و حورمەتە، لەپێش هەمووانیشەوە بوونەوەرێکی خاوەن مافە و کەس ناتوانێت ئەو مافانەی لێبسێنێتەوە، کۆمەڵگای دوای ئەنفال کۆمەڵگایەکە خاڵی لەهەموو ئەو ڕەگەزانەی ئەنفالیان دروستکرد، کۆمەڵگایەکە مژدەی ڕاستەقینەی بۆ جوانترکردن و باشترکردن و ئینسانیترکردنی دونیا پێیە.

### پەراوێزەکان

١-بۆ تێگەیشتن لە مانا و دەلالەتەکانی چەمکی جینۆساید بڕوانە:

William D. Rubinstein (2004). Genocide: a history. Harlow [etc.]: Pearson™

٢ -بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قوربانیانی جینۆساید و چۆنیەتی دەسپێکردنی پرۆسەی گەردنئازادی و ئاشتبوونەوە و چۆنیەتی ساڕێژکردنی ئەو برینە سایکۆلۆژیانەی کە جینۆساید دروستیاندەکات و چۆنیەتی ڕێکخستنەوەی دەزگاکانی دەوڵەت و دەزگا کۆمەڵایەتییەکی تر بڕوانە:

Ervin Staub (2006). Reconciliation after Genocide, Mass Killing, or Intractable Conflict: Understanding the Roots of Violence, Psychological Recovery, and Steps toward a General Theory. Political Psychology. Volume 27 Issue 6 Page 867-894, December 2006™

٣ -بۆ پێناسو ناساندنو دەستنیشانکردنی قۆناغو سەرزەمینی جوگرافی پەلامارەکانی ئەنفال بڕوانە:

Iraq's crime of genocide (1995): the Anfal campaign against the Kurds / Human Rights Watch/Middle East. New Haven [etc.] Yale University Press.™

**تا ئەمڕۆکە ئەم کتێبە باشترین کتێبێکە کە لەسەر تاوانەکانی ئەنفال نووسرابێت. هەموو کارێکیش لە ئایندەدا لەسەر ئەنفال بکرێت ناتوانێت باز بەسەر زانیارییە گرنگەکانی ئەم کتێبەدا بدات. بەڵام ئەم کتێبەش وەك هەر کتێبێکی دیکە بێ کەموکوڕی نییە. ڕەنگە سەرکیترین کەموکوڕی ئەم کتێبە لەوەدابێت کە نەیتوانیوە پێمانبلێیت بەعس لەسەر چ ئەساسێك ئەو کۆمەڵە ناوچە تایبەتەی لە کوردستان هەڵبژارد بۆ ئەنفالکردنیان، کتێبەکە ئەنجامدانی ئاماری ساڵی ١٩٨٧ دەکاتە بناغەی ئەم هەڵبژاردنە، واتە ئەو ناوچانەی ئامارناکرێن ئەبنە ئەو ناوچانەی کە ئەنفالدەکرێن و ئەو ناوچانەش کە ئاماردەکرێن ئەنفال ناکرێن، بەڵام ئەم دەستنیشانکردنە لەگەڵ واقیعی ڕووداوەکانی ئەنفالدا یەکناگرێتەوە، چونکە شوێن هەبووە ئاماریشکراون و ئەنفالیشکراون.**

**٤ -پەلامارەکانی ئەنفال بەشێك نین لە پەلامارەکانی شەڕی ئێران و عێراق ئەگەرچی ئامادەگی ئەو شەڕە یارمەتی بەعسیدا بتوانێت پەلامارەکانی ئەنفال ئەنجامبدات، تێکەڵکردنی ئەم دووانە هەڵەیەکی گەورەیە .بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم خاڵە بڕوانە:مەریوان وریا قانیع(١٩٩٨). ئەنفال و مۆدێرنە، ڕوداوێك لە دوامانەوە یان ئەگەرێك لە پێشمانەوە. گۆڤاری ڕەهەند. ژمارە ٧ ناوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی.**

**٥– بۆ تێگەیشتنی زیاتر دەربارەی ئەو خاڵانەی سەرەوە بڕوانە:**

1- Irving Louis Horowitz (1997). Taking lives, genocide and state power. New Brunswick.
2-Zygmunt Bauman (1998). De moderne tijd en de holocaust. Amsterdam : Boom

**٦ -دەربارەی چەمکی هۆمۆساکەر لای ئاگامبن بڕوانە:**

Giorgio Agamben (2002). Homo sacer : de soevereine macht en het naakte leven
Boom. ،Amsterdam

**هەروەها بڕوانە: بەختیار عەلی (٢٠٠٥). گوتاری مانەوە. سەردەمی ڕەخنە ژمارە ٣ بەهاری ٢٠٠٦. ل ٨٧-١٢٢.٧ -بۆ 7 – زانیاری زیاتر لەسەر گەشەی عێراق وەك دەوڵەت بڕوانە:**

Charles Tripp (2000) A history of Iraq. Cambridge. Cambridge University Press.

**هەروەها بڕوانە:**

Kanan Makiya (1990). Republic of fear : Saddam's Iraq. London. Hutchinson Radius.

**٨ -دەربارەی بەعس بڕوانە:**

John F. Devlin (1966). The Ba'th Party : a history from its origins to 1966.Stanford, Calif. Hoover Institution Press.

**٩ -ئەم ئامادەگییە بەرفراوانەی برین لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەو چاوەڕوانییە لە سیاسەت لە کوردستاندا دروستدەکات کە ببێتە چالاکی سارێژکردنی برینەکانی ئەو کۆمەڵگای. چۆنیەتی مامەڵەکردنی برینە سایکۆلۆژییە دەستەجەمعییەکان، یان چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگایەکی پڕ برین، ئەو هونەرە گرنگەیە کەدەبێت سیاسەتکردن لە کوردستاندا فێرببێت.**

# ئایدۆلۆژیا و تیرِوانینی حیزبی بەعس

پشتیوان رەحیم

## ئایدۆلۆژیای حزبی بەعس:

"شەوی لەیلەتولقەدر تا
بەیانی کەس نەخەوت هاوارمان بۆ
خوا ئەکرد ئەوان فشقیاتیان بە
خوا وبە پارانەوە ئەهات، ئەیان
وت وا ئێمە سەموون و ئاوەکەتان
نادەینێ با خوا لە ئاسمانەو
کەبابتان بۆ بنرێتە خوارەوە"

**سەبریە عومەر ئیسماعیل**[1]

کاتێک کە حیزب دروست دەبن لە سەر پاشخانێکی هزری پێشت وەخت دروست دەبن و لەسەر ئایدیاو فەلسەفەیەکی ئامادە درێژە بە کاری حیزبایەتیان دەدەن، ئەو ئایدیاو فەلسەفەیەش دەبێتە رێنیشاندەری کارو ئەرکیان، وەڵێ کەم حیزب هەیە بتوانێت ئایدیایەکی تایبەت و سەربەخۆ بۆ خۆی بنیات بنێت، حزبی بەعس ئایدیاو جیهانبینییەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵبەت ئەو ئایدیایە لە ئەنجامی بیروڕای دامەزرێنەرانی و تێکەڵکردن و هەڵبژاردنی تێزە فەلسەفییەکانەوە هاتۆتە بەرهەم، لێکۆڵینەوەی راستەقینە لەسەر بەعس دەبێت لەسەرەتاوە لە خوێندنەوەی بەعسەوە دەست پێ بکات، وەکو دیاردەیەکی تایبەتی بە جێگایەکی تایبەت و سەردەمێکی تایبەت، بەعس نمونەیەکی تایبەتییە هیچ تیۆرێکی تایبەت لە بنەرەتدا لەسەر بەعس کاری نەکردبێت و لە رەفتاری ئەوەو هەڵنەقولأبێت ناتوانێن لەسەر بۆچوونی گشتگیرو عومومییەوە، یان تەنها لەسەر رۆشنایی هەندێك چەمکی تیۆرییەکانی دیکەی دەسەلأتەوە، بەعس وەکو یەکەیەکی لەیەکنەترازاو تەفسیر بکات، بۆ تێگەیشتن لە بەعس دەبیت لە بەعسەوە خۆی دەست پێ بکەین، نەك لە مۆدێکی تیۆریانەی دەرەوە، دەبێت

لێگەڕێن بەعس خۆی وەکو دیاردە وسیستم چەمکە تیۆرییەکانی پێشکەش بکات، واتا بەعس وەکو کۆمەڵێك روداو و دیاردە و دەرکەوتە و رەفتار ببینێت[2].

بۆ ئەوەی لە رەهەندەکانی ئایدۆلۆژیای حزبی بەعس بگەین، پێویستە گوزەرێك بەسەر مانا و تێگەیشتنی زاراوەی ( ئایدۆلۆژیا) دا بکەین.

زاراوەی ئایدۆلۆژیا بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٧٩٦ لە لایەن دوستوت دوتراسی (destutt de tracy) کەیەکێك بوو لە پێشرەوانی فەرەنسی پۆسەتیفیزم و لایەنگیری رێبازی هەستگەری بەکار هێنرا، دوستون دوتراسی دەیویست زانینێکی نوێ بەناوی( بیرناسی) وە دابمەزرێنێت و بە واتای زانستێك بەکاری دەهێنا کە لە بیرو باوەڕەکانی دەکۆڵێتەوە[3]، ئایدۆلۆژیا بەو مانایە دێت کە ئایدیایەك دەتوانێت ببێتە بابەتی زانستێك( رێك وەك ئەوەی ئاژەڵ دەبێتە بابەتی گیانەوەر ناسی(ideo-logie) وەکو zoo-logei) ، ئادۆلۆژیا رێك ئەوەیە کەناوەکەی دیاری دەکات، ئایدۆلۆژیا لۆژیکی ئایدیایەکە مێژوو و بابەتی ئایدۆلۆژیایە کە ئایدیایەکی لەسەر پیادە دەکرێت[4]

دواتر زاراوەی ئایدۆلۆژیا لای هەر بیریارێك پێناسەو فۆرمی تایبەتی خۆی وەر دەگرێت، ئایدۆلۆژیا لای مارکس چەمکێکی سلبییە، مارکس پێی وایە ئایدۆلۆژیا هۆشیارییە بەڵام هۆشیاریەکی درۆزنانە و کەسی خاوەن ئایدۆلۆژیا یان ئایدۆلۆژیست کەسی خەیاڵ پەروەرە کەبە خەیاڵپلاوی و دابڕاو لە واقیع دڵی خۆی خۆش دەکات، ئەو پێی وایە ئایدۆلۆژیا چەکی چینی ناوەڕاستە، واتا ئەوەی کەرەستەکانی بەرهەمهێنانی بە دەستە و خاوەنیەتی، خاوەنی ئایدۆلۆژیاو بەرهەمهێنەرێشێتی[5].

کارل مانهایم کۆمەڵناسی ئەڵمانی پێناسەی ئایدۆلۆژیا دەکات بەوەی کە بریتییە لە کۆمەڵێك بیروڕا ئەم بیروڕایەش بەرهەمی ژینگەی کۆمەڵایەتییە، مانهایم چەمکی ئایدۆلۆژیا لە پەیوەندی بە چەمکی یۆتۆپیارە باس دەکات، ئەو پێی وایە ئایدۆلۆژیا بیرو باوەڕی چینی دەسەڵاتدارە کە ئاراستەی هەلومەرجی باو دەکات، کەچی یۆتۆپیا چەکی چینی ژێردەست و شۆڕشگێڕە، بە مانایەکی تر ئایدۆلۆژیا پارێزگاری لە هەلومەرجی باو دەکات کەچی یۆتۆپیا داوای گۆڕان دەکات.

ئەنتۆن گیدنیز کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئینگلیزی پێناسەی ئایدۆلۆژیا لە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە دەکا، ئەو دەڵی ئایدۆلۆژیا کۆمەڵێك بیروراو باوەڕی هاوبەشن کەخزمەت بە گروپە زاڵەکانی ناو کۆمەڵگە دەگەێنن، ئایدۆلۆژیا لە هەمو ئەو کۆمەڵگایانەدا بەرچاو دەکەوێت کە نایەکسانیەکی رێکخراو و قوڵ لە نێوان گروپەکاندا هەیە، چەمکی

ئایـدۆلۆژیا پەیوەندییـەکی نزیکـی بـە چـەمکی دەسـەڵاتەوە هەیـە، چـونکە سیـستەمە ئایدۆلۆژیاکان شەریعەت بەخشی ئەو دەسەڵاتە جۆربەجۆرانەن کە گروپەکان هەیانە.

دکتـۆر عـەلی شـەریعەتی کۆمەڵناسـی ئێرانـی بـۆ ئایـدۆلۆژیا دەڵێـت" تێـڕوانین و هۆشـیارییەکی تایبـەتی مرۆڤـە سـەبارەت بـە خـۆی و پێگـە چـینایەتییەکەی، بنەچـە کۆمەڵایەتییەکەی، بارودۆخی نەتەویی، چارەنووسی جیهان و مێژووی خۆی، ئەو گروپـە کۆمەڵایەتییـەی کـە پێـوەی بەسـتراوەتەوە و ئاراسـتەی دەکـات و لـە ڕێگـەی ئـەوەوە لێپرسـراوێتی و ڕێگاچـارەی هەڵوێـستەکانی و ئامـانجی تایبـەتی و دادوەری تایبـەت بەدەست دێنێت و لە ئاکامدا بڕوا بە ئەخلاق و هەڵسو کەوت و کۆمەڵە سیستەمێکی بـەهایی تایبـەت دەهێنێـت، ئایـدۆلۆژیا ژیـانی کۆمەڵایـەتی بـە هـەموو لایەنێکـەوە تەفسیردەکات و وەڵامی( چۆنی؟) و (چی دەکەیت؟) و ( دەبێت چی بکرێت؟) و ( دەبێت چی ببێت دەداتەوە؟)

عبدوالکریم سروش خاوەنی دکتۆرا لە فەلسەفەی زانست و بیرمەندی ئێرانی چوار ڕۆڵی سەرەکی بۆ ئایدۆلۆژیا دیاری دەکات:

١- شەرعیەتدان بە دەسەڵات.

٢- نەهیشتنی دژایەتی لە نێوان جیهانی ناوەوەو دەرەوەی مرۆڤدا، ئەمەش لە ڕێگەی بەڵگە داتاشین و ئاراستە کردنەوە.

٣- ئایدۆلۆژیا بە شێوەیەکی ناراست و نادروست مرۆڤ لە نامۆیی ڕزگاردەکات، مرۆڤ لە ڕێگە لادەدات و لەگەڵ دنیادا دەیگونجێنێت و ناراستی بەراست پێشان دەدات.

٤- ئایدۆلۆژیا لە کاتی قەیران و گرفتە گەورەکاندا سەر هەڵدەدات و پەرە دەسێنێت و بانگەشە بۆ شۆڕش دەکات. (5)

ئەو پێناسانەی سەرەوە پێویست بوون بۆ زانین و شیکردنەوەی شوناسی هەر حیزبێك کە سەر بە هەر ئایدۆلۆژیایەك بێت بە ئایدۆلۆژیای حزبی بەعسیشەوە.

حزبی بەعس ئایدیایەکی ناسیۆنال سۆسیالیستی هەبوو کە دامەزرێنەرەکەی (مشێل ئەفلەق)ـە سەرچاوەی گەورەی بیرو وێنا کردن و ئیلهامەکانی ئەفلەق فەلسەفەی ئەڵمانییە کە لە میژوودا مارکسیزم و فاشیزمی بەرهەم هێناوە(6)

بە بیّ زانینی بیرو ڕاکانی مشێل ئەفلەق ناتوانین بە وردی لە گەڵ ئایدۆلۆژیای حزبی بەعسدا مامەڵە بکەین، مشێل ئەفلەق کە دامەزرێنەری حزبی بەعسە، لە هەمانکاتیشدا بەشێکی بنچینەی ئایدۆلۆژیای بەعس لە سەر بیروڕای ئەفلەق بنیاد نراوە.

مشێل ئەفلەق لە ساڵی ١٩١٢ لە خێزانێکی دیانی لە ئاینزای ئۆرتۆ دۆکسی یۆنانی لە دیمەشق هاتۆتە دنیاوە و لە زانکۆی سۆربۆن لە فەرنسا زانستی مێژووی خوێندووە، ئەفلەق کابرایەکی رەق بوو بەرامبەر بەخۆی و روحیەتیەکی جددی هەبووە و خاوەنی سایکۆلۆژیەتێکی ئاڵۆز بوو جگە لەمەش هەموو ژیانی تەرخان کردبوو بۆ کێشەی عەرەبی و ژیانی رۆژانەی بیٚ لاف و گەزاف دەبردەسەر و باکی نەبوو بۆ خۆدەوڵەمەند کردن، ئەم شێوە ژیان و هەڵویستی سیسماتیکی بەرامبەر بە کێشەی عەرەب جۆشی دروست کردبوو لە ناو خەڵکیدا و کەسانی رادەکێشا و وای لە خەڵکی دەکرد کە ژیان و کات و وزەی سایکۆلۆژیان تەرخان بکەن بۆ پاشە رۆژی میلەتی عەرەب، جگە لەوەش پاش چوار ساڵ لە خوێندنی ماددەی مێژوو لە سۆربۆن بە زانیاریەك و باکگراوندێکی باوەر پێکراوەوە گەرابووەوە بۆ سوریا لەبەر ئەم هۆیەش توانی کارێکی زۆر بکاتە سەر ئەوانەی گوێیان لیٚ دەگرت، بۆ ماوەی دەساڵ کە مامۆستا بوو لە خوێندنگەی ئامادەیی لە دیمەشق خۆی تەرخان کردبوو بۆ بڵاوکردنەوەی پرەنسیپەکانی بیری ناسیۆنالیزمی عەربی لەسەر ژیان و میژووی، هەر لە ساڵی ١٩٣٥- ١٩٤٢ توانی ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکار لە خۆی کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی فێری پەیامی ناسیۆنالیزمی عەرەبییان بکات، لەوانەیە ئەو سەردەمە زۆر گرنگ بووبیٚ بۆ دروست کردنی شانەو پەیداکردنی لایەنگیران بۆ پارتی بەعس کە لەساڵی ١٩٤٢ وەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا دەستی بە کارکردن کرد[7]

هەر لە هەمان ساڵدا حیزبی بەعس لە سوریا بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا کرد و کۆمەڵێك دروشمی بەرز کردەوە کە بەشێك لەو دروشمانە هێمای ناسۆنالیزمی (پان عەرەبی) پیٚشان دەدات، ئەم هەڵبژاردنە بە پێی مێژووی بەعسی عەرەبی (کە ناوی تەواوی ئەو حیزبە بوو ئەو کاتە) یەکەم بەشدارییان دەبێت لە هەڵبژاردندا و یەکەم دەرکەوتنی ئاشکرای بیروباوەڕیان دەبێت.

بەشێك لە دروشمەکانی ئەمانە بوون:

١- گرینگی دان بەبیری ناسیۆنالیزمی ژیاو( حی) کەرۆحی عەرەبی نوێنەرایەتی دەکات.

٢- گرینگی دان بەکەسێتی رابردووی عەرەب و رۆحی نەتەوەیی عەرەب.

٣- رەفزکردنی کۆمۆنیزم کە نوێنەرایەتی ماتریالیزمی پێشکەوتنی دروستکراو دەکات.

٤- هەوڵدان بۆ بە هاوجوتکردن لە نێوان بەرژەوەندی ناسیۆنالیزم و ئاین (واتا لە نێوان عەرەبایەتی و ئیسلام).

٥- بایەخدان بە یەکێتی وڵاتە عەرەبەکان لەسەر بناغەی ئەم فیکرە( تاکە یەك نەتەوەی عەرەب خاوەنی پەیامێکی هەتا هەتاییە) [8] بە پێی جیهان بینی و بیروراکانی مشێل ئەفلەق و ئەو دروشمانەی کە لەیەکەم دەرکەوتنی بەعسدا هەیە، حیزبی بەعسی عەرەبی بە ناسیۆنالیستی یان عەرەبی درێژە بەکاری حیزبایەتی دەدات و ستراتیژییەکانی خۆی لەسەر بەرژەوەندی عەرەب و بە سوود وەرگرتن لە ئاینی ئیسلام و میژو زمان و کلتووری عەرەبی دادەرێژێت و لقی عێراقی حزبی بەعس لە ساڵی ١٩٥٢ لەسەر ئامۆژگارییەکانی مشیل ئەفلەق دامەزرا[9] و لە ساڵی ١٩٥٣ دا پاشگری سۆسیالیستی بۆ ناوی حزبی بەعسی عەرەبی زیاد دەکرێت[10] کە ئەمەش مەهامی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ تەواوکردنی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست.

بەعس پێکهاتووە لە سیستەمێك بیرو باوەڕ لەسەر بنچینەی بەرزڕاگرتن و پیرۆزاندنی هەستی ناسیۆنالیزم، لەم هەڵویستەوە بەعس بانگەشە دەکات بۆ کلیازمێکی* شۆڕشگێرانە کە ئامانجەکەی بریتییە لە دروستکردنی جۆرێکی نوێ لە ئادەمیزاد و بنیادنانی پەیرەوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی نوێ یاخود وەك سەدام حسێن دەڵیت" بەعس ئەوەیە کە کۆمەڵ و دەوڵەتێکی بەعسی دروست بکات، لەسەر بناغەی ئەو ئایدۆلۆژیایە بەعس دوو قەوارەی سیاسی پێکەوە کۆ دەکاتەوە، ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم[11]

بەعس بۆ ئەوەی فەنتازیاکانی خۆی بهێنێتە دی دەبێت دنیایەکی نوێ دروست بکات ، بۆ ئەوەی دنیایەکی نوێش دروست بکات دەبێت مرۆڤێکی نوێ بسازێنێت، ئەو مرۆڤەش کە بەعس بە بەرزە نمونەی مرۆڤی دەزانێت، دەبێت مەرجەکانی ئەو سیستەمە قبوڵ بکات، ویستەکانی جێبەجی بکات، لەسەرکێشییەکانی بژی، لە هەمان کاتیشدا هێزی دەوڵەت و سوتەمەنی ئارازووەکانی ئەویش بێت، واتا بەعس بۆ مرۆڤێك دەگەڕێت لە یەك کاتدا دەسەڵاتی ئەو بەرجەستە بکاتەوە و مادەیەکی ئاسان و سوکیش بێت بۆ

* لە تیۆلۆژیدا ئەو ئەقیدەیە دەگرێتەوە کە باس لە گێڕانەوەی عیسا دەکات بۆسەر زەوی لە هەزار ساڵی داهاتوودا، لە تیۆری سیاسیشدا بە واتای گەرانەوە بۆ دواوە دەگرێتەوە.

فەنابوون، ئیرادەی ئەو دەر بخات و خۆی ئیرادەی نەبێت، جەستەی ئەو بەرجەستە بکات و خۆی سێبەر بێت، مەزنی ئەو ئاشکرا بکات و خۆی بچوك بێت[12]

سێکوچکەی ئایدۆلۆژیای حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست لەسەر سێ چەمك بنیات نراوە و کە بەسێ کوچکەی پیرۆز لە لای حیزبی بەعس ناسرابوو ئەوانیش (یەکێتی – الوحدة– ئازادی– الحریة– سۆسیالیزم– الاشتراكية)بوون ، هیچ کام لەو چەمکانە بە بێ دەلالەتی هزری بەکار نەهاتووە، ئەگەر بەتەواوەتی لە پێناسە و مەبەستی ئەم چەمکانە بگەین کە لەلای حیزبی بەعس بە چ مانا و بە چ لێکدانەوەیەك وەرگیراون ئەوا ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس نزیك دەبێتەوە لامان وەك ئایدۆلۆژیایەکی پێناسەکراو نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە هەڵکشان و داکشانی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس هاودەم بووە لە گەڵ مێژووەکەیدا، بە تایبەتی لە دەوڵەتی عێراقدا، ئەمەش بە پێی ئەو گۆڕانکاریانەی لە گۆڕە پانی حزبی بەعس و دەوڵەتی عێراقداو لە مەڕ ترسی لە دەسەڵات خستن و مسۆگەرکردنی ئایندەیان رویداوە.

سێکوچکەی ئایدۆلۆژی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، بە یەکێتی دەست پێدەکات ، یەکەم ئامانجی بەعس بریتییە لە مەسەلەی یەکێتی، هەر لە بنچینەی ئەم قەناعەتەوە ماددەی یەکی دەستووری پارتی بەعسی لە ساڵی ١٩٤٧ دارێژراوە و دەڵێ" حیزبی بەعسی عەرەبی حیزبیکی شۆرشگێرە، باوەڕی بە وەیە کە ئامانجە سەرەکییەکانی ژیانی نەتەوەی عەرەب و بنیادنانی سۆسیالیزم نایەتەدی گەر لە رێگەی شۆرش و خەباتەوە نەبێت، پشت بەستن بە پرۆسەی گەشەسەندنی خاو و ریفۆرمی پارچەیی و روکەشی ئەو ئامانجە بەرەو سەرنەکەوتن و ونبوون دەبەن[13]

بیری یەکگرتنی یەکێتی عەرەب لە چوار چێوەیەکدا کە نەتەوەی عەرەب سنوورەکەیەتی ئەو پەیامی نەمرم (ریسالة خالدة) یە کە حیزبی بەعس بانگەشەی بۆ دەکات، بیری ناسیۆنالیستانە و ناسیۆنالیستیەکی توندرەوی پان عەرەبیەو ئامانجی بە پیرۆزکردنی نەتەوەی عەرەبە بەرامبەر نەتەوەکانی تر، لە ئامانج و مەبەستی بزوتنەوەی بەعسدا هاتووە: کەمە نەتەوە عەرەبییەکان کەناتواندرێ لە کۆمەڵی عەرەبیدا بتوێندرێتەوە و بە شێوەیەکی تەواو بە عەرەب بکرێت، دەخرێتە ژێر یاسای تایبەتییەوە کە ئەرك و مافەکانیان بە شێوەیەکی وا دیاریدەکات نەتوانن زیان بە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی عەرەب بگەیەنن و هەر بە بێگانەش دادەندرێن، مافی دەوڵەتی عەرەبیشە کە

هـەرکاتی بیـەوێت ئەوانـەی زیـان بـە بەرژەوەندییـەکانیان دەگـەیێنێت دەریـان بکـات و دروستکردنی قوتابخانـەو دامەزرانـدنی رێکخـراو و دەرکردنـی رۆژنامـە بـە زمانەکـەیان و بانگەوازی نەتەوایەتیشیان لێ قەدەغە بکات[14]

یـەکی لـە دیـاردە سـەرەکیەکانی ناسـیۆنالیزمی نەتـەوەی سەردەسـت ئەوەیـە کـە ئایـدۆلۆژیای بندەسـتکردن لـە سـەردەمی شکسـتی سیاسـی و داتـەپینی ئـابووری و کۆمەڵایەتیدا دیتە ئاراوە ئەم ئایدۆلۆژیایە هەوڵ دەدات خۆی بکات بە چوار چێوەیەك بۆ لێکدانـەوە و رونکردنـەوەی هۆیـەکانی شکستی نەتـەوەیی و کێشانی وێنەیـەکی گشتی رابردووی نەتەوە وەکو پردێك بۆ پەرینەوە بۆ داهاتوویەکی پڕ لەبەختـەوەری و کامـەرانی کە دەبێ باری ناهـەمواری ئێستای نەتـەوە بپڕێتـەوە، ئـەم دیـدو بۆچـونە ناسیۆنالیزمیە هەوڵـدەدات دەسـەڵاتی بێسنوری زۆرینـەی نەتـەوەیی بسەپێنێ و کلتـور و زمـانی بکاتـە کلتـوری بـاو، ئـەم ئایدۆلۆژیایـە پێـی وایـە هـەموو ئەمانـە مـافی ئـەوەی دەدەنێنـێ ببـێ بەخاوەنی هەموو دەسەڵاتێك، یـەکێك لـە دیـاردە هـەرە زەقـەکانی ئـەم جۆرە ئایدۆلۆژیایـە دەسـتکاری کردنـی مێـژووە بـۆ شـەرعیەت دان بـە باڵادەسـتی خـۆی بـەوەی خـاوەنی پاشخانێکی مێژویی دورو درێژو پڕ لە شانازییە، حیزبی بەعسیش مێژووی کۆن و نوێی عێراقی سەرو بن کرد، لـەژێر دروشمـی( سـەرلەنوێ نوسـینەوەی مێـژوو)، ئـەم شـەرعیەت دانەی مێـژووەش ئایـدۆلۆژیا وێنـەیان بـۆ دەکێشـێ بـۆ سـەلماندنی باڵا دەسـتی نەتـەوەی سـەر دەسـت و مـافی دەسـتگرتن بەسـەر مـەودای جـوگرافی کەمینـە نەتـەوەکان و پاکانەکردن بۆ هەڵوێستی دڕندانە بەرامبەریان[14]

ئەم بیرە قوڵـە توندڕەوە ناسیۆنالیزمەی حیزبی بـەعس کـە داوای یـەك نەتـەوەو یـەك زمان و یەك پارت و یەك سەرکردە دەکات، هاوشێوەی بیری نـازی و ئـەڵمانی و بیری فاشی ئیتاڵیایە، پڕۆسەی بەیەك ڕەنگ کردنی کۆمەڵگای عێـراق، لەسـەر دەسـتی حیزبی بـەعس بۆ بەدەستهێنانی ئـەم بیری یەکێتیـەی عەرەبیـە کـە لەسـەرەتای دروست بـوونی حیزبی بەعسەوە بانگەشە و کاری بۆ دەکات، سەرەکیترین هۆکاریش بۆ ئەوەی ئـەم یەکێتیـەی بـە ئەنجام بگات توندوتیژی و تۆقاندن و تیرۆری فکری و جەستەیی و کلتورییـە، بـەعس بـە پشت بەستن و کۆمەکی ئایدیا و بانگەشەکەی شـەرعیەتی تـەواو بـەم توندوتیژیـە دەدات، ئـەوەی ئـەم توندوتیژیـەی حیزبـی بـەعس قـوڵتر دەکـات ئـەزموون وەرگـرتن و کۆمـەك

کردنیەتی لەو کۆمەڵە سیاسی و ئایدیایانەی ناوچەکە وەکو کارەکانی ئیمپریالیزم و دواتر فاشیزم و نازیزم و کەمالیزم ناسریزم.

یەکێکی تر لە رەهەندەکانی چەمکی یەکێتی لای حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست یەکێتی و ئاوێتە کردنی کۆمەڵ و سەرۆکە و کردنی سەرۆکیش بە ڕەمزی ئەو یەکێتییەی کۆمەڵگا،واتا تێکەڵکردن و بەیەکداکردنی سەرۆك و کۆمەڵگە، ئەمەش بۆئەوەی کە هەرکاتێك سەرۆك بڕیارێکی دا واتە کۆمەڵگە بڕیاری داوەو هەرکاتێکیش کەسێك یان گروپێك بەرهەڵستکاری سەرۆك یان حیزبەکەی سەرۆك بێت ئەوا دژی ئەو یەکێتیەیە و حیزب و سەرۆك بڕیاری چارەنوسی ئەدەن، ئەمەش لە یەکێك لە وتەکانی سەدام حسێن لەساڵی ١٩٧٩ کە تازە دەبێت بەسەرۆك کۆماری عێراق دەردەکەوێت و سەدام دەڵێت: نەمافی ئازادی، نەمافی دیموکراسی و تەنانەت مافی ژیانیش بۆ ئەوانە نییە، کە شوێنێکیان لەدەرەوەی خێمەی شۆڕش و بەهاکانیدا هەڵبژاردوە[16]

ئەم دیدی پۆلێنکردنەی حیزبی بەعس بۆ کەسانی ناو خێمەی شۆڕش، کەئەو کەسانەن بڕوایان بە یەکێتی نەتەوەی عەرەب و حیزبی بەعس هەیە و ئەوانەی دەرەوەی خێمە کە بڕوایان پیێ نیە، چەکیکی هەمیشە لەسەر پێیە بۆ ئەوانەی ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرامبەر سەرۆك و حیزب دەجوڵێن، بە تێکدەرانی ئەم بیری یەکێتیە ئەژمار دەکرێن و هەروەك و سەدام دەڵێت مافی ژیانیان لێدەسەندرێتەوە.

دووەم چەمکی سێکوچکەی ئایدۆلۆژیایی حیزبی بەعس ئازادییە، هەڵبەت ئازادی لای بەعس پێناسەو فۆرمی تایبەتی خۆی هەیە، ئازادی وەکو هەموو شتەکانی تر بەپرۆسەی دووبارە پێناسەکردنەوەدا تێپەڕیوە، حیزبی بەعس یەکێتی روحی سیاسی دەکات بەپرانسیپی یەکەم بۆ مەرجی بنچینەی ئازادی مرۆڤ، ئازادی نەتەوەیی دەبێت شان بەشانی رزگار کردن نیشتمان بڕۆن، دەبێت ئازادی تاك کەمبێتەوەو ملکەچی ئازادی نەتەوەو نیشتمانی بێت[17] ، ئەم ئازادییە کەحیزبی بەعس بانگەشەی بۆ دەکات ئازادی تاك نییە، بەڵکو ئازادی نەتەوەو نیشتمانە لە دەستی داگیرکەر و ئیمپڕالیزم، بەعس رووبەرێك بۆ ئازادی تاکە کەس ناهێڵێتەوە، دەیکاتە قوربانی ئازادی نەتەوەو هەستی نەتەوایەتی، هەروەکو مشیل ئەفلەق دەڵی" عەرەب دەبێت تەسك بێتەوە لەپێناو بەرژەوەندی گشتی، چونکە تاکەکەس ئەو کیانەیە بەتەواوەتی بەستراوەتەوە بەرۆحی نەتەوەوە[18]

سێهەم چەمکی سێکوچکە ئایدۆلۆژیای حزبی بەعس سۆسیالیزمە، ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس دەڵی: سۆسیالیزم پێویستیەکە کە لە ناخی ناسیۆنالیزمی عەرەبییەوە هەڵدەقوڵی.[19]

واتە پێویستی سۆسیالیزم وەك ڕەنگدانەوەی قوڵایی ناسیۆنالیزمی عەرەب لە ڕێگەی بە یەکداچوون ( پێکەوە لکاندن) یان بەهاوسەری پێکردن ناسسۆنالیزم و سۆسیالیزم پاساو دەکری.

ئەگەر ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە جەوهەردا ناسیۆنالیستێکی سۆشیالیستییە، سۆشیالیزمەکەشی ناتوانێت بێتە دی ئەگەر بە هاوکاری ناسیۆنالیزمی نەبێت[20]

تەواوی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس لەسەر مەسەلەی ناسیۆنالیزم بنیات نراوە و هەموو ئەو چەمکانەی تریش کە هەڵیگرتوون بۆ خزمەتی مەبەستە ڕاستەقینەکەی بە کاری هێناوە کە ناسیۆنالیزمی پان عەرەبییە، هەر ئەمەش وای کردووە کە ناسیۆنالیزمێکی توندڕەوی لێ بکەوێتەوەو ئەو کوشتارو تیرۆرکردانەی کە لە میژووی حیزبی بەعسدا هەیە دەرئەنجامێکی چاوەڕوانکراوی ئەم بیرە ناسیۆنالیستیەیە، بۆ سەلماندنی ئەم تێزانەی سەرەوە قسەیەکی مشیل ئەفلەقە کە دەڵی" لەبەرئەوەی نەتەوەی عەرەب پێگەی سەرجەم شارستانیەکان بووە، دەبێت لە مویژووی خۆی و بیری خۆی سۆسیالیزم دروست بکات نەوەك لە مارکسیزمی ڕۆژئاوایی [21] هەروەها دەڵی " سۆشیالیزم بەلای ئێمەوە لقە و ئەنجامی دۆخی نەتەوایەتی و پێداویستی نەتەوەییمانە، سۆشالیزم ناتوانێ ببێ بە فەلسەفەی یەکەم یان بە جێهانبینیەکی گشتگیری ژیان، سۆشیالیزم لقێکە لەسەرچاوەیەکی ڕەسەن دێتە کایەوە ئەم سەرچاوەیەش بریتییە لە بیری ناسیۆنالیزم [22]

حیزبی بەعس کاری حیزبایەتی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە سەر هیچ ئایدیا و فەلسەفەیەکی ئامادەو دەستکردی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ناکات بەڵکو ئایدیاکەی تەواو خۆماڵییە بە حیزبی بەعس.

دوای ئەو شیکردنەوە و پێناسانەی سەرەوە پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە، ئایە ئەم ئایدۆلۆژیا خۆماڵییەی حیزبی بەعس کە لێوان لێوە بە بیری ناسیۆنالیستێکی توند ڕەوی عەرەبی و داوای یەکگرتنی ڕوحی نەتەوەیی عەرەب دەکات ئەم حیزبەی بەچی ئاقاریکدا برد؟

هەڵبەت میژووی حیزبی بەعس پڕە لە تیرۆر و ویستی پاوانخوازی دەسەلات و رەتکردنەوەی هەر رەنگ و دەنگێکی تر جگە لە دەنگ و رەنگی حیزبی بەعس، ئەگەر سەرنجی کارەکانی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی بدەین ئەوا ئەم حیزبە چ وەکو حیزب و چ لە دەسەلاتدا کە دەسەلاتی عێراقی بۆ زیاتر لە ٣٠ ساڵ بە دەستەوە بوو، ئەوا دەسەلاتێکی تۆتالیتارە، هەروەها هەموو ئەو پێناسانە کە بۆ دەسەلاتی تۆتالیتاری دەکرێت بەسەر حیزبی بەعسدا جێبەجێ دەبێت، ئەمەش بە هۆی ئەو کردەوانەوەیەتی کە لەژێر کاریگەری دیدگا ئایدۆلۆژیاکەیدا ئەنجامی داوە.

لێرەوە دەچینەوە سەر پێناسەکانی تۆتالیتاریزم و بەریەککەوتن ولێکچواندنی لەگەڵ حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست.

فەرهەنگی فەرەنسی سۆسیۆلۆژیا بۆ پێناسە کردنی تۆتالیتاریزم دەگەرێتەوە سەر (zbiyniew brzezinyki) نوسەری بەناوبانگی کتێبی ( politiesideology and power in soviet) ئەو بەم شێوەیە لە تۆتالیتاریزم دەدوێت: فۆرمێکی نوێی حکومەتە کەدەکرێت لە نێو پۆلێنکردنی گشتی دیکتاتۆریەتدا بیبینینەوە، تۆتالیتاریزم ئەو سیستەمەیە کەلە ناوەویدا حاکمەکان تەواوی میکانیزمە تەکنەلۆژیا هەرە پێشکەوتووەکان بەکار دەهێنن بۆ ئەنجامدانی شۆڕشێکی کۆمەلایەتی کە توانای ئەوەی هەبێت دەستکاری شتەکان بکات، ئەم سیستەمە مرۆڤەکان لەسەر چەند بنەمایەکی ئایدۆلۆژیا دەبینێت و بەپێی دووری و نزیکایەتیان لەو ئایدۆلۆژیایەوە هەڵیان دەسەنگێنێت و بەرزیان دەکاتەوە دایان دەبەزێنێت، ئەم تێرمە یەکەمجار لە لایەن مۆسۆلۆنیەوە لە ساڵی ١٩٢٠ بەمانایەکی پۆزەتیڤانە بەکارهاتووە، مانا سەرەکیەکانی ئەم فکرەیە ڕووبەڕوویەکی ڕاستەوخۆبوون لەگەڵ ژیانی تایبەتی تاك گەرایدا، واتە ڕاکێشانی دەوڵەت بۆ هەموو پانتاییەکان، بە درێژای سالانی جەنگی سارد ئەم کۆنسێپتە ئاسۆکانی بەرفراوانتر دەبێت، دەبێت بەچەکی جەنگی نێوان دەوڵەتان، رایمۆند ئارۆن کە یەکێکە لەشارەزایانی زانستە کۆمەلایەتیەکان لە کتێبەکەی (دیموکراسی و تۆتالیتاریزم) پێنج ڕەگەزی سەرەکی رژێمی تۆتالیتار دیاری دەکات:

١-یەك حیزب مۆنۆپۆڵی چالاکی سیاسی دەکات.

٢-ئەو حیزبەش لەسەر ئایدۆلرژیایەك دروست بووەو ئەو ئایدۆلۆژیایەش دەبێت بەئایدۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەت.

٣-ئەو حیزب و ئایدۆلۆژیایەش بەتەنها مۆنۆپۆلی زەبرو زەنگ و قەناعەت پێکردن دەکەن.

٤-دەوڵەت دەست دەگرێت بەسەر بەشێکی زۆری چالاکیە ئابوری و پیشەییەکاندا و ئەو چالاکیانە ئیتر حەقیقەتی ڕەسمی دەوڵەتن.

٥-لێرەوە هەر هەڵەیەکی ئابوری یان پیشەی دەبێت بە هەڵەیەکی ئایدۆلۆژی و خاوانەکەی لەسەر سزا دەدرێت[23]

ڕژێمی تۆتالیتار تەنها بەوەوە ناوەستێ کە ئایدۆلۆژیایەکی تایبەت بەدەسەلاتی سیاسی دابڕێژرێت، بەڵکو ئایدۆلۆژی خۆی بەسەر یەکەیەکی ڕەعیەتدا دەسەپێنێت و بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ کشانەوە، واتە ڕژێمی تۆتالیتار لەبابەتی ڕژێمی دیکتاتۆرە تەقلیدیەکان نیە کە ئاسایشی هاولاتیان دەستەبەر دەکات بەرامبەر بێدەنگ بونیان و کشانەوەیان لەکاری سیاسی، لەسایەی ئەو ڕژێمەدا دەبێ هەموان بانگەشە بۆ ئایدۆلۆژیای دەسەلات بکەن بەو جۆرەی کە بۆیان دیاری دەکرێت نەك بەو جۆرەی هەڵی دەبژێرن.[24]

ئەم سیستەمە تۆتالیتارانە هەوڵدەدەن بەڕێگاو یارمەتی ئایدۆلۆژیەتێك، تەئسیر لە ژێر دەستەکانیان بکەن، کە یەك بگرنەوە لەگەڵ ئایدۆلۆژیەتی ئەو پارت و لایەنانە و بەم شێوەیە دەتوانن شەرعیەت بدەن بە فەرمان ڕەوایەتیەکەیان[25]

تۆتالیتاریزم لەڕوی ئایدۆلۆژی و ئۆرگانی دیسپلین و چاودێری کردن و بەکارهێنانی توندو تیژی و پڕو پاگەندەو فشاری سایکۆلۆژی و بەرهەم هێنانی ڕق بەئاسای کردنی توڕەیی و بەجوامێری کردنی جەنگ و بەکارهێنانی بێ متمانەی، خۆی لە فۆڕمەکانی بەر لەخۆی جیادەکاتەوە، لەهەمو ئەو ئاستانەدا لەوان پەرگیرترو وێرانکەر ترە[26]

حیزبی بەعسیش بە پشت بەستن بە ئایدۆلۆژیە توندڕەوە ڕەگەز پەرستیەکەی و بە سود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیاکانی سەردەم بە تەواوەتی جڵەوی دەسەلات دەگرێتە دەست و دیسپلینی کۆمەڵگا دەکات و چەندین کاری تیرۆرو تۆقاندن دەکات، چەندەها جەنگ هەڵدەگیرسێنێت، هەر لە داگیرکردنی کوێت و جەنگی هەشت ساڵەی ئێران-عێراقەوە تاشەڕەکانی بەرامبەر بە بزوتنەوەکانی ناوخۆی عێراق و کاری جینۆساید بەرامبەر بە کورد و بە شیعەکان و ئەنفال و کیمیا بارانکردنی هەڵەبجە و سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی شەعبیانەو ڕەشە کوژیەکان لە ڕاپەڕینی کوردانا و تەعریب و تەعبیس و ڕاگواستن،

هـەروەها دروسـتکردنی دەیـان بەندینخانـەی ترسـناك و چـەندان دەسـتگای هـەواڵگری و ملیۆنان سەربازو سەدان جۆرە چەکی جەنگی دەبێتە بەشێك لە کارەکانی ئەم حیزبە، کە هەموو ئەمانەش دەچنە چوارچێوەی ئەو پێناسانەی سەرەوە بۆ تۆتالیتار.

هەروەك چۆن ڕژێمی تۆتالیتار بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ ژیانی تایبەتی مرۆڤ، بەهەمان شێوە بوارێکیش ناهێڵتەوە بۆ کشانەوە لەو بڕیارەی کە مرۆڤ دەبێت یان بکوژ بێت یان کوژراو، یان جەلاد بێت یان قوربانی، لەچوارچێوەی دەوڵەتدا مرۆڤ یان دەبێت لە ڕیزی شۆڕش و دەسەڵاتدا بێت بەجۆرێك لەجۆرەکان بەشداری لە قەتڵ و عامدا بکات، پاساوی بۆ بهێنێتەوە، یان دەبێ لە ڕیزی دوژمنان بێت و بە مەرگ سزا بدرێت یان لە چاوەڕوانی مەرگدا بێت[27]، ئەم هەڵوێستی ڕژێمی تۆتالیتارانە کە مرۆڤ دەبێت یان لە شۆڕشدا بێت یان لەدەرەوەی شۆڕش و بە مەرگ مەحکوم بکرێت، لەوتارەکەی ساڵی ١٩٧٩ ی سەدام حسێندا بە زەقی دەبینرێ (نەمافی ئازادی و نەمافی دیموکراسی و تەنانەت ژیانیش بۆ ئەوانە نییە کە شوێنێکیان لەدەرەوەی خێمەی شۆڕش و هێماکانیدا هەڵبژاردووە)، حیزبی بەعس لەو کاتەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە ئێراقدا گرتووەتە دەست هەمیشە وا خۆی بەیان کردووە کە دوژمنان دەیانەوێت بی ڕوخێنن، زۆر لە دەوڵەتە ئیقلیمی و جیهانیەکان هەڕەشە لە یەکپارچەی نەتەوەی عەرەب و خاکی عێراق دەکەن و ئەمیش بەرامبەریان دەوەستێتەوە، هانا ئارێنت سەبارەت بەم شێوەی هەردەم دوژمن دروستکردنەی رژێمە تۆتالیتارەکان بۆ شەرعیەت بەخۆ دان دەڵێ: هەر کە فەرمانڕەوایەتی تۆتالیتاری لە وڵاتێکدا دەسەڵات دەگرنە دەست، بە دڵنیاییەوە ڕای دەگەیەنن کە وڵاتەکەیان بووە بە نێوەندی بزوتنەوەیەکی کاتی و قۆناغێك لە قۆناغەکانی داگیرکردنی جیهان دەستی پێکردووە، شکست و پیرۆزی بە پێی سەدە و هەزاران ساڵ هەڵدەسەنگێنێت و بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە بەرژەوەندییە جیهانیەکان هەمیشە لەسەروی بەرژەوەندییە ناوچەییەکانە[28].

بەبڕوای هانا ئارێنت یەکێکی تر لە پایەکانی دەسەڵاتی تۆتالیتار دەزگای پۆلیس و پۆلیسی نهێنیە، بۆمانەوەی ئەم دەسەڵاتە و دەڵێت: ئەرکی پۆلیسی تۆتالیتار ئاشکرا کردنی تاوان نییە بەڵکو دەبێت هەرکاتێك حوکمەت بڕیاری دا توێژێك لە دانیشتوان دەستگیر بکات، ئەم ئامادە دەبێت خزمەت بکات[29]

حیزبی بەعسیش چەندان دەزگای پۆلیس و پۆلیسی نهێنی هەبوو لەوانە:

١-بەڕێوەبەرایەتی گشتی سیخوڕی سەربازی (الاستخبارات العسكرية)

٢-بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەواڵگری شارستانی (المخابرات المدنية)

٣-بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاسایش (مديرية الامن العام)

٤-دەزگای ئاسایشی تایبەت (الامن الخاص) [30]

لەبیرو بۆچونەکان مشێل ئەفلەقی دامەزرێنەری حیزبی بەعسەوە بگرە تا دەگاتە گەشتنی ئەم حیزبە بە دەسەڵات و مومارەسەکردنی دەسەڵات ئەوا لەسەر ڕاستە هێڵێکی وا کاری کردووە کە تواناو هێزی لە سیحری ئایدەلۆژیاکەیەوە وەرگرتووە، ئەمەش حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی والێکرد بەرە و ڕژێمێکی تۆتالیتار و بەرە و دواڕۆژێکی شەرمەزار ببات، شەرمەزار بۆ سەرکردەکانی و شەرمەزار بۆ ئایدۆلۆژیاکەی، هەروەها ئەم بیروباوەڕە عێراقی بەرەو گەورەترین کارەساتەکانی خۆی برد و کردی بە کۆمەڵگایەکی تەواو توندوتیژ و عەسکەرتار کە ئەمەش کاریگەری لەسەر تاکەکانی ئەم دەوڵەتە جێهێلا، هەروەها زۆری نەمابوو ئەم دەوڵەتە ببێت بە گۆڕەپانێکی گەورەی عەسکەری و تەواوی دانیشتوانەکەی ببێت بە عەسکەر.

ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٧٤ زۆر ڕاستەوخۆ بەڕونی دەریدەخات کە لەماوەی پێنج ساڵدا حوکمەتی بەعس توانی( ژێرخانی حیزب فراوان بکاو لە ڕێگەی پێشەنگی هێزی و بەهاوکاری ئەفسەر و سەربازی نیشتمانی کە توانی ببێ بەدەستو چاوی شۆرشەکە کە چاودێری وڵاتو سەرکەوتنەکانی گەل دەکەن.

جگە لە بەعساندنی هێزی سوپا رژێمی عێراقی هەوڵی دا ژمارەی سوپا زیاد بکات، لەنێوان ساڵی ١٩٦٨- ١٩٧٨ واتا لەماوەی دەساڵدا هێزی سوپا فراوانونێکی بێ پێشینەیی بە خۆیەوە دەبینێ، کاتێك لە نێوان ساڵی ١٩٦٨ – ١٩٧٣ ژمارەی هێزی سوپا لە ٨٠٠٠٠ وە بو بە ١٠٠ هەزار لە ١٩٧٨ گەیشتە ٢٣٠ هەزار ، واتە نزیکەی سێ جار زیاتر لەساڵی ١٩٦٨ هەروەها لە سەرەتا جەنگی ئێران عێراق ژمارەی هێزی سوپا گەیشتە ٢٤٢ هەزار لە کاتی جەنگدا و لە ساڵی ١٩٨٤ گەیشتە ٦٠٧ هەزار و لە ساڵی ١٩٩٠ گەیشتە یەك ملیۆن[31]

بەعس جۆرە ئۆتمۆسفیرێکی کۆمەڵایەتی و ئابووریو سیاسی وای بۆ کۆمەڵگای عێراق دروست کردووە کەمرۆڤ تیایدا، مەگەر زۆر خۆ راگر بێت ئەگەر نا هەموو سیفاتو

سروشتێکی بەربەریەت و شەرانگێزو خوڕەوشتە نا مەدەنی و نائەقلانی و دێرینەکانی تێدا زیندوو دەبێتەوە، ئەو کلتوورەی کە بەعس ویستی بیسەپێنێت، ئەو کلتووری شەرانگێزی پەلاماردانەیە، کلتووری وەحشی گەری، کە لە هەموو ساتەکانیشدا هەوڵی داوە بەپێی سودو مەرامەکانی خۆی بیبزوێنێت ئەمەش کاتێك پڕ مەترسیتر دەبێت کە بەپاڵپشتی مەرامێکی پیرۆز رەوایەتی پێ دەبەخشرێت، دروستبوونی ئەم ئۆتۆمۆسفیرە هەم دەرەنجام و هەم بزوێنەری پرۆسەی زاڵبوون و سەپاندنی تەواوەتی دەسەڵاتە بەسەر کۆمەڵگای عێراقدا[32]

**تێڕوانینی حیزبی بەعس بەرامبەر بە خێزان:**

بەعس دەیەوێت هەموو جیهان بکاتە ئاوێنەیەکی گەورە، ئاوێنەیەك کە جگە لە وێنەی خۆی هیچ وێنەیەکی دیکەی لەسەر نەبێت، ئەو دەیەوێت بگاتە هەموو جێگاکان، بگاتە ناو هەموو ژیانەکان و سنووری هەموو جوگرافیاکان ببەزێنێت، ئەو شەیدای بوون و ئامادەگی خۆیەتی هەموو پێشهات و کارەساتەکانیش دەخاتە خزمەتی ئەو شەیداییە، ئەو دەیەوێت بخزیتە نێو هەموو جێگاکان بگاتە کەلەبەرە چوك و رووبەرە گەورەکان ببێت بە بەشێك لە حیکایەتە وردەکان و سەربوردە گەورەکانیش، ببێتە رەگەزێکی گرنگی پێکهاتی سیاسیانەی جیهان و بشبێتە بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤە بچوك و پەراویزخراوەکان، دەیەوێت لەیەك کاتدا وێنەی لەسەر پەرەی هەموو شاشەکانی جیهان و لەسەر هەموو دیوارە روخاوەکانی جیهان هەبێت[33].

تێڕوانینی ئایدۆلیژیای حیزبی بەعس بەرامبەر بەخیزان لە دیسپلینکردن و ملکەچ پێکردنی کۆمەڵگاوەیە، لەو شێوە دەسەلاتەوەیە کە ئەم دەیەوێت. بەعس خێزان بە کەناڵێکی گرنگ دەزانێت بۆ بنیادنانی پایەکانی دەسەلاتی و زاڵبوونی بەسەر تەواوی کۆمەڵگای عێراقیدا هەر لەم رووەوە بە گەلێگ شێواز چووە ناو چوارچێوە خێزانییەکانەوەو لە وێوە بە کۆنترۆڵکردنی خێزان خۆی و زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگادا سەری دەرهێنایەوە.

بەعس لە رێگەی هەڵمەتێکەوە کە پێی دەگوت هەڵمەتی رێکخستنەوەی کۆمەڵگە کە روی دیار و دەرەوەی ئەو هەڵمەتەش بریتیی بوو لە خۆ ئامادەکردن بۆ سەر ژمێری دانیشتوانی ساڵی ١٩٨٧ و لە گەڵ هەڵمەتەکەشدا یاسای نیشتەجێبوون و چونیەتی جێبەجێکردنی دەرچوو، یاساکەش ئەوەی تێدا هاتووە کە پێویستە بنکەکانی پۆلیس لە

هەر گۆڕانکارییەکی ناو خێزان وەك مردن و لەدایك بوون و گۆڕینی كارو كاسبی یان شوێنی نیشتەجێبوون و هەروەها هەرمیوانیك كە مانەوەی لە مانگێك زیاتر بێت ئاگادار بكرێتەوە، ئەم یاسایەش بە تەواویەتی لە یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو وەرگیراوە لە میانەی ئەم هەڵمەتەدا تەواوی رێكخراوە حیزبی و میلیشیەکان و هەروەها دەزگاكانی ئەمن ئەنكێتیان بەسەر هاوڵاتیان دابەش دەكرد و هەرخۆشیان راستەوخۆسەرپەرشتی پركردنەوەیان دەكرد، چەند پرسیارێكی ئەم ئەنكێتانە بە كارو باری گوزەران و مەزەندەی خەڵكیان بۆ ئەوە دەبرد كە مەبەست لەم هەڵمەتە چاككردنی باری گوزەرانی خەڵكە كەچی رێژەی لەسەدا حەفتای پرسیارەكانی دەربارەی دیدو بۆچوون و رابردووی سیاسی هاوڵاتی بوو، هەروەها دەربارەی بۆچوون و رابردووی خزمە نزیكەكانیش چەندین پرسیاری تێدا بوو، هەر لە هەمان كاتیشدا لە ناو خودی ئەنكێتەكەدا چەندین تێبینی هەرەشە كاری بۆ ئەوانە هەبوو كەزانیارییەكان دوا دەخەن یان بەراستی نایدەن و دەیشارنەوە، هەر شەش مانگ جارێكیش ئەم كارە دووبارە دەبووەوە[34]

حیزبی بەعس خێزان بێبەشە دەكات لە ئازادی رەفتار و هەڵس و كەوتی رۆژانەو دووری دەخاتەوە لەسەربەخۆیی بۆ چارەسەركردنی كێشە لە نێوان ئەندامانی خێزانداو پێچەوانەی ئەو پرەنسیپە گەردوونیە كار دەكات كە خێزان دادەنێت بە كیانێكی كۆمەڵایەتی سەر بەخۆو دوور لە هەموو دەست تێوەردانێكی سیاسی و ئایدۆلۆژی.

بەلای تۆتالیتاریزمی بەعسی ئێراقەوە خێزان كۆمەڵێكی سروشتی نییە كە سەرچاوە دەگرێ لە چەمكی ئازادی، بەڵكو كیانیكە دەبێت بوەستێتەوە سەر ئەو پەیوەندییە سیاسیانەی كە ئەندامان ئاراستەی دەكەن بەرەو ئامانجێك كە بەتەواوی بگونجێت لەگەڵ نەریتی شۆرشگێرانە رەفتار و هەڵس و كەوتی ئەندامانی خێزان دەبێت لە خزمەتی ئایدۆلۆژیای بەعسدابن، پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان دەبێت رێك بخرێت لەسەر بنچینەی هەستو سۆزو ئاراستەی نوێی حیزبی بەعسو سەرۆكەكەی [35]

پێش ئەوەی حیزبی بەعس دەسەڵات بگریتە دەست و خێزان بكات بە ئامانج بۆ برەودان بە ئایدۆلۆژیاكەی وفراونبوونی دەسەڵاتەكەی، پەیوەندیە خێزانیەكان و پەیوەندی دەرهاوسێیەتی و خزم و كەس و كار لە كۆمەڵگەیەكی تەقلیدی وەكو كۆمەڵگای عێراقدا لە ئاستێكی تەندروست و بەرز دابوون، هەروەها رێزی خۆشەویستی ئەندامانی خێزان لە ناویەكدا لە ئاستێكی باڵادا بوون ، بەڵام هاتنی حیزبی بەعس و دەستێوەردانەكانی بۆناو چوارچێوە خێزانییەكان ئەم پەیوەندیانە تێكچوو.

تۆتالیتـاریزمی حیزبی بـەعس منـداڵی دا بەگـژ دایـكو بـاوكو خوشـكو بـراو دەرهاوسێیو کەسو کار [36] هـەروەها بەپێچەوانەشەوە باوکی کرد بەجەلادی کوڕەکەی خۆی.

سەدام لە میانی سەردانێکی بۆ گوندی (البوکریدە)ی ناو زەلکاوەکان، لای (عـەناد)ی جوتیار میوان بوو، ئەم ڕێز لێنانە هۆکاری خۆی هـەبوو هـەروەکو بە تەلـەفیزیۆنی رای گەیاند، باوکەکە (عەناد) سکاڵانامەیەکی بۆ دەسـەڵات داران و لـە پێشەوەی هەمووشیان بۆ سـەدام نووسـیبوو، لـەم سـکاڵانامەدا داوای کردبـوو یـەکێ لـە کورەکـانی گولـە بـاران بکرێت، لەبەر ئەوەی تاکە کوڕیەتی لەنێو کوڕەکانی تریدا گۆڕەپانی جەنگی جێهیشتووە و لـە خزمـەتی سـەربازیدا رای کـردووە، چیرۆکی ئـەم باوکـە بـە بڕیـاری سـەدام کـرا بـە فیلیمێکی سینەمای.

لـەمانگی شـوباتیش ڕۆژنامـەی (الثـورة) لاپەڕەیـەکی وێنـەداری بـۆ پێشوازی کردنـی کابرایـەکی پەککـەوتوی تەمـەن ٧٧ سـاڵی بـەناوی (هاشـم محمـد علـی حسین) تـەرخان کردبـوو کـە سـەدام پێشوازی کردبـوو و بـەرزترین نیـشانەی دەوڵـەتی پێـوە کردبـوو، هـەروەها لەگـەڵ ئـەم نیشانەدا پارەیـەکی زۆر و دوو خـانوو و ئوتـومبیلێکی لێمـۆزین و دەمانـچەیەکی وەك پاداشـت پـێ بەخـشی، چیرۆکی ئـەم پیـاوە پـیرەش ئـەوە بـوو کـە بەدەستی خۆی و بە دەمانچەکەی کوڕەکەی خۆی کوشتبوو، لەبەرئـەوەی لە یـەکێك لـە مۆڵەتەکانـدا نەچـووەتەوە بـەرەی جـەنگ[37] ئـەم دوونمونەیـەی سـەرەوە مـشتێکن لەخەرواری کاریگەری ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس بەرامبەر بە خێزان و لادانـی ئەنـدامانی خێـزان، هـەروەها حیزبـی بـەعس لەهـەمان کاتـدا لەهـەوڵی ئـەوەدابوو دەسـەڵاتی منـداڵ بخاتە سەروی دەسەڵاتی باوك لەخێزانداو فێری ئەکردن بەرەنگاری دایكو باوك ببنـەوە، شکاتیان لێبکات کاتێك لەگەڵ بیرو ڕای حیزب نەبوو یاخود دژ بەحیزب دەبوو.

بەلای بەعسەوە نابێت یەکێتی خێزان بوەستێتە سەر بنچینەی تێڕوانینـی دواکـەوتن بـەڵکو دەبێـت سەرچـاوە بگـرێو پتـەو بێـت لەسـەر بنـچینەی گونجـان لەگـەڵ ئاڕاسـتەی ناوەندی سیاسەت و شۆڕش، وەهەرکاتێك یەکێتیـەکی خێـزان دژاو دژ وەستایەوە لەگـەڵ ئەم ئاڕستەیەدا ئـەوا ئـەم دژاو دژە چارەسـەردەکرێ لەبەرژەوەندی ئاڕاسـتەی بیری نوێی شۆڕش[38]

بـۆ ئاڕاسـتەکردنی ئەنـدامانی خێـزان و خێـزان باشـترین هۆکـار منداڵـەکانی نێـو ئـەو خێزانەیـە، حیزبـی بـەعس دەیویـست لەڕێگـەی ئـەم منداڵانـەوە کـۆنترۆڵی تـەواوی خێـزان

بکات، ئەو ئەیویست منداڵ بکات بەناوەندی ڕوناکی لەناو خێزاندا وە حیزب خۆی فێری شێوەی هەڵسوکەوت و ڕێزیان بکات کە پابەند بن بە چەمکەکانی شۆڕشەوە، چونکە کاتێك منداڵ لە خوێندنگە پەروەردە دەکرێ، ئەو لەوێ فێردەبێ لە خێزانەکەیدا شێوازی نوێ بخوڵقێنێ لەسەر بنچینەی ئایدیاو کاری حیزبی بەعس.

بەلای سەدام حسێن و بەعسەوە گواستنەوەی بەهاکانی شۆڕشی بەعس، لەڕێگەی منداڵ و گەنجەوە بۆ خێزان دەبوایە ڕێگەی بگرتایە لەڕەنگدانەوەکانی نەریتی کۆن لەناو خێزاندا، هەروەك سەدام دەڵێت (بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەین بەدایك و باوك دواکەوتن بسەپێنن بەسەر خێزاندا، پێویستە وا بکەین کە منداڵ لەماڵەوە بدرەوشێتەوەو لە پێناو دەرکردنی ئەم دواکەوتنە، چونکە هەندێك دایك و باوك لەدەستمان دەرچوون لەبەر چەندین هۆکار، بەڵام منداڵانی بچوك هێشتا لەدەستمان دەرنەچون، پێویستە بیکەین بەناوەندی ڕوناکی، لەپێناو گۆڕینی بارودۆخێکی باشترو دوری بخەینەوە لەشتی خراپ[39]

بەعس بۆئەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگە بکات کۆنترۆڵی خێزانی کرد، بۆ ئەوەی پەروەردەی خێزان وئەندامانی خێزان بکا، کۆنترۆڵی پەروەردەو قوتابخانەکانی کرد، چونکە بە بڕوای بەعس ئەم ناوەندی پەروەردانە باشترین ناوەندن بۆ ئاڕاستەکردنی منداڵ و جیلی نوێ.

ناسیۆنالیزمە تۆتالیتارەکان بەشێکی زۆری وزەی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ گۆڕینی خوێندنگەو دەزگا پەروەردەییەکان و کردنیان بەناوەندی پڕوپاگەندە لە بەرژەوەندی ڕۆحی ناسیۆنالیزم، سروشتی خوێندنگە دەگۆڕن و تێکی دەدەن، چونکە وەزیفەی سروشتی گەشەسەندنی توانا رۆشنبیرییەکانی خوێندکاران و نەقڵکردنی زانست بە ئاراستەیەکی ئایدۆلۆژی گشتگیردا دەبەن، بەم شێوەیە ئامانجی سیستەمی خوێندنگەیشیان بریتی نابێت لەپەروەردەکردنی هاوڵاتیان بەواتا تەکنیکی و گەردوونییەکەی، بەڵکو پێك دێت لە هەوڵدان بۆ شێوەی بیرکردنەوەی تۆتالیتار، ئەرکی مامۆستاو پسپۆڕی پەروەردەیی دەبێتبە گوێزانەوەی جۆشی باوەڕ بۆ ناو حیزب کە سەرچاوە دەگرێت لە شانازی ناسیۆنال و رۆحی شەڕو ئێتیکی سەربازی، سەرجەم بزوتنەوە رژێمە تۆتالیتارەکان ئەم تێڕوانین و هەڵویستەیان هەیە، کاتێك کە خوێندنگا دا دەنێن بەڕێگای تایبەتی و لە پێناوی پتەوکردنی رۆحی منالان و گەنجان، ئەمانە بنچینەی پەروەردەییان بە ئاڕاستەی ئامانجە ئایدۆلۆژی وسیاسیەکانی حیزب دەبەن[40]

**تێڕوانینی حیزبی بەعس بەرامبەر بە کورد:**

(ئێمە داوامان لێ کردوون هەموو ئەو کوردانەی لەوی دەژین بیان نێرن بۆ چیاکان بۆ ئەوەی وەك بزن بژین، داکیان بگێن، بۆچی خۆتان چەنجاڵ و شپرزە کردووە بەمانەوە ؟ ..... دەتانەوێ دانیشتوانی عەرەب بەم خەڵکە خوێری و هیچ و پوچانەوە زیاد بکەن).

(**عەلی حەسەن مەجید لە کۆبوونەوەی لەگەڵ لێپرسراوانی موسڵدا لە یەکی ئابی ١٩٨٨** [41])

( دەبێت کورد هەموو خاکی عێراق ژێرەو ژوور بکات ئەوجا بە جل و بەرگ و جامانە و پشتوێن و جلی ژنەکاندا ئێسك و پروسکەکان دەناسینەوە).

(**فەرج محەمەد عەزیز، رزگاربوو لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی ئەنفال**[42])

کوردستان خاکی گوڵاڵەی بەهارو کێڵگەی گەنمی بەشەپۆلە، خاکی جۆگەلەی بە خوڕو دەر و شیوی هەزار بەهەزاری پڕ مەترسییە، خاکی ئەشکەوتی نهێنی و گاشە بەردی روتەنە، لەسەرووی هەمووشیانەوە خاکێکە ئاوازی ژیانی تێدایەو پێناسە دەکرێت کە پەیوەندییەکی پتەو هەیە لە نێوان دانیشتوانی و چیاکاندا، چیا یەك لە دوای یەك ریزبوون و ترۆپکەکانیان تا چاو بڕ کات هەڵکشاون و هەرە بەرزەکانیان بە درێژایی وەرزەکانی ساڵ بەفر دایپۆشیون، هەر لە کۆنیشەوە وتراوە( چیاکان تەخت کەن کوردەکان لە یەك رۆژدا نامێنن)

کورد لەم چیایانەدا هەزاران ساڵە نیشتە جێن، وەك توێژەرێك دەڵێت ئەم ناوچانە لە سەدەی دوانزەهەمەوە بە کوردستان ناسراون، هەروەها لە چاخە دێرینەکانەوە مرۆڤیان تێدا ژیاوەو یەکێك نشینگە گرینگەکانی شارستانیەتی مرۆڤ پێك دەهێنن[43]

لەدوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو دابەشکردنی میراتی ئەم ئیمپراتۆریەتە بەسەر دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی جەنگی جیهانی یەکەمداو بەپێی پەیمانی لۆزان لە ٢/٧/ ١٩٢٣ ئیمزا کرا کوردستانیان بەسەر ئێرانو عێراقو تورکیا دابەش کرد.

کورد له عێراق به ویست و ئارەزووی خۆی لەگەڵ عەرەب و کەمە نەتەوییەکانی دیدا دەوڵەتی ئێراقسان پێك نەهێاوە، کورد نە هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتی ئێراقی داوە و نە لە دروستکردنی دەوڵەتی ئێراقدا قازانجی کردووە، بۆیە بە پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب لە عێراقدا لە سەرەتاوە تاك و ئێستا پڕبووە لە شەر و ئاژاوەو خوێنرشتن[44]

هەر لەو کودەتایەی کەیەکەمین سیستەمی کۆماری روخاند و یەکەمین کۆماری بەعسی و نەتەوە خوازەکانی لە شوباتی ١٩٦٣ دا هێنایە ئاراوە بارودۆخ لە ئێراقدا بەرە و ئاراستەیەك رۆیشت و رەگەزپەرستی پاکتاوکردنی نەژادی لە دژی گەلی کورد ناسرا[45].

تێروانینی بەعس بۆ کورد ئەوەیە کە کوردیش وەکو هەموو کەمە نەتەوایەتیەکانی ولاتانی عەرەب، لە قۆناغێکی مێژوودا لەسەر خاکی عەرەب گیرساونەتەوە، هەر تاقمێك یان نەتەوەیەك کە کەلەگەڵ حیزبی بەعس نەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەوا لە دیدی بەعسەوە بە دوژمنی ئاو وخاك و نەتەوەی عەرەب لە قەڵەم دەدرێت.

کاتێك بەعس و سەدام حوسێن دەسەلاتی رەها دەگرنە دەست گەورەترین خەونی ئەم پارتە تا سەر ئێسقان ناسیۆنالیست و راسیستییە کۆمەڵگایەکی پیوو( خالص) ی عەرەبی ئیسلامییە، کە شوناسێکی زۆر ئاشکرای هەبێت و پاشانیش نیشتمانێکی عەرەبی یەکگرتوو کە سەدام سەرکردەی بێت، زۆر بە سادەیی یەکێك لەو هەنگاوانەی بۆ گەیشتن بەم مەبەستە پێویستە لابردنی ئەو کۆسپەیە لە رێگەی خۆیدا کە (کورد)ە، ئەو مۆتەکەیەی سەدان ساڵەبەسەر سنگی ناسیۆنالیستی عەرەب و فارس وتورکەکانەوەیە، ئاواتی بەعسیش هەمیشە ئەوە بووە کە عێراق ولاتێکی عەرەبی ئیسلامی و خاوەن مۆرك و شوناسی تایبەتی خۆی بێت، ئەمەش کاتێك بەعس سەیری هەموو ئەزمونەکانی پێش خۆی دەکات، چ لە عێراق و چ لە ئێران و چ لە سوریا چ لە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو، تەنهاو تەنها لەناوبردن و دورخستنەوەی مەترسی کوردە، بەشێوەیەك لە شێوەکان، جا ئاخۆ لە رێگەی لەناوبردن و کولتورو زمانیەوە، یان پەرش و بلاپێکردنی، یان دورخستنەوەی بێت[46]

لە روانگەی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسەوە، بەعس لە شۆرشێکی بێپسانەوەدایە و دەبێ بەر لەهەر شتێ ئیمپریالیست و زایۆنیستەکان لە خاکی عەرەب دەربکات، وە پێی وایە هەموو ئەوانەی لەناو خاکی عەرەبدا دەژین، دەبێت پشتگیری و بەشداری شۆرش

بکەن، ئەوەی بەشدای و پشتگیری شۆڕش و بەعس نەکات، ئەوا ئەوانە بەخەڵکانی دژ بە شۆڕش و ناپاك دەناسرێن، تێڕوانینی حیزبی بەعس بەرامبەر بە کورد ئەوەیە کە لەمپەرن لەبەردەم بانگەوازەکەیدا و دەبێت لەناو ببرێت، بۆ نمونە هەر لەگەڵ وەرگرتنی دەسەلاتی بەعسیەکان کورد قڕان دەستی پێکرد، وەك ئەو تالان و کوشتارەی ١٣ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ کە لە ناوچەی کەندێناوا کردیان، لە ئەنجامدا چەندین گوندیان بە مزگەوت و قوتابخانەوە سوتاند، وە چەندین کەسی بێتاوانیشیان کوشت و ئەشکەنجە دران، ماڵ و سامانیشیان بە تالان برد، لە کۆی (٧٢) گوند (٣٢) گوندیان سوتان و تالان کرد لە ناوچەی دوبزیش (٢١) گوندیان ڕوخاندو (١٥٠٠) خێزانیش بێسەرو شوێن کران هەمووئەم تاوانانە لە لایەن تواناکانی حیزبی بەعس کە (حرس القوم ) یان پێ دەوتن ئەنجام دەدران و ماڵ و سامان و مەڕ و مالاتی کوردستانیان بە تالانە برد وە لە ١٩٦٣/٧/١٠ نزیکەی ٤٠ هەزار کوردی شاری کەرکوك دەربەدەر کران ، دانیشتوانی گوندەکانی ئەو ناوچانە راگوێزران و عەرەبی خێڵەکیان لە جێگایان نیشتەجی کرد، ماڵە کوردەکان بە بلدۆزەر تەخت کران و خوێندن و نوسین بە کوردی قەدەغە کرا، کەوتنە بە عەرەبکردنی ناوە کوردییەکان بە تالانبردنی سەروەت و سامان و باخ و سوتاندنی بیستانی خەڵکەکە لە ئەنجامی هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر کوردستان لە ١٩٦٣/٦/١١ وە تا ٧/٢٣/ ١٩٦٣ سەرجەم ٨٧٥ گوند وێران کرا. هەروەك لە راپۆرتی ژمارە ٢٤ ی کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی لە لەندەن هاتووە کە رژێمی ئێراق لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٠–١٩٧٠ چوار هەزار ماڵی کوردی لە ٧٠٠ گوند وێران کردووە و ٣٠٠ هەزار کەسیش ئاوارە بوونەو ٦٠٠ هەزاریش شەهیدو بریندار بوون[47]

چ ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس و چ سەرکردەکانی ئەو حیزبە بەرامبەر بە کورد یەك وتارمان پێ دەڵێن ئەویش ( نکۆڵی کردنی لە بوونی نەتەوەیەك کە تەواوی پێداویستییەکانی سەلماندنی نەتەوی سەربەخۆیی تێدایەو کارکردن بۆ قڕکردنی ئەو نەتەوەیە، ئەوەتا مشێل ئەفلەق تیۆریزەکەرو دامەزرێنەری حیزبی بەعسی عەرەبی شۆسیالیس تێڕوانینی بەرامبەر بەکورد ئەوەیە کە پێویستە لەناو ببرێت و دەڵێت: کورد لە عێراق و سوریا، بەربەر لە رۆژئاوای نیشتمانی عەرەب(جەزائیر) کۆسپن، بۆ ئەوەی یەکیەتی نیشتمانی عەرەب دروست ببێت پێوو ویستە لەناوببرێن[48] هەروەها تالیب شەبیبە کە رابەرێکی گەورەی حیزبی بەعس بوو دەڵێ " ئەستەمە هەڵوێستی کورد

تێبگەین تێگەیشتنی گشتیمان لەسەر کورد ئەوە بوو کەگەلێکن هاتوونەتە خاکی عەرب و بوونەتە میوان لە نیشتیمانەکەیدا"[49]، سەدام حوسەینیش لەساڵی ١٩١٧ لە وەڵامی پرسیارێکی پەیامنێری رۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی کە لێی پرسی ئایا ئێوە گەلی کورد بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب دادەنێن؟ سەدام دەڵێت" عێراق لەسەر نەخشەی وڵاتانی عەرەبیە، ئێمە دژی ئەوە نین کە کەمینە نەتەوەیی لە وڵاتی عەرەبیدا بژین، بەڵام ئێمە خاکیان بۆ دابین بکەین ئەوە جیا دەبنەوە، بۆیە ئێمە رێگە بەوە نادەین، حکومەتی عێراق و حیزبی بەعس ئۆتۆنۆمیان بە خەڵك داوە نەك بە خاك"[50]، هەروەها لەساڵی ١٩٦٨ کاتێك سەدام چەمکی مۆدێرنی نەتەوە پێناسە دەکات بە گوێرەی تیرۆرانین و شۆرشی تەموز دەڵێت "کوردە عێراقیەکان بەشێکی تەواوی نەتەوەی عەرەبن"[51]، فەریق روکن وەفیق سامەرایی لە قسەیەکیدا زیاتر تیرۆرانینی حیزبی بەعس بەرانبەر بە کورد روونده‌کاتەوە و دەڵێت "تۆ دەتوانیت نیو ملیۆن لە هەولێر بکوژیت، بەڵام ئەوە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، چونکە هەولێر هەر بە کوردی دەمێنێتەوە بەڵام کوشتنی پەنجا هەزار کورد لە کەرکوك بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە کێشەی کورد دەهێنێت"[52] پێمان وابێ ئەو وتانەی سەرەوە پێویستیان بە شیکارکردن و لێکدانەوە نەبێت، ئەم وتانە زۆر بە سادەیی ئەوەمان پێ دەڵێن کە سەرکردایەتی حیزبی بەعس هەموو مافە بنچینەیی و سەرەتایەکانی لە مرۆڤی کوردیان داماڵیوە، بۆ گەشتن بەئامانجەکانیان کە دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی عەرەبە کورد بەهەموو شێوەکان دەکەن بە قوربانی و جارێك بە میوانی خاکی عەرەب و جارێك بە کۆسپی بەردەم یەکێتی نەتەوەی عەرەب و جارێك بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب و جارێکیش بە کوشتن و لەناوبردن تێی دەروانن. سەرەڕای ئەوەش لایەنێکی تری روانینەکانی تری حیزبی بەعس بەرانبەر بە کورد ئەوەیە کە دەبێت لەبەر چاوی بکوژەکانی سوك بکرێ و وەکو کۆمەڵێك مرۆڤی بێکەڵك و بێخێرو دواکەوتوو کە لە توانایاندا نیە هیچ شتێکی گرنگ بە مرۆڤایەتی پێشکەش بکەن پێشیان بدرێت، بۆ ئەوەی هیچ هاوسۆزی و هاودەردییەك لای مرۆڤکوژەکانی بەرامبەریان نەمێنی و بە زەییان پێیاندا نەیەتەوەو کاتێك کە مرۆڤ کوژان هەست دەکەن ئەوانەی کەدەبێ بیانکوژن لە مرۆڤی ئاسایی کەمترن، ویژدانیان ئازاریان ناداو هەست بەنارحەتی ناکەن[53].

عەلی حەسەن ئەلمەجید لە کۆبوونەوەکانیدا لە گەڵ مۆرڤکوژەکاندا هەوڵی دەدا کورد ئەوەندە سوك و بێکەڵك پێشان بدات کە هیچ بەزەیی و هاوسۆزییەك لە بکوژەکانیدا

نەجۆڵینی و دەڵی ("ئەم بزنانە چی لێ بکەم" ، "ئەم تێکدەرانە چۆن لە نێو ببەم بە بلدۆزەر دەیانخەمە نێو خاکەوە"، "ئەمانەن ئێوە لێیان دەترسان کێ هەیە شتێك بڵێت؟ کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بم و لەوانەش بم کە گوێیان لێ دەگرن" ، ١٥ رۆژ بە کمیایی لێیان دەم نەك یەك رۆژ" ، "وەك مریشکیان لی دەکەم کە جوجەڵەکانیان بخاتە ژێر باڵیانەوە"، "بۆ رێگەیان بدەم وەك کەر کە هیچ شتێ نازانێ لەوێ بژین؟ گەنمیانم ناوێ ،کشتو کاڵ و تەمانەو بامیەیانم ناوێ"، "ئێمە داوامان لە موسڵ کرد کوردەکان رەوانەی چیا بکەن بۆ ئەوەی وەك و بزن بژین" ، "ژنەکانیان خراپ بکەن"، "سەریان پان دەکەمەوەو وەك سەگ سەریان دەهاڕم"، "وەك خەیار لەت و پەتیان دەکەم" ، "من دەموت لەوانەیە چەند کەسێکی چاکیان تێدا پەیدا بێت، چونکە ئەوانیش هەر میلەتی ئێمەن بەڵام قەد پیاوێکمی باشم تێدا بە دی نەکرد") ئەمانە هەمووی قسەی عەلی حەسەن مەجید بوو کە لە کۆبوونەوەکانیدا کردوونی بۆ ناشیرن کردنی نەتەوەی کورد، عەلی حەسەن مەجید ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕ شبوو رووی دیاری تێڕوانینی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس بوو بەرامبەر بە کورد بە تایبەتی لە کاتی شالاوەکانی ئەنفالدا

هەروەك ئەفسەرێکی پێشووی هەواڵگری ئیستخبارات بۆ رێکخراوی میدڵ ئێست وۆچ دەدوێ و دەڵی" فەرمانەکان ئاشکرا بوون هەموو ئەو پیاوانەیان دەکوشت کەتەمەنیان ١٥- ٦٠ ساڵ بوو عەلی ئەلمەجید نەیدەویست جارێکی تر بیان بینێتەوە بۆیە پێویست بوو لە ناو ببرێن[54]

**تێڕوانینی حیزبی بەعس بەرامبەر بە ئەنفال:**

"ئەنفال بە زۆر رۆحکێشانی هەزاران
کەسە بێئەوەی خوا بڕیاری مەرگیانی دابێت،
ئەنفال واتا بە زۆر مراندن".
(**فەرج حەمە عەزیز- رزگاربووی گۆرە بە کۆمەڵەکان**)[55]

بۆ تێگەیشتن لە ئەنفال، تەنها یەك رێگامان لە پێشدەمدایە، ئەویش رێگای تێگەشتنە لە بەعس، بەبێ ناسینی بەعس ناتوانین ئەنفال بەکۆی دیاردە مێژووی و کۆمەلایەتی و دەرونییەکانی دیکەوە گرێبدەینەوە، ئەنفال هەرسەرچاوەیەکی هەبێت هەر

ڕەگ و ڕیشەیەکی مێژووی یا ئایدۆلۆژیای هەبێت، پێشتر ئەو هۆکارانە بەهەناوی بەعسیزمدا ڕابردونوو لە نیوەندی ئەو هەناوەدا شێوەیەکی نوێ و مۆرکێکی تازەیان وەرگرتووەو بونەتە بەشێك لە کلتوری بەعس، بۆیە ئەگەر بشمانەوێ لەسەرچاوە دورو دێرینەکانی ئەنفال بگەین پێشوەخت دەبێت لەکارکردنی بەعس و شێوەی مامەڵەکردنی بەعس لە گەڵ ئەو سەرچاوانەدا تێبگەین، چونکە بەعسیزم دیاردەیەکە، سروشت و مۆرکی ئەو دیاردانەی تر دەگۆڕێت، کە بەنێویدا گوزەر دەکەن(56)

بەعس هەم وەك حیزبێکی سیاسی و هەم وەك ڕێباز و ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو دەستی خستۆتە ناو کایەکانی کۆمەڵگا و کاریگەری ڕاستەوخۆشی لەسەر پەیوەندییەکانی کۆمەڵگا هەیە، هەروەها بە پێی جیهانبینییەکانی ئەم حیزبەو ئایدۆلۆژیاکەی حیزبی بەعس تێروانینێکی تایبەتی خۆی هەیە بەرامبەر بە ئایدیاو مەتریالیەکانی چواردەوری، هەر لەم روشەوە بەعس تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە بەرامبەر بە ئەنفال، ئەنفال هەم وەك ماناو چەمکەکەی، ئەنفال هەم وەك پەلاماردان و قەسابخانەکەی، هەڵبەت ئەنفال بە تەواویی ڕەهەندە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونی و کلتورییەکانیەوە لە سەروو هەموشیانەوە تێکەڵبوونی بە ئاین و دەرەنجامی ئایدۆلۆژییەك، ئامانجەو کۆدی خۆی هەیە لای بەعس، بەعس لە ئەنفالدا بەشێك لە ئیلهامە توند و تیژەکەی لە ئیسلامەوە هێناوەو لە سورەتی ئەنفالەوە وەری گرتووە.

وشەی ئەنفال ناوی سورەتی هەشتی قورئانی پیرۆزەو لە ٧٥ ئایەت پێك دێت، وشەکە بە مانای تالان یان تالانی شەڕ دێت، لەم ئایەتانەی ئەم سورەتەدا خودا داوا لە پەیامبەری ئیسلام (د.خ) دەکات دژی ناموسڵمانان و بێ باوەڕەکان بجەنگن و لە ناویان بەرن، بە شێك لە ئایەتەکانی ئەم سورەتە ئاماژەیە بۆ توند و تیژییەکانی ئیسلام بەرامبەر نەیارانی، لە ئایەتی یەکەمدا هاتووە "پرسیاری ئەنفال دەکەن بڵێ ئەنفال لە خودا و پەیامبەرەوەیە" ، هەروەها لە ئایەتی حەوتدا هاتووە "بۆخۆتی ببە ، خودا بەڵێنی پێدای یەکێك لەوانە بۆ خۆت بێت، تۆ دەتوانی یەکێکی بێ چەك بۆ تۆ بێت، بەڵام خودا ویستی بە پێی وشەکانی ڕەوایەتی بداتەراستی و ڕەگی بێباوەڕان ببڕێتەوە"، لە ئایەتی دوانزەهەمدا هاتووە "من لە گەڵتام، خۆراگری بدە بە بڕواداران من ترس و تۆقاندن دەخەمە دڵی بێباوەڕان، ملیان ببڕەوەو هەموو پەنجەکانیان ببڕە"، لەئایەتی سێنزەهەمدا هاتووە "ئەوە لەبەر ئەوەی ئەوان دژی خودا و پەیامبەر وەستان ئەگەر هەر

کەسێك دژی خودا و پەیامبەر بوەستێت، خودا لە سزادان توندە"، لە ئایەتی سی و حەوتەهەمدا هاتووە "بۆ ئەو خودا خاوێن و پیس لە یەك جودا دەکاتەوە، پیسەکان یەك لەسەر یەك کۆبکاتەوەو بیهاوژێتە سەر یەك و فڕیانداتە دۆزەخ، ئەوانە ئەو کەسانە دەبن کە دۆڕاندنیان"، هەروەها لە ئایەتی شەست و پێنجدا هاتووە "ئەی پەیامبەر، بە بڕواداران بڵێ هانیان بدە بۆ شەڕ، پشوت درێژ بێت، ئەگەر بیستت لە دەوردا بن ٢٠٠ کەس دەشکێنن ئەگەر ١٠٠ بن ١٠٠٠ دەشکێنن، چونکە ئەوانە خەڵکێکن تێناگەن" ئەمانە ئەو کۆدانە بوون کە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا هاتووە بەرامبەر بێبڕواکان، حیزبی بەعسیش پاش ئەوەی کوردی وەك بێباوەڕو نا موسڵمان ناساند بەرامبەر بە عەرەب و سوپاکەی، زۆرێك لەو کارە توند و تیژیانەی بەرامبەر کردن و ئەنفالیانی کرد، حیزبی بەعس ئیسلامی تەنها وەکو هۆکارێك وەرگرتووە بۆ گەیشتن بە بیری یەکێتی عەرەب، واتا ئیسلام هۆکارەو یەکێتی عەرەب ئامانج، بۆ ئەوەی ئەم هاوکێشەیە پارسەنگی هەبێت چەندین دروشم و سمبوولی ئیسلامی بەرز کراوەتەوە.

بەعس ئیسلام لەسەر ئاستی ئەنتۆلۆژی و ئایدۆلۆژی دەبینێت وەك بزوتنەوەیەکی سیاسی و ناسیۆنالیست کە ئامانجەکەی یەکێتی نەتەوەی عەرەبەو لە هەمانکاتدا زیاتر وەك دیارییەکی داگیر کردن و شارستانیەك تەماشای دەکات نەك وە رۆحییەکی خودایی و چەند پڕاکتێکێکی پیرۆز[57]

حیزبی بەعس خۆی دەکات بە خوداو ئایدۆلۆژییەکەشی بە ئاین ، ئەندامانی خۆیان گۆش دەکرد کە ئەم رستەیە بڵێنەوە( باوەڕم بە بەعس هێنا وەك خوایەکی بێشەریك و عەرەبایەتی (العروبە) وەك ئاینێکی بێهاوتا) [58] واتا بەعس ئاینمەو عەرەبایەتیش ئاینزام.

ئەگەر کۆك بین لەسەر ئەوەی بە پێی ئەقڵی بەعس کافر بریتیە لە ئەنتی بەعس، خودا بریتیە لە سەدام و ئاین بریتیە لە حیزبی بەعس ئەوا دەگەینە ئەو خاڵانەی خوارەوە:

١- چەمکی ئەنفال بەهەمان مانا ناوەڕۆکی سورەتی ئەنفال بۆ ناولێنای شاڵاوەکانی کورد قڕانی لە ساڵی ١٩٨٨ لە لایەن رژێمی بەعسەوە بەکار هاتووە و بەرێکەوت نەبووە.

٢- بەعس زمانی تایبەتی خۆی هەیە، دیاردەکان بە زمانی بەعس ماناو ناوەڕۆکی تریان هەیە، بەعس سورەتی ئەنفالی گەشە پێداوە، کۆدەکانی بە ویستی خۆی و بۆ بەرژەوەندی خۆی دەستکاری کردووە، واتا ئەو سورەتەی کە لە قورئاندا بەناوی ئەنفال

ھاتووە لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بۆ مەبەستێکی دیاری کراو و لە بەرژەوەندی موسڵمانان نێردراوە، کراوە بە بناغەی تیۆری بەعس کە بە شێوەی زنجیرە لە پەلاماردا پراکتیزە کراوە.

٣- لە ئەنفالی بەعسدا کورد کافرە، چونکە دژ بە بۆچونەکانی بەعس و فکری بەعسە، پێشمەرگەی کورد لە روانگەی کوردا هێزی رزگار کەرە، بەڵام لە لای بەعس دوژمنێکی سەر سەختەو لە جەنگدایە لە گەڵیدا، کەواتە لادێنشینەکانیش کە داڵدەی پێشمەرگەیان داونە جەنگاوەرن و دەبی ئەنفال بکرێن لەکاتی جەنگیشدا سامان و ماڵ و ژن و منداڵیان تالان دەکرێت.

٤- هەموو ئەو کۆدانەی کە لە سورەتی ئەنفالدا ئاماژە بە سزدان دەکات لە شاڵاوەکانی ئەنفال بۆسەر کورد ئەنجامدراون[59]

هەڵبژاردن و ئامانجی ناولێنانی بەعس بۆ ئەنفال چەند مانایەکی هەیە لەوانە:

١- حکومەتی عێراق ویستی گەلی کورد بە کافرە غەیرە دینیە کان بچوێنێت، کە کاتی خۆی پێغەمبەر(د،خ) شەڕیانی کرد و لە ئەنجامی ئەوشەڕەوە بوو سورەتی ئەنفال نێردرا.

٢- بۆ ئەوەی کە کوشتنی خەڵکی گوندەکان حەڵاڵ بکات، هەروەك چۆن کوشتنی کافرەکان لە کاتی خۆیدا بە غە زا دا دەنرا.

٣- بۆ ئەوەی سەروەت و سامانی ئەو کوردانەی بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەوتن، لە لایەن سوپای ئێراق و جاشە کانەوە بە تالان ببرێت.

٤- بۆ ئەوەی وای نیشان بدات کە ئەمان میراتگری شۆڕشگێری ئاینی پیرۆزی ئیسلامن و شەرەکان بەیەکتر بچوێنن لەگەڵ شەڕی سەردەمی پەیدابوونی ئاینی ئیسلام[60]

٥- بۆ ئەوەی سەدام خۆی وەك کەسێکی ئاین پەروەر و خوداناس پێشان بدات.

٦- بۆ ئەوەی گەلی کورد وەك گەلێکی کافر بە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان بناسێنێت.

٧- بۆ ئەوەی بەرامبەر ئەو تاوانانەی کە بەرامبەر گەلی کورد کردییان هیچ گەل و گروپێکی موسڵمان و ئیسلام نەیەتە دەنگ[61].

کەواتە ئەنفال بە تێڕوانینی حیزبی بەعس بریتیە لەوەی کە حکومرانانی ئێراق و هزروانەکان ( حیزبی بەعس ) بڕوایان وایە کە ئیسلامی راستە قینە ئەوەیە کە ئەوان

دەیزانن ئەدەبیاتی حیزبەکەیان پەخشی دەکات، هەر کەسێکیش وەك ئەوان بیر نەکاتەوە ئەوا ئیسلام نیە یاخود بەلای کەمەوە لە ئیسلام نەگەیشتووە، کوردیش لەبەر ئەوەی هەوڵیان لەگەڵ دراوەو تێنەگەیێنراون، هیچ دەرفەتێکیان نەماوە بۆیە ئەوەی بووە بە بەعسی ڕێگای هیدایەتی هەڵبژارد و ئەوەی نەبووە بە بەعسی ڕێگای گومڕای هەڵبژاردووە، ئەو کەسانەی ڕێگای گومڕاییان هەڵبژاردووە پێویستە بکوژرێن و لە ناو ببرێن، چونکە بە بڕوای بەعس کافرن بە گوێرەی ئەو تەفسیرەی بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو مانایەی هەیە کە ئەوان لە کوردستان کردیان، بەڵگەش لەسەر ئەو بۆچونە چەند دروشمێکی خۆیانە یەك لەو دروشمانە دەڵێت ( كان محمد كل العرب، فليكن كل العرب محمد) واتا پێغەمبەر (د،خ) لە کاتی خۆی هەموو عەرەب بوون، چونکە هەر ئەو هەوڵی بوژانەوەی عەرەبی دەدا، لەم سەردەمەشدا بەعسییەکان هەوڵی بوژاندنەوەی عەرەب دەدەن، کەواتە هەر بەعسییەکی ئەوان وەك پێغەمبەرە، هەروەها لە دروشمێکی تردا دەڵێت ( البعث نور لمن اهتدى ونار على من اعتدى) کەواتە هەرچی بێتە بەعسی هیدایەت دراوە و کەوتۆتە بەر ڕۆشنایی و هەرچی نەبێت بە بەعسی تاوانبارە و شەرانگێزە، شایەنە بسوتێندرێت بە ئاگر، کەواتە بە قسەی بەعسییەکان ئەو کوردانەی نەبوون بە بەعس گومڕاو تاوانبارن پێویستە بسوتێندرێن[62]

تێروانینی حیزبی بەعس لە ئەنفالدا بەرامبەر بە کورد ئامانجی سەرەکی هەیە ئەوانیش:

١- کوردستان لە ڕووی خاك ومرۆڤەوە لە سەر بنەڕەتی نەخشەی دوای ١٩٧٥ دووبارە وێنە بکێشرێتەوە، بە شێوەیەك ڕوبەری زۆربەی خاکەکەی مرۆڤی تێدا نەبێت و چەندین سەنگەری سەربازی و سەربازگەو کێڵگەی مینی تێدا بێت، ڕێگای جۆراو جۆری ڕووتەن ئەو ڕوبەرانە ببڕن و لە هەردوولای ئەم ڕێگایانەش چەندین گوندی خاپوور کراوی سوتێندراوی بێ مرۆ هەبن.

٢- بەندکردنی تەواوی گەلی کورد لە کەمتر لە پەنجا پارێزگا و شار وەك بەندیخانەیەك دوورە دەست بن وە چەندین بەربەست و بازگەو کێڵگەی مین دەورە درابوون، هەروەها پلانەکە ئامانجی ئەوە بوو کە ئابووری کشتوکاڵی و ئاژەڵی لە کوردستاندا بە تەواوەتی وێران بکات و ژیانێکی ئابووری نوێ بنیاد بنێت کە پشت بە خێرپێکردنەکانی حکومەتی مەرکەزی ببەستی و دواتریش لە ڕووی سیاسییەوە بتوانن بنکەیەك بۆ بە عەرەب کردن دابمەزرێنن[63]

لەبەر ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەی حیزبی بەعسدا لەئەنفالداو بۆ پێشاندانی هەیبەتی هێزی خۆیان کاریگەری ئەم هێزە لە ئەنفالدا، هەروەها بۆ زیندوو هێشتنەوەی ناوی ئەنفال و گەورە کردنی ئەم ناوەش بەشێوەیەك کەخزمەتی بیرو باوەڕەکەی بکات و هەردەم بەکورد بڵێ ئەوە ناوی ئەو شالاوەیە کە ئێوەی پێ لەناوبراوە بۆیە ناوەکە زیندووە و هەرکاتێك پێویست کات دووبارەی دەکەمەوە، حیزبی بەعس لە دوای پەلاماردنەکانی ئەنفال کێڵگە نەوتێکی بەناوی ئەنفال کردەوە کەرتێکی تایبەتی حیزبی بەعسیش لەیادی ئەو پەلاماردا دامەزراو قۆنتەراتێکی حکومیشی کردەوە بەناوی کۆمپانیای ئەنفال کەئەرکی ئەم کۆمپانیایە وشککردنی زۆنگاوەکانی باشووری ئێراق بوون.

ئەگەر چی حیزبی بەعس و سەدام حسێن لەم ساڵانەی دوایدا زۆرجار پەلامارو شالاوەکانی بە زمانێکی ئاینی و خودا پەرستی داپۆشیوە، بەڵام ئێراقی بەعسییەکان دەوڵەتێکی عیلمانی و سەربازییە، قوربانیانی پەلاماری ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨، کوردەکانی باکوری ئێراق بوون و بە زۆریش موسڵمانی سونی بوون، لە کاتی ئەنفالدا هەرچی مزگەوت هەبوون لە گوندە کوردنشینەکاندا کەوا بەر پەلامارەکە کەوتن، روخێنران و کەتیبە ئەندازیارییەکانی سوپا ئێراق بە بلدۆزەرو دینامیت تەختی زەویان کرد(64)

## پەراوێزەکان:

١-عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، بەرگی دووەم،٢٠٠٢، ل٢٩٢

٢-بەختیار عەلی، لەئارەزوی کوشتنەوە بۆ ئارەزوی فەرامۆشکردن،گۆڤاری ڕەهەند، ژ.٧، ١٩٩٩، ل١٧٣

٣-موسلح ئیروانی، لەئایدۆلۆژیای ئاینەوە تا ئاینی فراوانتر لە ئایدۆلۆژیا، www.Rwanin.net

٤-هانا ئارێنت، بنەماکانی تۆتالیتاریزم، و/ حەمە رەشید، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧-سلێمانی، ل٤٠٨-٤٠٩

٥-موسلح ئیروانی سەرچاوەی پێشو،ل٥

٦-ئەبو بکر عەلی، پرۆسەی بەشتومەك کردنی مرۆڤی کورد،کۆڤاری ئەنفال، ژ.٢، گۆڤارێکی لێکۆڵینەو دۆکۆمێنتییە/ وەزارتی مافی مرۆڤو ئاوارەو ئەنفال دەریدەکات، ل٧٥

٧-د.ئەلبێرت عیسا، خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژووی، مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، ٢٠٠٤، ل٧٢

٨- د.ئەلبێرت عیسا ، هەمان سەرچاوە،ل٢٨

٩-د.ئەلبێرت عیسا ، هەمان سەرچاوە، ل٣٩

١٠-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل٣٦

١١-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل١٤٥

١٢-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل١٨٧

١٣-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە،ل١٥٢

١٤-حركة البعث اهداف ونمایات، ل٣، ئەمین قادر مینە، لەئەمنی ستراتیژی عیراق سێکوچکەی بەعسیان،سلێمانی-١٩٩٩،ل٦٩، وەرکیراوە

١٥ -د.جەبار قادر ، ئەنفال و دەرهاویشتەی ڕەگەزپەرستی و تۆتالیتاریزم و کۆمەڵگەی داخراو، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ.٢٤، ل٧٠

١٦-مەریوان وریا قانع، خێمەکانی سەدام، سایتی رەهەند

١٧-د.ئەلبێرت عیسا، سەرچاوەی پێشوو،ل١٥٥

١٨-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە،ل١٥٦

١٩-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل١٥٨

٢٠-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ت١٥٩
٢١-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل١٥٨
٢٢-د.ئەلبێرت عیسان هەمان سەرچاوە، ل١٦٨
٢٣-عادل باخەوان، تۆتالیتاریزم، سایتی روانین
٢٤-شاهۆ سەعید، تۆتالیتاریزم: ئایدۆلۆجیایەکی لێکدراوو رژێمێکی فرە ئەدگار، گۆڤاری سەردەم، ژ.٥١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم،سلێمانی-٢٠٠٧، ل٣٦
٢٥-سالار حەمە سور باسیرە، هەڵەبجەو ئەنفال، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٣، ل٧٥
٢٦-مەریوان وریا قانع، دیکتاتۆریەت و تۆتالیتاریزم، گۆڤاری سەردەمی رەخنە، ژ.٢، ل٦
٢٧-هانا ئارێنت،بنەماکانی تۆتالیتاریزم،سەرچاوەی پێشو، ل٢٧
٢٨-هانا ئارێنت،هەمان سەرچاوە،ل٢٧١
٢٩-هانا ئارێنت، هەمان سەرچاوە، ل٢٩٣
٣٠-زوهێر جەزائیری، پێش ئەنفال و پاش لەبیر چونەوە، گۆڤاری سەنتەری برایەتی،سەرچاوەی پێشوو،ل٣٦
٣١-د.ئەلبێرت عیسا، سەرچاوەی پێشو،ل١٠٨
٣٢-گۆران بابا عەلی، ئەنفال،جینۆساید لەئایندەدا بۆ رەوایەتی دەگەرێت،گۆڤاری رەهەند،سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧
٣٣-بەختیا عەلی،سەرچاوەی پێشوو،ل١٨١
٣٤-زوهێر جەزائیری،سەرچاوەی پێشو،ل٣٨
٣٥-د.ئەلبیرت عیسا،سەرچاوەی پێشو،ل١٣٠
٣٦-د.ئەلبێرت عیسا،هەمان سەرچاوە،ل١٢٩
٣٧-زوهێر جەزائیری ، سەرچاوەی پێشو،ل٤٣
٣٨-د.ئەلبێرت عیسا ، سەرچاوەی پێشو،ل١٣٠
٣٩-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە،ل١٢٥
٤٠-د.ئەلبێرت عیسا،هەمان سەرچاوە، ل١٢٠
٤١-هیومان ریتس وۆچ،جینۆساید لەعێراق، پەلاماری بۆ سەر کورد، و/مەحەمەد حەمە سالەح تۆفیق، خانەی وەرگێران،سلێمانی،ل٤٣٦
٤٢ -عارف قوربانی، لەتۆبخانەوە بۆ عەرعەر، چاپی یەکەم،کرکوک-٢٠٠٤، ل١٠٧
٤٣-هیومان رایتس وۆچ ، سەرچاوەی پێشوو،ل٦٥
٤٤-شۆرش حاجی رەسول، ئەنفال، کوردو دەوڵەتی عێراق، بەرێوەبەرایەتی گشتی چاپ بلاوکردنەوە، چاپی دووەم، سلێمانی-٢٠٠٣، ل١٦
٤٥-پ.د.کازم حەبیب، رەگەزپەرستی لەپیادەکردندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی،سەرچاوەی پێشو،ل٥
٤٦-گۆران بابا عەلی،سەرچاوەی پێشو،ل١٦٨
٤٧-مەحەمەد رەئوف عەزیز، ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجییەکانی، بەرێوەبەرایەتی چاپ و بلاوکردنەوە،١اپی یەکەم، ٢٠٠٥، ل٤٣
٤٨-تەها سلێمان، لەپەراوێزی ئەنفالدا، خەندان بۆ پەخش و وەشاندن،بەرگی دوەم، ٢٠٠٦، ل١١
٤٩-د.جەبار قادر، سەرچاوەی پێشو،ل٦٩
٥٠-د.جەبار قادر، هەمان سەرچاوە،ل٧٠
٥١-د.ئەلبێرت عیسا، سەرچاوەی پێشو، ل١٧١
٥٢-یوست هیلتەرمان، کارێکی ژەهراوی، و/مەحەمەد حەمە سالەح، کۆمپانیای ئاوێنە،سلێمانی-٢٠٠٨،ل١٧٩
٥٣-د.جەبار قادر، سەرژاوەی پێشوو،ل٧٦
٥٤-پ.د.ئازاد حەمە ئەمین نەقشبەندی، ئۆپراسیۆنەکانی ئەنفال، چەند تێبینیەك و سیما سەرەکییەکانی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی،سەرچاوەی پێشو، ل١٠٢
٥٥-عاف قوربانی، لوتۆبخانەوە بۆ عەرعەر ، سەرچاوەی پێشو، ل١٠٥
٥٦-بەختیار عەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧
٥٧-د.ئەلبێرت عیسا، سەرچاوەی پێشو،ل١٧٥
٥٨-د.ئەلبێرت عیسا، هەمان سەرچاوە، ل٢٨١
٥٩-مەهاباد قەرەداخی،کارەساتی ئەنفال،کاریگەرییە دەرونییەکانی لەسەر کۆمەڵگا،گۆڤاری ئەنفال ،ژ.٥، ٢٠٠٤، ل٢٢٣
٦٠-شۆرش حاجی رەسول،سەرچاوەی پێشوو،ل٥٢
٦١-مەهاباد قەرەداخی، سەرچاوەی پێشوو،ل٢٢٣
٦٢-د.مەحەمەد گەزنەیی، کورد قران ساڵی ١٩٨٨و هۆکارەکانی ناولێنانی بەئەنفال، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، سەرچاوەی پێشو،ل٣٢٢
٦٣-زوهێر جەزائیری، سەرچاوەی پێشو، ل٥٩
٦٤-میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشو، ل٧٦

# لە زمانی بەڵگەنامەکانەوە

عەدالات عومەر

یەکێك لە باشترین رێگاکان بۆ ناساندنی جێنۆساید بە دنیای دەرەوە دێکۆمنێت و بەڵگەنامەکانی (بینراو، بیستراو، خوێنراو)ن، بۆیە پێشنیار دەکەم بە دروست کردنی سەنتەرێکی ئەرشیڤی نەتەوەیی کە لەلێژنەیەکی پسپۆر و شارەزا پێك بێت، بە مەبەستی پاراستنی ئەم بەڵگەنامانە کە زەرورەتێکی گەورەیە بۆ پێکاندنی ئامانجە .

ئەم جارە من باسی قوربانیانی نوگرە سەلمان دەکەم، کە بەشێکی ئەو چاوپێکەتنانەی کە لەگەڵ شایدعەیانەکانی گەراوە لە سەفەری مەرگ ئەنجامم داوە بەشێکی تری باس لەم بەڵگەنامانە دەکەم کە ناوی قوربانیانی تێدایە، قەڵای نوگرە سەلمان ئەو شوێنەیە کە لەسەر دەرگای چوونەژوورەوە نوسراوە "بەخێربێن بۆ دۆزەخ" و لە سەر دەرگای پشتەوەش نووسراوە"کەم هەڵدەکەوێت کەسێك سێ مانگ لەم شوینەدا بمێنێتەوە"، بە پێی بەڵگەنامەکان ئازار و ئەشکنجەدان لە زیندانی نوگرە سەلمان تا رادەی کوشتن بووە ئەمە جگە لە زیندە بە چاڵکردنی بە کۆمەڵی خەڵکەکە، لەم بەڵگەنامانە هۆکاری مردنی نێر و مێ، گەورەو گچکە وا نوسراوە راوەستانی کتوپری سووری خوێن لە ئەنجامی خوین لە بەر چوون(نەزیف)ی ناوخۆیی، بە پێی ئەم بەڵگانە کە لە بنکەی تەندروستی قەزای سلمان دەرچووە ناوی هەواڵهێنی مردنەکە بۆ هەمووی نووسراوە ئەفسەری ئەمنی قەڵای سلمان، هەروەها لە بەشی پەیوەندی بە مردوەکەدا نوسراوە دەست بەسەردا گیراو، ئەم بەڵگانە لە لایەن پزیشکێك بە ناوی سمیر ودیع شاکر ئیمزا کراوە و بەڵگەنامەی وەفاتیان بۆ دروست کراوە هەر هەمووشی بەپێی نووسراوی رەسمی قەڵای نوگرە سەلمان بە ژمارەی جوراجور بە ئیمزای ئەفسەری ئەمنی قەڵا نیردراوە لە زۆربەی نوسراوەکاندا نوسراوە" بۆ ئاگاداریتان مردووەکە هیچ بەڵگەنامەیەکی رەسمی نیە"، یەکێك لە گەراوەکانی نوگرەسەلمان تا رۆژی بەر بوونی ٥٢٠ کەسی ژماردووە کە لە ژێر ئەشکنجەدا گیانیان لە دەست داوە، بە پێی ووتەی کارمەندانی بنکەکە ئەوان بەس بەڵگەنامەی وەفاتیان بۆ قوربانیان بە ناوی ئەو

کەسانەی دروست کردوە کە بە نووسراو بۆیان هاتووە بەڵام هەرگیز لاشەکانیان نەهاتووتە لایان.

مام نوری شاید عەیانیکی دەربازبووی ئەنفال دەڵێت" لە نوگرە سەلمان دوو عەرەبانەی شکاوی لێ بوو،عەرەبانەی دەستی یەك تایە، ئەو کەسانەی دەمردن لە سەر ئەو عەربانە دایان دەنا، جار هەبوو بەیانیان کە هەڵدەستاین ٦ مەیتیان تێدەکرد هێندێکیان ئەوندە مابوونەوە بۆگەن ببوون، زۆر جارمەیتەکان بەردەبونەوە، خاکەنازێك و باڵتەیەکی شکاومان لا بوو خۆڵەکەش زۆر رەق بوو هەڵنەدەکەندرا ئەوە ناشتن نەبوو، فرێدان بوو، چونکە تۆزێك خۆڵمان دەکرد بە سەریاندا و دوای ئێمە سەگ مەیتەکانی دەخوارد. چونکە سەگی بەرەڵای زۆر لێ بوو.

مام نوری لە بەردەوامی قسەکانی وا باسی قەڵای نوگرە سلمان دەکات و دەڵێت "نوگرە سەلمان دۆزخێك بوو دەگووت رۆژی حشرە لە نوگرە سەلمان زۆرمان برسی و تینوو بوو چونکە لەماوەی شەو و رۆژێکدا هیچیان نەداینێ، کابرایەك (حمە صدقی) ناوو بوو خەڵکی (دارەختیار) بوو هاواری کرد ووتی نانمان بەنێ وا لەبرسا مردین هاتن زۆریان لێدا بەس لەبەر ئەوەی داوای نان و ئاوی کرد، لە نوگرەسەلمان لە سەر قاپیەکانی نووسرابوو (وەیل)، قاعەکان زۆر پیس بوون، بە سەدان کەس زیاتر لە قاعەکاندا بوون، جێگای خەوتنمان نەبوو لە سەر لاتەنیشت ئەخەوتین، ژەمی سەمونێکی گەنمەشامی لەگەڵ یەك تۆز ئاودا، ئەوشەش مانگە دەممان لە هیچ چێشتێك نەدا جگە لە سەمون و ئاو، سێ مانگ بوو گیرا بووین وتیان شوتیتان بۆ دێنین ناردیان بۆ سەماوە بۆ شوتی، شوتیان هێنا هەر قاعەو دوو کەسیان بانگ کرد تاکو دابەشی بکەن بە سەرماندا، شەو و رۆژێك ئەو پیاوانەیان هیناو برد، شوتیەکان بۆگەنیان کردبوو، یەکی قاژێکیان داینێ زۆر کەس هەر نەی خوارد فرێیان دا منیش فرێم دا زۆر پیس بوو".

لەبەشێکی تری قسەکانی ئەو شایدعەیانە دەڵێت "لە وانەی کە مردن ئافرەتێك بوو ناوی (فاتمە محمد) کە ئامۆزای خێزانەکەی من بوو خەڵکی (ئاغجەلەر) بوو، رۆژێك تێنویەتی تەنگی پێ هەڵچنی بوو بەبێ ئێزن چوو لەحەوشەکەدا ئاو بهێنێت تەنکەرێکیان لەوەێ دانا بوو، هەر تا دەستی برد بۆ ئاوەکە شورتەیەك بە هەموو تینی خۆی شیشێکی کێشا بوو بە پشتیدا و تا هێنامانە ژورەوە مرد. هەر خەڵکی گوندەکەی ئیمە نزیکەی10 کەس مردن. ئینجا ئەوەی داوای نان یان ئاوی بکردایە لەکاتی سەمون

دابەش کردندا دەیان گرت و سەرەوخواریان دەکرد بەدارداو پەڕۆیان لە بەر لوتیان دەسوتاند.

لەچاوپێکەوتنێکی تر کە لەگەڵ شاید عەیانێکی گەراوەی نوگرە سەلمان کە ناوی مام جبارە دانیشتووی بنەسلاوەیە ئەنجامم داوە لەبارەی حەجاج پرسیارم لێکرد؟ ووتی"بەرێوەبەری سجنەکە ناوی (حەجاج) بوو، پێم ووت وابزانم ئەو کەسە عایدی ئەمن و ئیستخبارات بوو ناویشی "ملازم اول عەدنان"ە، بەڵام لەبەر دڵرقی ئەو ناز ناوەیان داوەتە، ووتی نازانم بەڵام هەرچی ئازارو ئەشکنجەدان و شتی خراپ بوو بە ئەمری ئەو بوو، حەجاج هەر بەدەستی خۆی لە بەر چاوی ئێمە حەوت کەسی بەدار کوشت، لەقاعەکان دەگەرا لەحەرەساکانی دەپرسی ئەو ژن و منداڵانە هەموویان پێشمەرگەن؟ حەرەسەکانیش لەوەڵام دیانووت بەڵێ هەموویان پێشمەرگەو تاوانبارو خیانەتکارن جا بەدەم پێکەنینەوە دەهات و سووکایەتی بە ئافرەتەکان دەکرد و ئەو ئافرەتانەی سکیان هەبا بەسۆندە لەسکی دەدا دەیگوت مادام ئەوانە کوردن و خیانەتکارن نابێ بێمێنن"، لەبەشێکی تری قسەکانی لە بارەی ئافرەتەکان دەڵێت" هەر ئافرەتێکیان بانگ دەکرد ئەگەر هاتەباوە ناو قاعەکە کزو مات دەبوو ئەگەر نەهاتباوە ئەوە کەس نەی دەزانی چییان لێ بە سەر دەهات، پرسیم ئەی ئافرەتەکان هیچیان نەدەگووت ووتی بەدایكو خۆشك یان پیرەژنانەکانیان دەووت کەدەستدرێژیان لەگەڵ کردوون ئەوانیش بۆ ئیمەیان باس دەکرد بەڵام دەسەڵاتمان نەبوو، ئەی هاوار چمان کردەبا بەخوا قەت لە بیرم ناچێتەوە ئەی ئەو هەموو کچ و کوڕە گەنجەیان چی لێ کرد بۆ کوێیان بردن؟!".

ئەوەی ئەم جارە سەرنجی راکێشام لە هەر هەموو بەڵگەکان لە بەشی پێشەوەی بەپێ رەگەز و تەمەن نووسراوە ( ژن یان پیاو یان منداڵی دەستبەسەرداگیراو) واتە"زیندانی"، لەبەشی ئاین نووسراوە"ئیسلام"، لەبەشی شوناسی ناسنامەدا نووسراوە"عێراقی"، جا وەرە ئیسلام بی و عێراقی بی، ناوی عەمەلیاتی قڕکردن و لەناو بردنیشت ئەنفالی سۆرەتی هەشتەمی قۆرئان بێت، بۆیە دەبێ بڵێم سیاسەت و نیزامی دەسەڵاتدارانی عەرەبی بەعس و شۆڤێنیی ئاشکرا بوو ئەویش مەبەست لە جینۆساید کردنمان بەس لەبەر" کورد بوونمان" بووە.

لە بەشێکی تری قسەکانی ئەو شایدعەیانە دەڵێت " یەکێك لە ئازارو ئەشکنجانەی حەجاج دڵی زۆر پێ خۆش دەبوو ئەوە بوو نیوەرۆیان لەم گەرمایە ئەیان هێنایە دەرەوە

بۆ بەر خۆرەکە سەعات و نیوێك لەو بەر خۆرە گەرمەکە دەبوو سەیری خۆرەکە بکەین ئەوەی تەماشای نەکردایە لێیان ئەدا،ئەوە تەعزیبێکی زۆر قورس بوو بۆ ئێمە چونکە تەمووز بوو گەرمایەکی زۆر بەتین بوو. ئێمەش ئەو تاقەتەمان نەمابوو، خەڵك هەبوو ئەبورایەوە هەبوو لەو تەعزیبدانەدا دەمرد و ئیمەش هەر بە مەیتی دەمانبردنە ژوورەوە.

شاید عەیانێکی تری نوگرە سەلمان بە ناوی ئامینە دەڵێت "پاش چوار مانگ نۆگرە سەلمان نەخۆشەیەکی تێکەوت شەوی وا هەبوو ($30-40$)کەس دەمرد. هەموو ئەوانەی دەمردن لەشیان رەش و رەق دەبون بە جۆرێکی سەیر باریك بەنیس دەبوون کەس نەیدەناسینەوە، هەموشی لەبەر پیسی و بێ خواردنی بوو، لەماوەی ئەو شەش مانگەدا یەك کەس خۆی نەشۆری .

لەیلا ئەو کچەی کە لە کاتی ئەنفال تەمەنی سێزدە ساڵان بووە و ماوەی شەش مانگ لەگەڵ دایکی لە نوگرە سەلمان زیندانی بووە ئەو دەلێت" کۆمەلێك کوڕو کچی گەنج بووین هەموو بەیانیان تاکو ئێوارە ئاودەستەکانیان پێخاوین دەکردین کە حەوت ئاودەست بوون، شەشیان بە چیمەنتۆ سەب کرا بوو، ئەوەی حەوتەم کراوە بوو ئێمە دەبا هەموو رۆژێك هەموو ئەو پیسایی شەش ئاودەستەکانمان بردباو لەئاودەستی حەوتەم بەتاڵمان کردەبا کە پیرەمێردەکان دەیانووت هەمووی دەرژێتە ژێرزەمینێك (مەنهۆڵێکی گەورە) کە بەردەوام بەندیەکان تیدا ئەشکنجە دراوەن، ئەمە تەعزیبێکی زۆر قۆرس بوو ئیستاش جەستەم لەبەر ئەو پیساییە تووشی نەخۆشی بووە"، کە تەماشای جەستەم کرد زۆر بێتاقەت بووم هەموو جەستەی پەڵە پەڵە ببوو، مام ئەحمەدیش دەڵێت "ماوەی هەفتەیەك بە ئەمری حەجاج لە ژێر زەمینێك ئەشکنجەدرام جێگایەك بوو کە بەردەوام پیسایی تیدا دەرژا لە سەر ئەوەی ووتم ئیوە خواتان نیە بۆ وا لەم ژن و منداڵان دەکەن .

مام نوریش لە بەشێکی تری بەسەر هاتەکەی دەڵێت ". شەوێك سەعات ١٢ی شەوبوو حەجاج هات بەدەم جێنودانەوە گووتی وەرنەدەرەوە وامدەزانی ئێوەش وەك بارزانیەکان ئێرە دەبێتە قەبرتان بەڵام بەداخەوە ئیوە بەردەبن، ئیمەش تا ئەو کاتە نەماندەزانی بارزانیەکان نەماوەن، کە حەجاج ئەو قسەیەی کرد، ئیتر زانیمان کە بارزانیەکان هەموویان تیاچوون ترسێکی زۆر کەوتە دڵمان گووتمان بە خوا ئێمەش وەکو ئەوانمان بە سەر دێت، ئەوانە درۆمان لەگەڵ دەکەن کەس باوەڕی پێیان نەبوو، ووتمان دەمانکەنە ناو بەحرەوە، لە پاش ئەم قسانە دەستیان کردبە لێدانمان بە سۆندە و دار و شیش

زۆریان لێدابن و بردنیاینەوە ژورەوە، هەمووی جێی گۆڕا کەس جێی خۆی نەدۆزیەوە دواتر هاتنەوە ووتیان (٥٠٠) کەسمان دەوێت دەیان بەینەوە بۆ سلێمانی بەرتان دەدەین، کەس باوەری نەبوو خەڵك خۆی دەشاردەوە.

مام ئەحمەدیش لە بەشێکی تری قسەکانی دەڵێت" حەجاج لە سەر نوێژ و رۆژو گرتن خەڵکی فەلاقە دەکرد ودەیگووت نابیٚ کەس لێرە نوێژ بکات و( مەمنوعە سوجدە بۆ خوا بەرن دەبی هەمووتان سوجدە بۆ من بەرن ) هەورەها ئەو دەڵێت رۆژیك خەریکی نوێژ کردن بووم لەناکاو قامچییەك بەر سەرم کەوت بریسکە لە چاوم هەستا و کەوتمە سەر ئەرز حەجاج ووتی جارێکی تر سەروخوار بەدار هەڵت دەواسم و پەرۆ لە ژێر لووتت دەسووتێنم ئەگەر سوجدە بۆ خوا بەری".

شاید عەیانێکی تر بە ناوی فاتیمە دەڵێت "ئاوی نوگرە سەلمان زۆر پیسبوو، سوێرو تاڵ و پر لەوردە شت بوو، پر بوو لە مردن خەڵکەکە لە ناچاری و تێنوێتی دەیخواردەوە و دواتر پێی دەمرد، شەوێك 100 کەس زیاتر پێکەوە مردن مێرد وکوڕەکەی منیشی تیدا بوو وەك شێتم لیٚ هاتبوو تا بەیانی باوەشم پییان کرد ولەسەریان گریام، بەیانی لاشەی مردووەکانیان برد بۆ دەرەوەی قەلاّ خەفەتم دەخوارد دەبیٚ سەگ بەرەلاّکانی نوگرە سەلمان چییان لەم مەیتانە کردبێت، پاش چەند رۆژێك زانیمان ئەو رۆژە چوونکە ژمارەی مردووەکان زۆر بووە حەفارەیان هیناوەو هەموویانیان پێکەوە خستووتە ژێر خۆڵەوە بەم خەبەرە تۆزێك دڵم خۆش بوو کە خاك بە نسیبیان بوو".

عەدالەت تاڵەبانی کە شایدعەیانێکی دەربازبووی نوگرە سەلمانە دەلێت" لەکاتی ئازاردانی جەستەی ئەوا بە نوێترین شێوەی ئازاردان بەندییەکانیان دەکوتا، بۆ نموونە (بوتڵە شوشەیەکی ئارەق یان بیرەیان لەنیوەڕا دەشکاند ئیتر ئەوەی دەمایەوە وەکو پەنجەی دەست تیژ بوون، بەندییەکانیان ناچار دەکرد لەسەری دابنیشن و زۆربە توندیش دەستیان دەنابەسەرشانیان بۆ ئەوەی ئەو شوشەشکاوە بچێتە ناوگیانیان، ئینجا خوێن وەکو جۆگای ئاو لەلەشیاندا دەچۆڕاوەو هیچ چارەسەرو دەرمانێکیش نەبوو، جاری واش هەبوو ئامێری سێکسی جهاز التناسلی پیاوەکاینان بەپلایز دەکوشی تالە هۆش خۆیان دەچوون.

ئەوشایدعەیانە لە بەشێکی تری قسەکانی دەڵێت " (لە چرقەی گەرمای هاویندا رۆژانە یەك دوو ئافرەتیان ئەهێنا دەرەوە و بە عەمودەکانی ناو حەوشەی بەندیخانەکە

هەر لە بەیانی تاكو نیوەرۆ ئەیانبەستنەوە هەتا ئەبورانەوەو نەدەبوایە كەسیش نزیكیان بكەوێتەوە شەوانیش كە سەربازەكان سەرخۆش دەبوون بە زۆری لولەی چەك و لە ژێر هەڕەشەدا گۆرانیان پێ دەگوتن و هەڵپەڕكێیان پێ دەكردن ،

ئێستاش ناوی بەشێك لە قوربانیانی نوگرەسەلمان كە بە پێ ی ووتەی كارمەندانی بنكەكە هەرگیز لاشەی قوربانیان نەهاتووتە لایان بەم شێوەیە:

١. مەلیكە تاهێر جوهر قادر لەدایكبووی١٩٧٨- خەڵكی نەوجول-بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١١٦له ١٤\٦\١٩٨٨

٢. رەزا محمد شەریف لە دایكبووی ١٩٠٧-خەلكی دوكان- بە نووسراوی نهێنی ژمارە ١١٧ لە ١٥\٦\١٩٨٨

٣. شیرین صالح حسین -لەدایكبووی ١٩٨٤-خەلكی كەلار- بەنووسراوی نهێنی ژمارە١١٧ له١٥\٦\١٩٨٨

٤. فاتح حسن سوڵتان لە دایكبووی ١٩١٨-خەڵكی نەوجول- بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١١٧ لە ١٥\٦\١٩٨٨

٥. كریم عزیز ئەمین لە دایكبووی ١٩٥٧-خەڵكی سەنگاو- بەنووسراوی نهێنی ژمارە١١٧ لە ١٥\٦\١٩٨٨

٦. سوارە حسن قادر لە دایكبووی ١٩١٨-خەڵكی سوورداش-بەنووسراوی نهێنی ژمارە١١٧له ١٥\٦\١٩٨٨

٧. نەزیرە حسین علی لە دایكبووی ١٩٨٧-خەڵكی نەوجول-بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١١٧له ١٥\٦\١٩٨٨

٨. زوهرە عوبید رسول لە دایكبووی ١٩٣٧-خەڵكی شوان- بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٢١ لە ١٦\٦\١٩٨٨

٩. حمید محمد محمود لە دایكبووی ١٩٠٣-خەڵكی چەمچەماڵ-بەنووسراوی ژمارە ١٢١ لە ١٦\٦\١٩٨٨

١٠. صالح ئەحمەد حمد لە دایكبووی ١٩٠٨- خەڵكی كویسنجق- بەنووسراوی ژمارە ١٢٢ لە ١٨\٦\١٩٨٨

١١.زیرەك خورشید حسن لەدایكبووی١٩٨٥- خەڵكی دوز-بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٢٤له ١٨\٦\١٩٨٨

١٢.علی حسین علی لە دایكبووی ١٩٨١-خەلكی نوجول- بە نووسراوی نهێنی ژمارە ١٢٥ لە ١٨\٦\١٩٨٨

١٣. حسين احمد سعدون –لەدايكبووی ١٨٧٨–خەلكی کەلار– بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٢٥ لە١٨\\٦\١٩٨٨

١٤. حسين محمود حسن لە دايكبووی ١٩٠٨–خەڵكی چەمچەماڵ– بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٢٥ لە١٨\\٦\١٩٨٨

١٥. پشتيوان رشيد محمد لە دايكبووی ١٩٨٥–خەڵكی قادرکەرەم–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٢٢لە١٨\\٦\١٩٨٨

١٦. فاتمە حيدر عزيز لە دايكبووی ١٩٢٨–خەڵكی قادرکەرەم–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٢٢لە ١٨\\٦\١٩٨٨

١٧. عبدالرحيم کاسمە سور لە دايكبووی ١٩١٠–خەڵكی قادرکەرەم–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٢٤ لە٢٠\٦\١٩٨٨

١٨. سوارە حسن ابراهيم لە دايكبووی ١٩٨٧–خەڵكی قادرکەرەم–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٢٤ لە ٢٠\٦\١٩٨٨

١٩. محمد سليمان خدر لە دايكبووی ١٨٩٨–خەڵكی چەمچەماڵ–بەنووسراوی ژمارە ١٢٤ لە ٢٠\٦\١٩٨٨

٢٠. سوعاد خورشيد فەريق لە دايكبووی ١٩٨٠– خەڵكی کەلار– بەنووسراوی ژمارە ١٢٢ لە ١٨\\٦\١٩٨٨

٢١. يونس جوهر فتاح لەدايكبووی ١٩٠٨–خەڵكی نوجول–بەنووسراوی ١١٢ لە ٢٣\٦\١٩٨٨

٢٢. بيستون خورشيد فەريق لەدايكبووی ١٩٨٧–خەڵكی تيلەکۆ–بەنووسراوی ١١٢ لە ٢٣\٦\١٩٨٨

٢٣. رابيعە حمە توفيق لەدايكبووی ١٩٤٢–خەڵكی سەنگاو–بەنووسراوی ١٣٨ لە ٢٩\٦\١٩٨٨

٢٤. سويبە محمد ابراهيم لەدايكبووی ١٩٧١–خەڵكی نوجول–بەنووسراوی ١٣٨ لە ٢٩\٦\١٩٨٨

٢٥. فاتمە محمد لاوە لەدايكبووی ١٩١٨–خەڵكی ئاغجەلەر–بەنووسراوی ژمارە١٤٧ لە ٩\٧\١٩٨٨

٢٦. قادر فرج موالی لەدايكبووی١٩١٣– خەڵكی تيلەکۆ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٣٢لە ٢٣\٦\١٩٨٨

٢٧. خۆرشيدە رحيم عادن لە دايكبووی ١٩٣٣–خەلكی تيلەکۆ– بە نووسراوی نهێنی ژمارە١٣٨ لە ٢٩\٦\١٩٨٨

٢٨. عبداڵله حمەصالح محمود –لەدایكبووی ١٩٣٢–خەلكیقرەداغ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٣٨ لە٢٩\٦\١٩٨٨

٢٩. سعید بێجان محمود لە دایكبووی ١٩٢٨–خەڵكی سەر قەلا–كفری–بەنووسراوینهێنیژمارە١٣٩ لە١\٧\١٩٨٨

٣٠. نەرمین لەفزڵلە جاسم لە دایكبووی ١٩٢٣–خەڵكی نوجۆل–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٣٩لە١\٧\١٩٨٨

٣١. صبریە محمد احمد لە دایكبووی١٩٤٨–خەڵكی سەرقەلا–كفری–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٣٩لە ١\٧\١٩٨٨

٣٢. ابوبكر محمد لە دایكبووی ١٩٨٥–خەڵكی دوكان–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٣٩ لە١\٧\١٩٨٨

٣٣. شێركۆ علی حسن لە دایكبووی١٩٨٥–خەڵكی سەرقەلا–كفری–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٣٩ لە ١\٧\١٩٨٨

٣٤. بستیە كاكەخان رەمەزان لە دایكبووی ١٩١٨–خەڵكی باوەنور–بەنووسراوی ژمارە ١٤٢ لە ٤\٧\١٩٨٨

٣٥. محی الدین محمد امین لە دایكبووی ١٩٢٨– خەڵكی نوجۆل– بەنووسراوی ژمارە ١٤٢ لە ٤\٧\١٩٨٨

٣٦. حمید مجید احمد لەدایكبووی١٩١٣–خەڵكی تیلەكۆ–بەنووسراوی ١٤٧ لە ٩\٧\١٩٨٨

٣٧. حەبیبە حمید سعید لەدایكبووی ١٩٣٠–خەڵكی تیلەكۆ–بەنووسراوی ١٤٧ لە ٩\٧\١٩٨٨

٣٨. زوهرە سەفر رۆستم لەدایكبووی ١٩٨٥–خەڵكی عزیز قادر–بەنووسراوی ١٤٧ لە ٩\٧\١٩٨٨

٣٩. شەونەم محمد صالح لەدایكبووی ١٩٧٣–خەڵكی سورداش–بەنووسراوی ١٤٧ لە ٩\٧\١٩٨٨

٤٠. كوردە حسین عبداڵله لەدایكبووی ١٩٢٨–خەڵكی تیلەكۆ–بەنووسراوی ژمارە١٥١ لە ١١\٧\١٩٨٨

٤١. احمد مستەفا خونچە لەدایكبووی١٩٢٨– خەڵكی چەمچماڵ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ١٥١لە ١١\٧\١٩٨٨

٤٢. غیدان احمد محمود لە دایكبووی ١٩٣٢–خەڵكی نۆجوڵ– بە نووسراوی نهێنی ژمارە١٥١ لە ١١\٧\١٩٨٨

٤٣. قادر محمد محمود لەدایکبووی ١٩٨٥–خەڵکی تیلەکۆ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٥١ لە١٩٨٨\٧\١١

٤٤. صابر حسن عبدالله لە دایکبووی ١٩٢٥–خەڵکی خلیفان –بەنووسراوینهێنی ژمارە١٥٤ لە١٣\٧\١٩٨٨

٤٥. صابر حمە صالح لە دایکبووی ١٩٣٨–خەڵکی سەنگاو–بەنووسراوی نهێنی ژمارە١٥٤لە١٣\٧\١٩٨٨

٤٦. صالح نصرالله علی لە دایکبووی١٩٣٨–خەڵکی تیلەکۆ –بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٠٠لە ٢٦\٨\١٩٨٨

٤٧. عەباس محمود احمد لە دایکبووی ١٩٠٨–خەڵکی سەر قەڵا–بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٠٠ لە٢٦\٨\١٩٨٨

٤٨. ئاکۆ بکر محمد لە دایکبووی١٩٨٧–خەڵکی تیلەکۆ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٢٠٠ لە ٢٦\٨\١٩٨٨

٤٩. عایشە احمد رسول لە دایکبووی ١٩١٨–خەڵکی قرەداغ–بەنووسراوی ژمارە ٢٠٠ لە ١٩٨٨\٨\٢٦

٥٠. خانم سلیمان قادر لە دایکبووی ١٩٠٨– خەڵکی سەنگاو– بەنووسراوی ژمارە ٢٠٥ لە ٢٨\٨\١٩٨٨

٥١. حبیبە احمد چینە لەدایکبووی١٩١٣–خەڵکی قادر کەرەم–بەنووسراوی ٢٠٥ لە ١٩٨٨\٨\٢٨

٥٢. سبایرە ابراهیم عبدالقادر لەدایکبووی ١٩٨٨–خەڵکی سەرقەڵا–بەنووسراوی ٢٠٥ لە ١٩٨٨\٨\٢٨

٥٣. علی سەمیر بارام لەدایکبووی ١٩٠٨–خەڵکی شیروان–بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٩٨٨\٩\١٨

٥٤. ئاسکە عبدالمحمد عزیز لەدایکبووی ١٩٦٣–خەڵکی هەڵبجە–بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٩٨٨\٩\١٨

٥٥. بەهیە علی عبدالله لەدایکبووی ١٩٣٢–خەڵکی چەمچەماڵ–بەنووسراوی ژمارە٢٢٢ لە ١٩٨٨\٩\١٨

٥٦. علی سمیر بەهرام لەدایکبووی١٩٠٨– خەڵکی کلار–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٢٢٢لە ١٩٨٨\٩\١٨

٥٧. ئاسکە عبدالمحمد عزیز لە دایکبووی ١٩٦٣–خەڵکی هەڵەبجە– بە نووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٥٨. بەهیە علی عبدالله لەدایکبووی ١٩٣٢–خەڵکی تیلەکۆ–بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٥٩. صالح محمود علی لە دایکبووی ١٩٦٤–خەڵکی هەڵەبجە –بەنووسراوینهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٦٠. سەلماعبدالرحمن مستەفا لە دایکبووی ١٩٦٢–خەڵکی هەڵەبجە–بەنووسراوینهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٦١. جبار اسماعیل رەحیم لە دایکبووی١٩٨٧–خەڵکی کلار –بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢لە ١٨\٩\١٩٨٨

٦٢. سەلما حمەصالح قادر لە دایکبووی ١٩٤٨–خەڵکی هەڵەبجە–بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٦٣. عایشە حیدر رشیدلە دایکبووی١٩٥٨–خەڵکی هەڵەبجە–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٢٢٢ لە ١٨\٩\١٩٨٨

٦٤. بەهیە محمد صالح لە دایکبووی ١٩٢٨–خەڵکی چەمچەماڵ–بەنووسراوی ژمارە ٢٢٢ لە ١٨\٩\١٩٨٨

٦٥. عایشە حسین باباحسن لە دایکبووی ١٩٠٨– خەڵکی چەمچەماڵ – بەنووسراوی ژمارە ٢١٦ لە ١٠\٩\١٩٨٨

٦٦. سەعید محمود حسن لەدایکبووی١٩٢٣–خەڵکی چەمچەماڵ –بەنووسراوی ٢١٦ لە ١٠\٩ \١٩٨٨

٦٧. محمد عبدالرحمن سەعید لەدایکبووی١٩١٨–خەڵکی هەڵەبجە–بەنووسراوی ٢١٦ لە ١٠\٩\١٩٨٨

٦٨. حەلاوە لەدایکبووی ١٩١٣–خەڵکی کەلار–بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٨\٩\١٩٨٨

٦٩. اللەکەریم سید احمد عزیز لەدایکبووی ١٩٢٦–خەڵکی هەڵەبجە–بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٨\٩\١٩٨٨

٧٠. نارنج حسن محمد صالح لەدایکبووی ١٩٤٢–خەڵکی کەلار–بەنووسراوی ژمارە٢٢٢ لە ١٨\٩\١٩٨٨

٧١. نەبەز یاوەر محمد لەدایکبووی ١٩٨٣– خەڵکی کفری–بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٢٢٢لە ١٨\٩\١٩٨٨

٧٢. کویستان حمەخان قادر لەدایکبووی ١٩٨٠–خەڵکی هەڵەبجە– بە نووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\٩\١٩٨٨

٧٣. نازنین عوسمان روستم لەدایکبووی ١٩٥٨-خەڵکی کفری-بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\\٩\١٩٨٨

٧٤. اکبر احمد علی شەریف لە دایکبووی ١٩٨٦-خەڵکی هەڵەبجە -بەنووسراوینهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\\٩\١٩٨٨

٧٥. هونەر عومەر احمد لە دایکبووی ١٩٨٤-خەڵکی کلار-بەنووسراوینهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\\٩\١٩٨٨

٧٦. ئامینە کریم سعدالله لە دایکبووی ١٩٣٨-خەڵکی کلار -بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٧٧. شیلان فایق صالح لە دایکبووی١٩٨٠-خەڵکی هەڵەبجە-بەنووسراوی نهێنی ژمارە٢٢٢ لە١٨\\٩\١٩٨٨

٧٨. شیوە فایق صالح لە دایکبووی ١٩٨٤-خەڵکی هەڵەبجە-بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٧٩. ئەحمەد عبدالرحمن لە دایکبووی ١٩٣٣-خەڵکی دوز-بەنووسراوی ژمارە ٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٨٠. ئەحمەد کافی پیروز لە دایکبووی ١٩١٣- خەڵکی کلار - بەنووسراوی ژمارە ٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٨١. وریا علی فەتاح لەدایکبووی١٩٨٦-خەڵکی کلار-بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٨\\٩ \١٩٨٨

٨٢. ئەکرم محمود مستەفا لەدایکبووی١٩٥٥-خەڵکی هەڵەبجە-بەنووسراوی ٢٢٢ لە١٨\\٩\١٩٨٨

٨٣. موسی سعید لەتیف لەدایکبووی ١٩٣٣-خەڵکی کەلار-بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٨٤. فازیل عومەر رسول لەدایکبووی ١٩٤٥-خەڵکی چەمچەماڵ-بەنووسراوی ٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

٨٥. علی ئەسعد محمد لەدایکبووی ١٩٢٨-خەڵکی کەلار-بەنووسراوی ژمارە٢٢٢ لە ١٨\\٩\١٩٨٨

# ئەنفال
# جینۆسایدکردنی نەتەوەیەك لە بێدەنگیدا

هەڤاڵ ئەبوبەکر

**سەرەتایەکی پێویست:**

کارەساتەکانی ئەنفال، هەرچەندە بوونەتە مێژووی رۆژگارێکی رابردوو، بەڵام کاریگەرییەکی سەخت و نێگەتیڤانەی گەورەیان لەسەر ژیانی کوردان بەجێهێشتووە.

ئەوەی جێی داخە ئەمڕۆ تەنها دوای بیست ساڵ لەو کارەساتە گەورانە زۆربەی خوێندەواران و خوێندکارانی زانکۆکانی کوردستان لە رۆژ ژمێری ئەنفالەکان و چۆنێتی رووداني ئەو کارەساتانە بەئاگانین، کە دەبوو لانی کەم لە کۆلیژەکانی یاسادا بەشی سەربەخۆ بۆ یاسا نێودەوڵەتییەکان بکرانایاتەوە تا تیایاندا بەو وردەکارییەوە، بتوانرایە لە روانگەیەکی یاسایی نێودەوڵەتییەوە ئەنفال وەك پرۆسەیەکی موتەکامیلی جینۆسادکردنی کوردان بناسێنێت و نەوەی نوێ چیدی نەك هەر لە رابردووی مەرگەساتەکانی نەتەوەکەمان بەئاگابن، بەڵکو بەشێوەیەك پەروەردە بکرێن کە لە توانایاندا هەبێت لە رێی یاسا نێودەوڵەتییەکانەوە جارێکی دی دۆزی ئەنفال وەك تاوانێکی گەورەی جینۆساید بخەنەوە سەرمێزی دادگاکانی دادی نێودەوڵەتی و هەوڵبدەن لە دوای دادگایکردنی سەرانی رژێمی روخاوی بەعس و سەلماندنی ئەنفال بە جینۆساید لەلایەن دادگای باڵای تاوانەکان لە عیراق و خودی کۆمەڵگای عیراقیشەوە، دژە ئاراستەی سیاسەتی نێودەوڵەتی بکانەوە بە تەریبی یاسا نێودەوڵەتییەکان و بەشێوەیەك ئاگاداری وردەکارییەکان بن کە نەبنە مایەی هەڵەی سیاسیی و یاسایی گەورەو هەر لێرەشەوە داوای قەرەبووکردنەوە لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیی و دۆستەکانی ئەو دەمەی رژێمی لەناوچوو بکەنەوە.

بۆیە لەم باسەدا بەگێڕانەوەیەکی خێرا، رۆژ ژمێری ئەنفال و پۆلێنکردنەکانی رابردوو، بە پێویست دەزانم.

هێرشەکانی ئەنفال بەو هێرشە وەحشیگەرانە دەوترێن کە لەلایەن رژێمی عێراقەوە دەرهەق بە گەلی کورد کران.

له‌١٨/١٧ی شوباتی ١٩٨٨دا یەکەمین هێرشی ئەنفال بۆ سەر ناوچەی دۆڵی جافەتی دەستی پێکردو سنووری قەزاو ناحیەکانی (دوکان، بنگرد، چوارتا، قەڵاچوالان، سەرچنارو سورداش)ی گرتەوە، پاش بەکارهێنانی جۆرەها چەکی کۆکوژیی وەك چەکی کیمیاویی و بایۆلۆژیی و فۆسفۆریی، بەگرتنی (سەرگەڵو و بەرگەڵو) لە ١٩/١٨ی ئازاری ١٩٨٨دا کۆتایی بەم هێرشە هات.

ئەنفالی دوو لە ١٩٨٨/٣/٢٢دا دەستی پێکرد بۆ سەر ناوچەکانی (بازیان، قەرەداغ و دەربەندیخان) و لە ٢٩/٢٨ ئازاری ١٩٨٨دا کۆتایی هات.

ئەنفالی سێ ناوچەکانی (چەمچەماڵ، سەنگاو، قادرکەرەم، دووز، کفری، کەلار، پێبازو تیلەکۆ)ی گرتەوەو لە ٧ی نیسانی ١٩٨٨دا دەستی پێکردو لە ١٨/١٧ی نیساندا کۆتایی هات.

ئەنفالی چوار، ناوچەکانی (ئاغجەلەر، چەمی ڕێزان، ناوشوان، دەشتی کۆیەو تەق تەق)ی گرتەوە، لە ٢٠ی نیسان تا ٧ی ئایاری ١٩٨٨ ی خایاند.

ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت، ناوچەکانی (ئامێدی، ئاکرێ، شێخان، زاخۆو دهۆك)ی بادینانی گرتەوەو لە ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ تا ١٥ی ئەیلولی ١٩٨٨ی خایاندو تیایدا (٤٥٠) گوند وێرانکران.

دوا ئەنفال، یان ئەنفالی هەشت لە ٥ی ئەیلولی ١٩٨٨دا بناری قەندیلی گرتەوە[1].

لە ئەنجامی ئەم شاڵاوە دڕندانەیەی ڕژێمدا دەیان هەزار کەس لە ژن و پیرو منداڵ و گەنج بێ سەروشوێن کران و سەدان گوندی ناوچەکانیان خاپورکران، پاشماوەی خەڵکی ناوچەکان دەربەدەرو ئاوارەبوون و زۆربەیان لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێی ناچاریی کران و چی سەروەت و سامانی ناوچەکان هەبوون، تاڵانکران و دەستیان بەسەرداگیرا.

لە ١٨/١٧ی شوباتەوە هێرشەکان دەستیان پێکردو تا ١٩٨٨/٩/١٥ بەردەوام بوون، (سەدام بۆ سەرپەرشتی دوایین قۆناغی ئەنفالی (یەك) هاتبوو بۆ کوردستان، سێ کەس لە لێهاتووترین جەنەراڵەکانی جەیشی عێراق سەرکردایەتی لەشکرکێشی ئەنفالیان دەکرد: (سوڵتان هاشم، نزار خەزرەجی، کامیل ساچیت))[2].

لە درێژەی ئەو ماوەیەدا زیانێکی گەورەی گیانی وماڵی لە خەڵکی کوردستان درا، بۆ نمونە تەنها لە ناوچەی کەرکوکدا:

٥٧٠ هەزار تەن دانەوێڵە سوتێنران.

٤٥٧٧٧ خێزان ئاوارەو بەندو بێ سەروشوێن کران.

٣٩١٧٨ خانوو، ٣٨١ قوتابخانە، ٦٥٧ مزگەوت، ٩ نەخۆشخانە وێرانکران.

٧٨١ گوند سوتێنران.

٤٧٢٧٧٠ سەر مەڕومالاًتو، ١٥ هەزار رەشەولاًخ تالاًنکران.

١٤٣٥ رەزوباخ خاپور کران.

٥٢ عەماراوو ماتۆڕی ئاوو ٤٧ مەکینەی ئاش و ٣١٥ ئەستێل تەقێنرانەوە.

١٥٧ تەکیەو خانەقاو مەرقەدو شوێنەواری ئاینی وێرانکران[3].

لەڕووی زیانەکانەوە بەتایبەتی زیانە مرۆییەکان، کورد زیانێکی یەکجار گەورەی بەرکەوت، بەشێوەیەك کە سەرخانی کۆمەڵو ئابووری خاپورکراو، ژێرخانی ئابووریی و کۆمەلاًیەتیی و سیاسیی و چەکداریی زیانێکی ئەوەندە قورسیان بەرکەوت کە کاریگەرییەکانی تا ئەمڕۆش ماون.

(هێزەکانی رژێمو ئەفواجی دیفاع وەتەنی، هەموو ئەو ناچانەیان بە شەڕ داگیرکردو هەرکەسێکیان بەردەست کەوتبا لە گەورەو بچووك، ژنوپیاو، چەکدارو بێچەك، دەیانگرتو، دڕندایەتی و بەدڕەوشتی گەیشتە ئەوپەڕی، زیاتر لە ١٥٠هەزار کەس بە زیندوویی لە دانیشتوانی گەرمیان گیران و بێسەروشوێن کران، تاوانی جینۆساید لە سنوورێکی فراواندا بەرامبەر بە کورد کرا، لە ئەنجامی ئەو هێرشانەدا زیاتر لە ١٠٠هەزار کەس رووپانکردە ئێران و، دەیان هەزاریش پەنایان بۆ تورکیا برد) [4].

ناوەندە سەرژمێرییەکانی تری ئەنفال لە کوردستاندا ژمارەی ئەنفالکراوەکان بە ١٨٢هەزار کەس باسدەکەن، بەلاًم لیوا روکن وەفیق سامەڕائی سەرۆکی ئەوکاتەی ئیستخباراتی سەربازیی رژێم، ژمارەیان بە لە ٢٠٠هەزار کەس زیاتر باس دەکات، (کورد دەڵێ ژمارەیان ١٨٢هەزارە بەلاًم ئەمە هەڵەیە ژمارەیان پتر لە ٢٠٠هەزار کەسە بەلاًم چارەنووسیان لێڵەو ئەنجامیان نازانم؟!) [5].

دەشێ لێرەوە بپرسین کە بۆچی پرۆسەکانی ئەنفال لە سنووری کەرکوك و گەرمیاندا توندتربوون وەك لە ناوچەکانی دی؟ ئەوەی راستە بوترێت ئەوەیە کە هەرچەندە پرۆسەکانی ئەنفال پلانێکی هەمەناوچەیی و هەمەلایەنەی سەرتاسەریی تەواویان هەڵگرتبوو، مەبەستیان شکاندنی هەر توانایەکی کوردیی بوو لە هەر جێگایەکدا بێت، بەلاًم لەگەڵ ئەوانەشدا بە داگیرکردنی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئینجا بەغداد جورئەتی ئەوەی کرد لە گەرمیاندا درێژە بە ئەنفالەکانی تر بدات.

ئەوەی بەدی دەکرێت لە ئەنفالی گەرمیاندا ئەوەبوو کە پتر لە دووسەدهەزارکەس بێسەروشوێن کران، هەڵبەت ئەمەش جیاوازییەکی هەروا سادە نییەو بەدڵنیاییەوە هەڵکەوتەی جوگرافیی و جۆرو بڕی دانیشتوان و چەندین هۆکاری تریش رۆڵیان لەوەدا بینیوە، من لێرەدا بەشێکی ئەو هۆکارانە دەگەڕێنمەوە بۆ:

یەکەم: ناوچە کوردییەکانی گەرمیان راستەوخۆ هاوسنوورن لەگەڵ ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراقدا، واتە سنووری سەرەکییان ناوچەکانی ناوەندو سنوورێکی دییان کوردستانی داگیرکراوبوو لەلایەن عێراقەوەو سنوورێکی ئێجگار کەمیان لە ئێرانەوە هەبوو، ئەویش لە شەڕی عێراق- ئێراندا لە شەڕگە سەرەکییەکان بوو، سروشتی جوگرافیی جیابوو لە ناوچەکانی کوێستان، بۆیە ئەگەری قوتاربوون بۆ ئەو خەڵکە مەدەنییە بێ دیفاعانەی کورد لەو ناوچانەدا لە سەدا یەك بوو، بەپێچەوانەی ناوچەکانی کە (ی.ن.ك) توانی هەموو سەرکردایەتیی و پێشمەرگەو خەڵکی ئەو ناوچانەش بەرەو رووی سنوورەکان رزگار بکات.

دووهەم: نزیکیی ئەو ناوچانە لە ناوەندو مەترسی بەغدا لە شاڵاوی ئەو خەڵکانەو کاریگەرییان لەسەر دەسەڵاتی خۆی چونکە بەدڵنیاییەوە گەر ئەو دووسەدهەزار کوردەی ئەنفالکران لە شوێنی خۆیاندا بوونایە لەکاتێکی وەك راپەڕیندا ئەوا ئێستا گوشارێکی زیاتر خرابوویە سەر حکومەتی بەغدا.

سێهەم: رقو قینی بەغدا لەخەڵکی ناوچەی گەرمیان کە رۆڵی نەبەردانەیان لەخەباتی درێژخایەنی گەلی کوردستاندا هەبووە.

چوارەم: هەوڵێکی تری بەغدا بووە بۆ کەمکردنەوەی مەترسی لەسەر کەرکوك و کەمکردنەوەی نەژادی کورد لە ناوچە هاوسنوورییەکانی خۆیدا، تا لەوێوە ژمارەکانی خۆی زیادبکات و کوردیش بەرەو ژمارە سفر بەرێت، هەر لەو هۆیانە بەنداوی دەربەندیخان و نزیکی ئەو ناوچانەیە لە سەرچاوە نەوتییەکانی کەرکوك و خانەقین و مەندەلی و ناوچەکانی دی، بۆیە بەغدا لە پێشبینییەکانی خۆیدا وای تۆمارکردبوو کە لە ئایندەدا ئەم ناوچانە دەبنە مەترسی بۆ بەغداو هاوسنووری تارانیش خۆی لەخۆیدا رۆڵی بینی لەوەی گەرمیان ئەنفال بکرێت، چونکە بەغدا دەترسا لەوەی تاران دەسەڵاتی خۆی بێنێتە ناوجەرگەی زەوییە سیاسییەکانی عێراقەوە کە لەوکاتەدا بەدەستیەوە بوون و کەمەری باکووری عێراقیان بەتەواوی دەشکاند.

پێنجەم: زۆرینەی زۆری منداڵو گەنجو پیر، ژنوپیاو لەم ناوچانەدا خەڵکی تێکۆشەرو کوردپەروەربوون، ئەمەش ئەو تێزەی لای بەغدا خوڵقاندبوو کە شتێك نییە لەم ناوچەیە ناوی خەڵکی مەدەنیی بێ‌و لە فەرهەنگی سەربازیی خۆیدا هەموویانی بە چەك بەدەست‌و بە پێشمەرگە ناوزەند کردبوو.

شەشەم: ئەم ناوچەیە کەمتر عەیبەو لاسارییەکانی رژێمی بەغدایان تێدا دەردەکەوت، چونکە لەناو عێراق خۆیدا بوو، وەك وتم سنووریێکی کەمی بە ئێرانەوە هەبوو (ئێرانیش لەودەمەدا شایەتی لێوەرنەدەگیرا) بۆیە بۆ بەغدا گەرمیان ئەو تیکە چەورە بوو کە دەیتوانی بەئاسانی قوتی بدات، لە هەمان کاتدا بەئاسانی هێرشیان بۆ بکات‌و رێ لە دەرچوونی نەك هەر مرۆڤەکان بەڵکو باڵندەکانیش بگرێت. ئەمەش لەلایەك ناوچەکە بکات بە ناوچەیەکی یاساغکراوی داخراوی ئەمنیی بەتاڵکراو لەهەر داینامیکیەتێکی زیندەیی، لەلایەکی تریشەوە وەك کەرەستەیەك بۆ تاقیکردنەوەی دامەزراوە ئەتۆمیی‌و بایۆلۆژیی‌و کیمیاییەکانی خۆی بەکاربهێنێت.

حەوتەم: هەروەها بەغدا دەیویست ئەوە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بسەلمێنێت کە دوای گرتنی سەرکردایەتی شوێنێکیان بۆ ناهێڵێتەوە لە ناوچەکانی کوردستانی عێراقدا، تیایدا درێژە بە خەباتی خۆیان بدەن، چونکە تا ئەو دەمانەش هێزی پێشمەرگەی کوردستان، کوردستانی کردبووە سەنگەری تێکۆشانی خۆی، نەك لە دەرەوەو لە ئوتێلە پێنج ئەستێرەکانەوە باس لە خەبات‌و دژایەتیکردنی بەغدا بکات.

هەشتەم: لێکدابڕاندنی گوندەکان لەیەکترو گوندەکان لە شارەکان یەکێکی تربوو لە مەبەستەکانی ئەنفال، تا لەوێوە ئۆردوگا زۆرەملێکان دروستبکات‌و خەڵکی کورد لە چەند ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراودا گردبکاتەوە، ئەویش چەند مەبەستێکی دی بۆ بەغدا دەهێنایە کایەوە لەوانە: خەڵکی کورد لە کەسێکی بەرهەمهێنەری مولتەزیم بە خاك‌و ئاوی ناوچەکەی خۆیەوە دەگۆڕێ بۆ کەسێکی بەرهەمخۆری نامولتەزیمی نامۆ بەو شوێنەی تیایدا نیشتەجێی قەسری دەکرا.

لەو ناوچە ئامادەکراوانەدا بەغدا لەڕێی دەزگا سیخوڕییەکانی خۆیەوە ئاسانتر دەیتوانی کۆنترۆڵی هەر بزاوتێکی ناو ئەو ئۆردوگایانە بکات‌و بەمەش شوێنەکانی چاودێریکردنی ئەمنیی بۆ خۆی کەمترو ئاسانتر دەکردو لەبەرامبەردا خەڵکی کورد وا بەئاسانی نەیاندەتوانی لە پانتایی گەڕەك‌و ماڵە تێکڕژاوە فرە ناوچەکاندا بڕواو متمانە

بەیەکتر بکەن‌و خۆیان لە کۆمەڵێکی هاوڕای وادا ببیننەوە کە ببێتە ماکی بەگژاچوونەوەو تۆڵەسەندنەوە.

ئەو خەڵکە داگیراوە ئەنفالکراوە قوتاربووە لەو کارەساتە گەورانە بە حوکمی نەمانی زەوی‌و کشتوکاڵ‌و بەرهەم‌و داهاتی خۆیەوە، ناچاردەکرا سەرچاوەی دی بۆ بژێوی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە، لێرەوە زۆربوونی فەوجەکانی دیفاع وەتەنی‌و دیاردەی جاشایەتی پەرەی سەندو بەغدا بەمەش نەوەستا بەڵکو بە جاشەکانی سۆران شەڕی بادینانی دەکردو بە جاشەکانی بادینان شەڕی ئەم ناوچانەی دەکرد، دوور ناڕۆم گەر بڵێم بەشێکی گەورەی ژنانی ئۆردوگا زۆرە ملێکان هەمان پەتای ژنانی ئەڵمانیای سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەم رووی تێکردبوون‌و گەر راپەڕین نەبووایە ئەوا چارەنووسی زۆر رەش چاوەڕوانی تەواوی خەڵکی ئەو ناوچانەو ناوچەکانی دیشی دەکرد[6]. دەمەوێ بڵێم بەغدا بەهەموو شێوەیەك لە هەوڵی تێکدانی بونیاتی بنەڕەتیی تاکی کورددا بوو، بەشێوەیەك کە دووکەسیان نەتوانن لە رایەکدا یەك بگرنەوە، تا لەوێوە کۆمەڵی کوردیی بە شێوەیەك وێران بکات کە ئاسان نەبێت وا بەزوویی چارەسەری بکرێت‌و بینابکرێتەوە.

بەغدا دڵنیابوو لەوەی کە ئەم تاوانانەی وا بە سانایی بۆ ناچێتە سەر بۆیە وردتر ستراتیژی خۆی دادەڕشت‌و بیری لە پیلانەکانی دەکردەوە بەشێوەیەك کە لە نەمانی خۆشیدا گرفتی گەورە بۆ کەسوکارو دامەزراوە حکومیی‌و یاساییەکان دروستبکات، دیارترینی ئەو رەفتارە بەدانەش ئاشکرانەکردنی چارەنووسی ئەو خەڵکە زۆرانە بوو کە تا رۆژگارێکی نزیك چارەنووسیان بە هەڵواسراویی مابۆوەو سەدان گرفتی یاسایی‌و کۆمەڵایەتی گەورەی بۆ خوڵقاندبوون.

### جینۆسایدو ئەنفال:

ئاخۆ جینۆساید چییە؟ پەیوەندی جینۆساید بە کارەساتی ئەنفالەوە چییە؟ جۆرەکانی جینۆساید کامانەن، ئاخۆ کورد تەنها چەند جۆرێکی جینۆساید دوچاری بۆتەوە؟ یان نەتەوەی کورد ئەو لابرۆتۆرییەیە کە چەشنەکانی جینۆسایدی تیا تاقیکراوەتەوە؟

((جینۆساید لە رووی زمانەوانییەوە لە دوو وشە پێکهاتووە:

١- وشەیەکی گریکیی Genos واتە: خێزان، رەگەز، یان جنس یان بنەچە.

٢-وشەیەکی لاتینیی cide واتە کوشتن یان فەوتاندن، کە لە وشەی (occido)ی لاتینییەوە وەرگیراوە بەمانای سەربڕین.

بە لێکدانی هەردوو وشەکە (فەوتاندنی بنەچە) Genocide پێکدێت))[7]، بەکورتی جینۆساید تاوانێکی دڕندانەیە لەدژی مرۆڤایەتیی و لەهەندێ باردا بەزاراوەی (کوشتنی بەکۆمەڵ)یش دێت کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی خەڵك لەناو دەبرێن و دەفەوتێنرێن بێ لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەیان و دەوترێت: (( جینۆساید، وێرانکارییەکی بە ئەنقەست و ڕێکخراوە دژ بە کۆمەڵە خەڵکێك لە سەر بنەمایەکی نیشتمانیی، یان نەتەوەیی، یان ئایینیی، یان نەژادیی)) [8] ، لە پێناسەی نەتەوە یەکگرتووەکانیشدا هاتووە کە (( هەر کردەیەکە بۆ لەناوبردن و وێرانکردنی بەشێك یان هەموو، کۆمەڵێکی مرۆیی ئایینیی، یان نەژادیی، یان رەگەزیی، یان نەتەوەییی و زیانگەیاندنە بە جەستە یان هۆشی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەو وێرانکردنی سروشت و ژینگەکەیانە)) [9] ، یان جینۆساید بەو سیاسەتە دەوترێت کە تیایدا پرۆسەگەلێکی کۆمەڵکوژیی لە دژی دەستەو گروپ و خەڵکە جیاجیاکان بەرپادەکرێت، دژایەتیکردنی نەتەوەیی یان نەژادیی یان ئایینیی یان سیاسیی دەکاتە بنەما بۆ ئەم پرۆسەیە، ئەمەش لە ٩ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ەوە نەتەوەیەکگرتووەکان وەك تاوانێکی نێودەوڵەتیی ناساندویەتیی و لە ساڵی ١٩٥٠دا بیست وڵات ئیمزایان لەسەر کردو لە کانونی دووەمی ١٩٥١ەوە کەوتە باری جێبەجێکردنەوە[10]، ئەم زاراوەیە بەربڵاوییەکی یاسایی و نێودەوڵەتیی زیاتری بیخۆوە بینی ئەوش لەسەر دەستی مافناسی یەهودیی پۆڵۆنیی (رافایل لمکین ١٩٠٠-١٩٥٩)لە ساڵی ١٩٤٣دا[11] و ئەو تاوانانەی نازییەکان لە جەنگی دووەمی جیهانیدا دژ بە نەتەوەکانی تری غەیرە جێرمەنیان کرد، لە زۆر سەرچاوەدا بەسەرەتای بە نێودەوڵەتیکردنی جینۆساید دەزانرێت، هەرچەندە ئەم تاوانی بە کۆمەڵ کوشتنە، بۆ بەر لەم مێژووەیش دەگەڕێتەوە وەك: ئەو قەسابخانەیەی دوچاری دانیشتوانی (میلۆس) بۆوە لە سەر دەستی یۆنانییەکان لە چەرخی پێنجەمی پێش زایینیدا، یان ئەوەی لە دانیشتوانی کەرتی (فاندیەی فەرەنسی) قەوما لە ساڵی ١٧٩٣ز دا، یان ئەوەی دوچاری هیندییەکان بۆوە لە ئەمریکای باکوردا، یاخود ئەو کۆمەڵکوژییەی بەسەر ئەرمەنەکاندا هات لە ساڵی ١٩١٥داو...هتد[12]، هەندێك سەرچاوەی تریش (( هەر هەوڵێك بۆ لەبەینبردن و لێکهەڵوەشاندنەوەو خاپورکردنی دامەزراوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان،

رۆشنبیریی، زمان، هەستی نیشتمانیی، ئاینیی، ژێرخانی ئابوریی، ئاسایشی کەسیی، ئازادیی، تەندروستیی، کەرامەتی خەڵك، ژیانی کەسیی، بە جینۆساید دەزانێت)) [13]، یان بەواتایەکی تر جینۆساید مەبەست لێی ((دەست بەسەراگرتن یان هەوڵدانە بۆ دەست بەسەراگرتنی کۆمەڵێك مرۆڤی دیاریکراوو، تیایدا پرۆسەیەکی لەناوبردنو کوشتنی بەکۆمەڵ یان تەعداکردنێکی سەختو قورس لەسەر هەردوو روکاری جەسەدیو دەروونی، یان ناچارکردنی ئەوکەسانە بەلێك جوودابونەوەو هەڵکەندنیان لە زێدی خۆیان، دەگرێتەوە)) [14].

بەگشتی جینۆساید چوار جۆر لەخۆ دەگرێت، کە بریتین لە [15]:

یەکەم: جینۆسایدی فیزیکیی، یان جەستەیی (بەدەنی): کوشتن بەهەرجۆرێك بێت، ئیعدامکردن، گوللەباران کردن، هێرشی سەربازیو بەکۆمەڵ کوشتنو بەکارهێنانی چەکی قڕکردنی وەکو کیمیاییو فۆسفۆرو ژەهرو زیندەبەچاڵکردنو ... هتد.

دووهەم: جینۆسایدی بایۆلۆژی: بەربەندکردنی هەر کۆمەڵەو مرۆڤێك لەپێشکەوتنو زیادبوون، لەیەك دابڕینی پیاوو ئافرەتو دابەشکردنی کەسانی خێزانی بۆماوەیەکی زۆرو بەزۆر منداڵ لەباربردنو بەزۆر سکپڕکردنی ژنانو هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئاکارە مرۆییەکان بۆ مەبەستێکی دیاریکراو.

سێهەم: جینۆسایدی کەلتووریی و نەتەوەیی: وەکو قەدەغەکردنی زمانو رۆشنبیریی و شێواندنی مێژوو، فەوتاندنی تایبەتمەندێتی نەتەوەیی و نەهێشتنی یەکێتی هاوبەشی نێوان خەڵك، هەروەها وێرانکردنی شوێنەوارە دێرینەکان وەکو روخاندنی پەیکەرو ئەشکەوتو مۆزەو گەڕەكو گەرماوو مزگەوتو کڵێسەو هەموو شوێنەوارێك کە پاشماوەی کۆن یان نوێ بێتو بەرهەمی جۆری ژیانی ئەو خەڵکە بێت.

چوارەم: جینۆسایدی ئابووری: واتە وێرانکردنی سامانو سروشتو بەروبوومی ناوچەکان، تالاَنکردنو فەرهوودکردنیماڵو سامانی خەڵکی.

هەروەها گەمارۆی ئابووری بەمەبەستی برسیکردنی خەڵك، ئەمانە هەموویان دەبنەهۆی نەمانی لەسەرخۆی مرۆڤ.

لەوانیشەوە تاوانەکانی ئیکۆساید (فەوتاندنی ئابووری) و بیۆساید (فەوتاندنو شێواندنی ژینگەو ژیان)و پۆلیتیساید( ئیبادەی سیاسیی)و دیمۆساید(ئیبادەی دیموکراسیی) دەکەوێنەوە [16].

هەر یەك لەم جۆرانەی خوارەوەیش بە کردەی جینۆساید ناسێنراون[17]:

١. رەشەکوژیی و کۆکوژیی.

٢. زیانگیاندنی جەستەیی یان هۆشیی یان دەرونیی بە کۆمەڵە خەڵکێك.

٣. وێرانکردن و خاپورکردنی سروشت و ژینگە.

٤. بەرگرتن لە لەدایکبوون یان بەزۆر منڵبوون و تەعداو ئەتککردن و سکپڕکردنی بەزۆر.

٥. بەزۆر گوێزانەوەی منالآنی شوێنێك بۆ شوێنێکی تر.

٦. یاساغکردنی زمان و کەلتورو...هتد.

پەیوەندی ئەنفال بە جینۆسایدەوە بریتی دەبێت لەو ئالیەتەی بۆ پراکتیزەکردنی پرۆسەی ئەنفال بەسەر کورددا بەکارهێنراوەو ئەو زاراوەیە دەبێت کەدەشێ لێیەوە لەنێو یاسا نێودەوڵەتییەکاندا بەدووی سزاو ئاسەوارو تاوانەکانیدا بگەڕێین، کورد خۆی بۆ خۆی هەموو جۆرەکانی جینۆسایدو لەویشەوە ئیکۆسایدو بیۆسایدو پۆلیتیسایدو دیمۆسایدی بەسەردا هێنراوەو تا ئەمڕۆش مەترسییەکانی لەسەر ژیانی کورد وەکو کۆمەڵێکی مرۆیی درێژەیان هەیە.

هەرچەندە بەپێی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان رێ لە ئەنجامدانی پرۆسەی جینۆساید گیراوە، بەلآم ولآتان کەمتر لەرووکارە سیاسییەکەیەوە مل بۆ بڕیاری لەو شێوەیە دەدەن و مەگەر لەکاتی شەرمەزاربوونی تەواوی ئەو دەسەلآتانەدا ئەو یاسایانە بخرێنەگەڕ کە ئیدی ئەو دەسەلآتە زیانی بۆ سیاسەتی ولآتەکان هەبێت وەك ئەوەی لەلاهایدا بۆ تاوانبارانی شەڕی بۆسنەو کۆسۆڤا دامەزرێنران، یاخود دادگایکردنی سەرانی بەعس لە عیراق دوای پرۆسەی ئازادیی عیراق.

بۆیە لەگەڵ ئەوەی بڕیاری 688 ی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ لەکوردستان و باشوری عیراقدا بڕیارێکی سەرچاوەگرتوو بوو لەبڕیاری پێشووی نەتەوەیەکگرتووەکان و دواتر دوای ئازادکردنی عیراق لە بڕیارەکانی ئەنجەمەنی حوکمدا مادەی ٥٨و لە دەستوری نوێی عیراقیشدا مادەی ١٤٠دانراون، بەلآم تا ئەمڕۆ ئەم بڕیارانە بەباشی جێبەجێ نەکراون.

دیکتاتۆرەکانی دنیا وردتر لەخەڵکە ئازادیخوازەکان نەخشە بۆ پیلانەکانیان دەکێشن، بەشێوەیەك کە بتوانن لەناو شەرعیەتی نێونەتەوەیی و یاساو بنەما

نێودەوڵەتییەکانو بەندەکانی مافی مرۆڤدا تەراتێن بکەنو لەدوو ڕووی تەواو جیای دەرەوەو ناوەوەدا بەرگی کالآ سیاسیو رەفتارە واقعییەکانیان دەربخەن.

لێرەوە لەلایەك کار بۆ ئەوەدەکەن ناسنامەی مرۆڤەکان بەشێوەیەك تاریكو ڕەش بکەنو ئەوە لەلای خەڵکی دەرەوە دروست بکەن کە رەفتارەکانی ئەو دەسەڵاتە سیاسییە دەیانکات تەواو شەرعینو لەپێناو مرۆڤایەتیدان، لەلایەکی تریشەوە هەموو تواناکانی خۆی لەناوەوەدا بۆ کپکردنی خەڵکەکانی خۆی بەگەڕدەخات تا دەنگیان نەگاتە نزیکترین دەلاقەکانی دەرەوەی خۆیان.

ئەمە بۆ ئەوەیە کەبڵێم" بەردەوام دەسەڵاتی مەرکەزیی لە عیراقداو لەو کاتەوەی دەسەڵاتی بەسەر کوردستاندا شکاوە، لەم ناوچەیەدا هەوڵی داوە کورد وەك کەسایەتییەکی لاواز وناوەڕۆکێکی خراپو نەتەوەیەکی بێ ناسنامەو، مرۆڤێکی دواکەوتووی دەمە بەردینەکان باس بکات، ئەمانەش تەنها وەك دروشمێك کاریان لەگەڵدا نەکراوە بەڵکو جۆرەها پیلانو ئامڕازی جێبەجێکردنی بۆ خراوەتەگەڕو هەوڵ دراوە ئەو درۆیە بە واقعێکی تەواو لای خەڵك جێگیر بکات، بەعس خۆی بۆ خۆی تاوانی لەو جۆرەی زۆر کردووە کە سەدەها کاسێتی ڤیدیۆی بە وڵاتاندا بڵاوکردۆتەوەو تیایدا کوردە حەقیقییەکان بە تێکدەرو پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ ناساندووە.

بەکورتی هەموو توانا ئیعلامییو رۆشنبیرییو ئەمنییو سیاسییو سەربازییو کۆمەڵایەتییو ئابووریەکان خراونەتە گەڕ بۆ لەکەدارکردنی کەسێتیی ئەو مرۆڤەی ناوی (کوردە).

ئەوەی دەبێتە خاڵی پەڕینەوە بۆ باسکردنی هەڵوێستی وڵاتە ئیسلامییو عەرەبییەکانو بێدەنگییانو، تەنانەت پشتگیریان لە ئەنفالو لە سەدام حوسەین ئەوەیە کە بەغدا توانیویەتی هەموو دەوڵەتە ئیسلامییو عەرەبییەکان وەك حکومەت بخاتە ژێر کاریگەریی ڕاگەیاندنو هەوڵە چەواشەکارییەکانی خۆیەوەو، ڕاگەیاندنی بەغدا بکات بەو چاوەی کە ئەو وڵاتانە ناوەوەی عیراقی پێ ببینن، بەو شێوەیەی کە بەغدا ویستویەتی نەك بەوشێوەیەی کەخۆی لە واقیعدا هەبووە[18].

وڵاتە ئیسلامییو عەرەبییەکان لەو دەمەدا بووبوون بە سێ کوتلەی سەرەکی، کۆماری ئیسلامیی ئێرانو سوریاو لیبیا، ئەو کوتلەیە بوون کە دژایەتیی بەغدایان دەکرد. کوتلەی دووەم ئەو وڵاتانە بوون کە بەجۆرێك لەجۆرەکان ئیدی (سیاسیی،

سەربازیی، ئابوریی) بێت، هاوپەیمانێتی ستراتیژییان لەگەڵ بەغدادا هەبوو بە نموونەی (میسر، ئوردن، یەمەن، سعودیە، کوەیت، قەتەر، بەحرەین، عومان، میرنشینە عەرەبییەکان، مەغریب، جەزائیر، تونس، تورکیا، وڵاتانی ئاسیا بەهیندو پاکستانو ئەوانی تریشەوە). کوتلەی سێیەم ئەو وڵاتە ئیسلامیی و عەرەبییانە بوون کە یان بە کێشە ناوخۆییەکانی خۆیانەوە خەریك بوونو هەڵوێستی جێگیریان لەبەرامبەر بەغدادا نەبوو، یان نەیان دەپەرژا باس لەسیاسەتی دەرەوەی خۆیان بکەن، وەك (لوبنان، ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، سۆدان، سۆماڵو ...هتد). کوتلەی دووەمو سێیەم دوورو نزیك لەگەڵ بەغدادا دۆستایەتیان هەبوو یان لەگەڵ حکومەتی ئەو دەمەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا ناکۆکیان هەبوو، ئەمەیش وایکردبوو کە بەوجۆرەی لەبەرژەوەندیی ئەو دەمەی ئەواندایە دەقە سیاسییەکان بخوێننەوە، بۆ نموونە:

کۆماری ئیسلامیی ئێران، لەلایەن وڵاتانی کەنداوەوە لەچەند ڕەهەندێکەوە بە مەترسیی سەرەکی دادەنرا بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەوان، ئەویش بەهۆی:

١- لەڕووی مەزهەبییەوە، دەسەڵاتە سوننە مەزهەبەکانی کەنداو تەییارێکی بەهێزی دەسەڵاتداری وەك ئەوەی کۆماری ئیسلامییان بەترسناك دەزانی بەتایبەتی کە لە هەموویاندا بەڕێژەی جیاجیا شیعە مەزهەب هەن. لێرەوە هانی بەغدا دەدراو کۆمەکی دەکراو چاو لەئاستی چەوتییەکانی دادەخرا بۆ ئەوەی ئەو شەڕەی کە (ئەوان پێیان وابوو بەرۆکی ئەوان دەگرێت) بەغدا بیکاتو دەروازەی خۆرهەڵاتی عەرەبییان بۆ بپارێزێت.

٢- کۆماری ئیسلامیی ئێران لەلایەن کەنداوەوە بەمەترسیی دادەنرا بۆ باری ئابوریی و سەرچاوە نەوتییەکانو ئازادیی هاتوچۆی دەریایی بەناو کەنداودا، دیسانەوە خوازیاری کەوتنی ئەو دەسەڵاتەبوون کە دوور لە خواستی ئەمەریکا لەناوچەکەدا ڕەفتاری دەکردو جێی مەترسی بوو بۆ ناوچەکانیان.

٣- گرفتی جوگرافیی زۆر هەبوو لەنێوان تارانو وڵاتانی کەنداودا وەك ئەوەی لە میرنشینە عەرەبیەکاندا هەیە کە تا ئەمڕۆش چارەسەر نەکراوە، بۆیە دەیان ویست هانی بەغدا بدەنو پشت بکەنە هەموو ئەوتاوانانەی بەغدا لەو پێناوەدا دەیانکات.

٤- مەترسی ئەوەیان هەبوو تاران تەسدیری شۆڕشی ئیسلامیی بکات بۆ دەرەوەو لەیەکەم هەنگاویدا ئەو وڵاتانە بگرێتەوە کە بەبێ هێزێکی دەرەکیی ناتوانن بەرگریی سەربازیی لەسەروەرێتیی خۆیان بکەن.

٥- تا ئەو دەمە کەنداو سوپای عیراقیان لە کوەیتدا نەدیبوو تا لەنزیکەوە لە ئاست دڕندایەتیی ئەو سوپایە بگەن بۆیە بەکۆترەکانی ئاشتییان دەزانین.

٦- کەنداو جگە لە کۆمسیۆنە ناوچەییەکانی دی چەندین پرۆسەی وەك ئۆپیكو ئەواپیك بە عیراقیەوە دەبەستنەوە نرخی نەوتیان لەهەر پێشێلکارییەکی مافی مرۆڤ پێ گرنگتربوو، لایان وابوو لەگەڵ حکومەتی عیراقدا دەتوانن ئاسانتر نرخی نەوت جێگیر بکەن وەك لەوەی تەعامول لەگەڵ کورد یان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا بکەن(19).

لەسەر تەوەری تورکیاو بێدەنگی ئەو وەك جیرانێك لەوەی ڕووی دەدا لە کوردستانی عیراقدا:

١-تورکیا ترسی ئەوەی هەبوو تاران بچێتە پەیمانێکی سەربازییەوە لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێتداو زیان بەتوانا سەربازییەکانی ئەو بگەیەنێ.

٢- دیسانەوە تورکیا لەبزواندنی عەلەویەکانی وڵاتەکەی دەترسا دەیویست ڕێ لە مەددی شیعی بگرێت بەهەر نرخێك بووە.

٣- تورکیا لە ستراتیژیدا دژایەتی کورد دەکات بۆیە ئەوەی بەغدا دەیکرد کار ئاسانی بوو بۆ ئایندەی کارەکانی ئەو، جگە لەوەی پەیمانی سەربازیی وەك ئەوەی ساڵی 1984 لەنێوان بەغداو ئەنقەرەدا هەبوو هەرلایەکیان دەتوانن بەقووڵایی 30 کیلۆمەتر بێنە خاکی ئەوی تریانەوە بۆ لێدانی هەر هێزێکی کوردیی لەو ناوچانەدا.

٤-تورکیا وەك لەدەستوورەکەیدا چەسپاوە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ هاتنە سەرکاری هیچ بزووتنەوەیەکی ئاینیدا نییە بۆ سەر کورسی حوکم، لێرەوە ئەوەی بەمەترسی گەورە دەزانی بۆ سیستمی عەلمانیەتی تورکیا.

٥- هەروەها وەك تورکیا وەك پێگەیەکی سەربازی ئەمەریکا بەوردی سیاسەتی ئەمەریکای لەناو پەیوەندییەکانی خۆیدا جێبەجێدەکرد، سیاسەتی ئەمەریکا لەگەڵ بەغدادابوو نەك بەپێچەوانەوە.

وڵاتە عەرەبیو ئیسلامییەکانی تریش زۆربەیان لەناو ڕێکخراوی وڵاتە بێ لایەنەکاندا خۆیان مەڵاس دابوو، هەموویان پشتیوانیان لە بەغدادەکرد چونکە وڵاتێکی کارای (عدم انحیاز) بوو، لەهەمان کاتدا چەکی لە هەردوو بلۆکی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا وەردەگرت،

عیراق دەوڵەتێکی بەهێزبوو لەزۆر رووی بابەتی و زاتییەوە گەشەکردووتربوو لە وڵاتانی (عدم الانحیاز) بۆیە لەلایەك خوازیاری ئەوەبوون بەغدا بشکێت یان لاوازبێت و بەردەوام لەشەڕدا بێت، لەلایەکی ترەوە سەرکەوتنە وەهمیەکانی بەغدا بەسەر تاراندا سەرسامی کردبوون تا ئەو ڕادەیەی ڕوو بەڕوو سەدام حوسەین سەرۆکی دیارترین وڵاتی ئیسلامی و عەرەبی بە (ئەبو جاسم) بانگ بکات و ئەویش بە (سیادة الرئیس) وەڵام بداتەوە...؟؟ [20]

بەغدا لەکاتێکدا ئابلۆقەی ئابوری دەخستە سەر ناوچە سنورییەکانی خۆی لەکوردستاندا، هەر لەوکاتەدا وەك سیاسەتێکی چەواشەکارانە کۆمەکی مرۆیی دەناردە چەندین وڵاتی عەرەبیی و ئیسلامیی، لەوکاتەدا مزگەوت و کەنیسەو مەعبەدەکانی وێران دەکرد لەکوردستاندا، مزگەوتی گەورەی لەبەریتانیاو لەیەمەن و لەچەندین وڵاتی تردا دەکردەوە. لەوکاتەدا کە هەزاران منداڵ و گەنج و پیری ئەم وڵاتەی کیمیاباران دەکرد، باسی لەمافی مرۆڤ و بەرگرتن لەبڵاوبوونەوەی چەکە کۆکوژەکان دەکرد[21].

لەلایەکی ترەوە بوونی کوتلەی سەرەکی وەك ئەمەریکاو سۆڤییەت لە دۆخە سیاسییەکەدا وای کردبوو کە سیاسەتی نێودەوڵەتی نەتوانێت ڕاشکاوانە تەداخول لەو کێشانەدا بکات بەڵکو هەردوولا نا ڕاستەوخۆ کاریان لەسەر تەوەرەکانی خۆیان دەکرد.

لاوازی ڕاگەیاندن و هەوڵە دیبلۆماسیەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی لەو دەمەدا هۆکارێکی تربوو، کورد ژمارەیەکی کەم خەڵکی کارای لە ئەوروپادا هەبوو، کار لەسەر ئاستی وڵاتە ئیسلامیی و عەرەبییەکان نەدەکراو، قەومیەکانی عەرەبیش لە تۆرانیەکانی تورکیا هەڵوێستیان خراپتربوو، سەرهەڵدانی هەربزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کوردیان بەمەترسی دەزانی بۆ ئەو ئوممە عەرەبیەی خۆیان بۆ خۆیان بیست و دوو پارچەو بەرەو ژوورترن. بەشێوەیەك کورد بێدەنگ کرابوو، یان بێدەنگ بوو کەوا واقعیەتی کارەساتەکان لەئاکامیاندا ونکرابوون:

### یەکەم/ کورد لەناوەوە:

١- لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزیدا بەتەواوی کپ کرابوون، سەرکوت کرابوون، دیاردەی دزێو پەرەی پێدرابوو، زۆربەیان سەربازو جاش و پیاوی ڕژێمیان تێکەڵکرابوو، (ترس) وەك بنەمایەکی سەرەکی مراندنی هەر جورئەتێك لەناو خێزان و دامەزراوەکانی

پەروەردەو فێرکردن‌و دەزگاکانی ڕاگەیاندن‌و یاساو دامەزراوەکانی دەوڵەتدا، بەردەوام دووبارە دەکرایەوەو هەمووشیان لەخزمەتی ئەو سیاسەتەدا بوون.

لەهەمان کاتدا دەسەڵاتی کارتۆنی بۆ ناوچە کوردییەکان دانرابوون، لەکاتی هاتنی وەفدی ئەو وڵاتانەدا وەك سووری بەر لەشکر درامای بێزراوییان پێدەکراو، وەك دومیەیەك گەمەیان پێدەکراو وایان دەردەخست کە ئەمانە کوردن‌و دەوڵەت هیچی لەکورد نەکردووە.

بەغدا شارو لادێی لێك دابڕی بوو، خەڵکەکانی لەزانیاری یەکتر پچڕاندبوو، تا ئەو ڕادەیەی کەس بەئاگا نەبێت لەحاڵی کەس، لەیادمە دەیان هەلیکۆپتەر بەڕووی قەراغدا ئەنفالی گەرمیانیان دەکرد، لەهەمان ڕۆژدا سەیرانگاکانی دوکان‌و قەشقۆڵی یەکێکی تری نەدەگرت، کورد لەدوو درامای سەیردا بوو لەزەمەنێکی دیاریکراوی وەك یەکدا لەودیو بەرانانەوە کورد تەفروتونادەکراو لەم دیوەوە کورد سەرچۆپی هەڵپەڕکێ بێزراوەکانی گرتبوو...!

٣- ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەم ناوچانەدا هەموو شتێك دەوترا، کەمێکیان دەنوسران، بەڵام ئالیەتێکی گەورەی وا نەبوو بتوانێت لەودەمەدا ڕای گشتی دەرەوە بەقازانجی دۆزی کورددا هان بدات، ئەمەش تەنها بۆ هۆی مادی‌و مەوزوعی‌و سیاسی کەمتەرخەمی ناگەڕێتەوە بەڵکو خودی ئەو هێزە کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، بووبووە سەرەکیترین ئەو ڕەگەزانەی کە دوژمن دەیویست بەتەواوەتی پەکی بخات‌و لەشەڕی مان‌و نەمانی سەرگۆڕەپانی واقعی ڕووداوەکاندا بوو، واتە خۆی بۆ خۆی بەشێکی گەورەی قوربانیەکانی ئەنفال بوو.

**دووەم/ کورد لەدەرەوە:**

کورد لەدەرەوەی کوردستاندا بۆ تەیاراتی جیاجیاو بۆ خەڵکی جیاجیاو ئایدیای جیاجیادا دابەش بووبوون، زۆرێك لەوانە لە وڵاتە خۆرهەڵاتییەکاندا بوون‌و کەم تا زۆر کەوتبوونە ژێر کاریگەریی سیاسەتی مۆسکۆوەو کەم تا زۆر دۆستی بەغدابوون، کەمێکیان بەخوێندن‌و کاری تایبەتی خۆیانەوە خەریك بوون، هەندێکی تریان خەریکی سیاسەت بوون، بەڵام سیاسەتێکی دۆگما، نەك واقیع بین‌و کورد ویست‌و نەتەوەپەرست.

لە وڵاتە خۆرئاواییەکانیشدا کەم تا زۆر کورد هەبوون، زۆرێکیان لەدەست واقعی ئەو ڕۆژگارە هەڵهاتبوون، سەریان کزکردبوو، دەیانویست بژین، ئەوانی تریش کە سەر بە

تەیارە سیاسییە کاراکان بوون، نەیاندەتوانی وا بەئاسانی دنیا لە نەهامەتیەکانی بگەیەنن، چونکە لەو دەمەدا گوێمان بۆ نەدەگیرا.!!

بەشێکی کەمیش ڕێپێوانی دەکرد، پۆستەری هەڵدەواسی، مانی دەگرت، بەڵام وەڵامی دەست نەدەکەوتەوە.

ڕاگەیاندنی ئیسلامی و عەرەبی و خۆرهەڵاتیەکانیش ئەو دەمانە بە تیۆری دەسەڵات و تیۆری سۆسیالست و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کاریان دەکرد، ئەو ڕاگەیاندنە ڕوو لە ئازادەی ئەمڕۆ دەردەکەوێ ئەو دەمە وجودی نەبوو بۆیە خەڵك تەنها لە زوومی دەسەڵاتەوە هەواڵەکانی وەردەگرت، دەسەڵاتیش لەسیاسەت و بەرژەوەندییە سیاسییەکانیەوە ئەو وێنانەی وێنا دەکرد کە خۆی دەیویست[22]. بەغداو هەموو ئەو وڵاتانەش بەردەوام لە پەیوەندییەکانی خۆیاندا جەختیان لەسەر (عدم التدخل فی الشوؤن الداخلیە)ی یەکتر دەکردەوە بۆیە هەرکەس ئازادبوو چی لە هاوڵاتیانی وڵاتەکەی خۆی بکات!؟!

لەڕێی شەرعیەتدان بەو پیلانانەوە، بەغدا دەهات پشتێنەی ئەمنی دروست دەکرد گوایە لەشەڕدایە لەگەڵ تاراندا، لێرەدا هەزارانی مرۆڤی کورد دەکەوتنە نێو هێڵی سووری سوپای عیراقەوە، دواتر باسی لە تێکدانی ئارامی ناوخۆی وڵاتەکەی دەکردو تاران و دیمەشقی بەوە تاوانبار دەکرد کە هانی خەڵك دەدەن و خەڵك بەکرێ دەگرن تا ئارامی وڵاتەکەی تێك بدەن (ئەوانیش بڕوایان پێدەکرد)، بۆیە هەموویان کەسی لێدەرناکەم وەکو دەوڵەت و حکومەتەکان بێ هەڵوێست بوون، ترسنۆك بوون، بێدەنگ بوون لەئاست کارەساتەکانی گەلی کورددا و تەنها دەیانڕوانیە بەرژەوەندیەکانی خۆیان و هیچی تر. نەك ڕێیان لە بەغدا نەدەگرت بەڵکو هانیان دەدا. لەلایەك کوردیان بەئێرانی باس دەکرد، لەلایەکی ترەوە کوردیان بەجولەکە باس دەکرد، بۆ هەر لێدانێك شەرعیەتێکیان ناشەرعیانە دەدۆزییەوە.

هەرچی وڵاتە گەورەکانی دونیاشە تا ئەو دەمە لە ململانێیەکی گەورەی جەنگی ساردا دەژیان، نەوەکو ساڵی ١٩٩٠ ئەمەریکا یەك لایەنە سیستمی نوێی جیهانی ڕاگەیاندبوو، نەبانگەشەی بۆ (مافی مرۆڤ، ئازادیی، دیموکراسی، بازاڕی ئازاد) دەکرد نە سۆڤیەت لەبەر یەك هەڵوەشابوو، نە بڕیارێکی وەکو ٦٨٨ ی نەتەوەیەکگرتووەکان دەرکرابوو کە بتوانن دەست بخەنە کاروباری وڵاتێکی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا (ئەمە وەك یاسا نێودەوڵەتییەکان) بووبووە مایەی پاکانەکردن بۆ خۆیان، بەڵام وەك

سیاسەت ئەوان بەغدایان دەویست کە ئەو چەکانەی لەکاتی شادا بەجێماون لەشەڕی عیراق–ئێراندا بە تارانی بەتاڵ کەنەوەو، کۆماری ئیسلامی ئێران کە تازە هاتبووە سەرکار بخەنە ژێر فشارەوەو لاوازی بکەنو بەشەڕێکەوە خەریکی بکەنو ڕێ نەدەن پێگەی سیاسیی خۆی لەم ناوچە هەستیارەدا جێگیر بکات، بەمەش ئەمنیەتی کەنداوو بیرەنەوتەکانو چارەنوسی تورکیاش بپارێزن، بۆیە لێرەوە بەهەموو شێوەیەکی ڕەسمیو ناڕەسمی پشتیوانیان لە عیراقو تاوانەکانی بەغدا دەکرد، هەڵبەتە چەندین هۆکاری جەوهەریش هەبوون لەپشت ئەو هەڵوێستانەوە، کە ناکرێ لەمە زیاتر لێرەدا بەدوایاندا بچین. خۆرئاوا بەشێوەیەکی گشتیو ئەمەریکاو بەریتانیاو تاڕادەیەکیش فەرەنسا، لایەنە سیاسییە کوردییە نەیارەکانی بەغدایان بەهەڵگری ئایدۆلۆژیای چەپ ناسیبوو، بۆیە ئەوان لەو دەمەدا نەیاندەویست بەهیچ جۆرێك نەخشەی سیاسی یەکیەتی سۆڤیەتو لەگەڵیدا کوتلەی خۆرهەڵات زیادبکات، هەربۆیە بێدەنگییان لەهەر دەست تێوەردانێك بەباشتر دەزانی[23].

لەلایەکی ترەوە هاوپەیمانێتی ستراتیژی چارەنووسساز لەنێوان ئەو وڵاتانەو ئیسرائیلدا هەیە، هەر لەوێوە ئەمنێتی ئایندەی ئیسرائیل بەوردی لەبەرچاو گیرا، بەوەی ناتوانرێت متمانەی ئەوەبەو کوردانە بکرێت کە لەدوێنێی مێژوودا سەرکردەی وەك سەلاحەدینی ئەیوبی بەرهەم هێنابێت[24].

بەبڕوای تەواوە سەدام حوسەین پاڵەوانی ئەو ڕۆمانە سیاسییە نێودەوڵەتییەبوو کە ساڵانێکی زۆرە دەستی پێکردبوو هێشتا تەواونەبووە، بۆ بەهێزکردنی ئەوو لاوازکردنی دوژمنەکانی ئەو، هێندەی ساوایەك نازی سیاسی دەگیرا، چونکە هەرئەوبوو توانی پەیماننامەی گەروی هرمزی ساڵی 1984 کۆتایی پێ بێنێت و، بەگرتنی کوەیت شەرعیەتی هێنانە ناوەی هێزە سەربازییەکانی ئەمەریکا بۆ کەنداو ئاسان بکات، کە بەر لە گرتنی کوەیت وبەپێی ئەوپەیماننامەیەی1984 تەنانەت هاتنە ناوەوەی چەکی سوکیش بۆ کەنداو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی یاساغ کرابوو[25].

بەغدا کاتێك (فاو)ی لەدەستدا، ئەمەریکاو بەریتانیا لە هەوڵێکی سەربازی گەورەدا توانیان کارێك بکەن فاو لەلایەن بەغداوە بگیرێتەوەو بەوەش کۆتایی بە هەشت ساڵی جەنگ بێت کەسەرەتاکەی بۆ فەوتاندنی چەك و جبەخانەکانی سەردەمی شا دەستی پێکردبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بەرەو هەڵوەشان دەڕۆشت وزانیاری

واهەبووکە توانائەتۆمیەکانی مۆسکۆ بەقاچاغ گەیەنرابێتە تاران، بۆیە بەرلەوەی هەمووچەکە بالیستیو ئەتۆمیەکان بگەنو هاوسەنگی سەربازی بەقازانجی تاراندا بگۆڕێ، کۆمەکێکی سەربازی وایان دا بە بەغدا کە لێیەوە کۆتایی بەشەڕ بێتو بەشی دووەمی ڕۆمانەکە دەست پێ بکات.

**بەکورتیی:**

ئەو دەمانە بۆ کورد، ئەو ڕۆژگارە سەختانەبوو کە کورد تەنها چیاکانی خۆی دۆستایەتییان دەکردو، چیاکانیش بەوە تاوانبار دەکران کە کورد حەشاردەدەن بۆیە وەکو بەشێك لە پرۆسەی کوردایەتی ئەوانیش درابوونە بەر تۆپو تانكو ئاگرو کیمیابارانو گازی فۆسفۆڕییو چەندەها جۆرە چەکی قورسی ترو جەستەی چیاکان هەموویان سوتێنرابوون.

کورد لەنێوان هەردوو بەرداشی عیراقو ئێراندا، بووە زەرەرمەندی یەکەمی ململانێکانو، کورد ئەزموونێکی درێژی لەگەڵ بەڵێنو کۆمەكو سیاسەتەکانی هەردوو بەردا هەبوو، عیراق خۆی بۆخۆی لەم کارەساتەدا بکوژی یەکەم بوو، هەرچی کۆماری ئیسلامی ئێرانیشە لەشەڕێکی قورسدابوو لەگەڵ عێراقداو ئەو دەمە بەهۆی ئەوەی عیراق لەبری هەموو جیهان دوژمنایەتی تارانی دەکرد بۆیە تاران لەلایەن کۆمەڵی نێودەوڵەتییەوە لەو دەمەدا شایەتی لێوەرنەدەگیرا، جگە لەوەش تاران نەیدەویست پانتایی شەڕگەکان لەوە گەورەتربێت، بەکورتیەکەی تارانیش کوردی لەو ڕۆژگارانەدا بۆ ئەوە دەویست کە بەغدا خەریك بکات، یان شەڕی بەغدای بۆ بکات. کورد لەوڕێگە سەختەدا لەنێوان دوو جیرانی وادابوو کە کەسیان لەو شەڕە درێژەشدا ئاسوودەییان بۆ ناوبەندێکی وەکو کورد نەدەویست.

کاك نەوشیروان لەوبارەیەوە دەڵێ: ((دوژمنێکمان هەیە لە دونیادا نموونەی نییە بۆ دڕندایەتیو، دۆستێکمان هەیە لە دونیادا نموونەی نییە بۆ بێوەفایی...)) (26).

نوێنەرە هەمیشەییەکانی ئەنجومەنی ئاسایش لەچانسی کورددا بەهەردوو کوتلەی سەرسەختە خۆرئاواییو خۆرهەڵاتیەکەیەوە بەهەموو نوێنەرانی (ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنساو یەکیەتی سۆڤیەتی ئەوکاتەو، چینەوە) تاوانەکانی بەغدایان بەڕووی ڕای گشتی دونیادا پەردەپۆش دەکرد، هەموویان لەئاست فەوتاندنی گەلێك بێدەنگ بوون

تائەوڕادەیەی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمەریکا بەئاشکراو بیٚ هیچ شەرمێك لەسەر شاشەی CNN دا وای باس دەکرد کە تاران کیمیابارانی هەڵەبجەی کردووە نەك بەغدا، میدیاکانی جیهان لە ئاست کورددا بێدەنگ و لەزۆر باردا کەڕوکوێربوون، وڵاتانی کەنداو تا ئەوکاتە کارەساتێکی وەکو گرتنی کوەیتیان نەدیبوو بۆیە بەغدایان بە پارێزەری دەروازەی خۆرهەڵاتی ئوممەی عەرەبی دەزانی و بە ملیۆنەها دۆلار کۆمەکیان دەکرد.

ئوردن و میسرو یەمەن بە سەرکەوتنە وەهمیەکانی عیراق شاگەشکە بووبوون و پێشبڕکێی ئەوەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد کە کامیان زیاتر سەردانی بەغدا بکەن و کامیان لەگەڵ سەرۆکی عیراقدا هاوپەیمانێتی پێك بهێنن. هەرچی تورکیایە لەنزیکەوە ئاگاداری کارەساتەکان بوو، بەڵام بۆئەو ئەوکارەساتانە ئەو رۆژە پڕ شادیانەبوو کە تیایاندا ئەنقەرە پێی وابوو بەغدا شەڕێکی بۆ دەکات کەدەبوو تورکیا خۆی بیکردایە. لەناو ئەو بێدەنگییە ترسناکەدا سەریان لەلاشەی گەلێك جیادەکردەوە کە لەسەربەخۆیی هەموویاندا قوربانی گەورەی دابوو.

کورد لەنێوان دڕندەی دوژمنەکانی و لەبەردەم خەمساردی دۆستە بێوەفاکانیدا باجێکی مرۆیی ئەوەندە گەورەی دا، کە نەدەبوو کورد هەرگیز ئەو رۆژگارەو ئەجوائەکانی لەبیر بکات.

دەخوازم یادەوەری کارەساتی ئەنفال تەنها دروشمی بریقەداری لیٚنەکەوێتەوە، بەڵکو خوێندنەوەو پیاچوونەوەی نوێی بۆ بکرێت و وانەی مەزنی بۆ ئەمڕۆ و ئایندە لێدەربهێنرێت و، بەرلەهەرشتێکی دیش فشارێکی جەماوەریی، حکومی، حیزبی گەورە بخرێتە سەر نەتەوە یەکگرتووەکان کەلانی کەم قەرەبووی کەس و کارەکانیان بکاتەوە.

## پەراوێزوکان:


١. هەڤاڵ ئەبوبەکر: ئەنفالەکان کێشەی ژمارە یەك/ کوردستانی نویٚ، ژمارە (١٢٦٤– ١٦/٤/١٩٩٦).

٢. نەوشیروان مستەفا: خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤–١٩٨٨، سلێمانی، چاپی دووەم، ١٩٩٩، ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك، ل ١٥١.

٣. زیاد عەبدولرەحمان، تونی مەرگ، کتێبی بەڵگەنامە لەسەر کارەساتی ئەنفال.

٤. خولانەوە لەناو بازنەدا، ل ١٥٢.

٥. ئەنفالەکان کێشەی ژمارە یەك.

٦. رۆژنامەکانی ئەو دەمەی عێراق (الثورة، الجمهورية، القادسية،....هتد).

٧. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki ، د. مارف عومەر گوڵ: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا، چاپی یەکەم، ئەمستردام، هۆڵەندە ١٩٩٧، لە چاپکراوەکانی یانەی کوردی (میدیا)، ل ٩.

٨. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki .

٩. بڕوانە: http://www.unhchr.ch/html/menu3/b/p_genoci.htm

١٠. بڕوانە: http://www. Newsvote.bbc.co.uk.

١١. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki, http://www. Iraqmemory.org.

١٢. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki, http://www. Iraqmemory.org , http://www. Newsvote.bbc.co.uk

١٣. بڕوانە: Raphael Lemkin, Axis Rule in Occupied Europe (Wash., D.C.: Carnegie Endowment for International Peace, 1944), p. 79.

١٤. أحمد عطية الله: القاموس السياسي، دار النهضة العربية، القاهرة، ل ١.

١٥. بڕوانە: د. مارف عومەر گوڵ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها: http://www. Iraqmemory.org

١٦. بڕوانە: هەمان سەرچاوەکانی پێشوو، Journal of Genocide Research.

١٧. بڕوانە: http://www. Newsvote.bbc.co.uk .

١٨. زۆرێك لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو ولاتانە لەو کاتەدا ئەوە دووپات دەکەنەوە.

١٩. محمد صادق الحسيني: بەرنامەی (ضيف وقضية) کەناڵی (الجزيرة) ١٩٩٩.

٢٠. لە یەکێك لە گاردەکانی بازنەی یەکەمی سەرۆکی عێراقەوە وەرگیراوە.

٢١. گۆڤاری (الف با) ژمارەی سالانی ١٩٨٦-١٩٨٩.

٢٢. بابەتێك لەسەر ئازادیی رۆژنامەگەری، بەرنامەی (أكثر من رأي) کەناڵی (الجزيرة)، ٢٠٠٠.

٢٣. راپۆرتێك لەسەر کوردەکان، B.B.C، ١٩٨٤.

٢٤. لە وتەکانی سەرکردەی ئیسرائیلی موشادایان.

٢٥. محمد صادق الحسيني: (ضيف وقضية- قناة الجزيرة).

٢٦. خولانەوە لەناو بازنەدا، ل ١٥١.

# ههشت قۆناغی ئهنفال
# لهماوهی سهدو نهوهدو ههشت ڕۆژدا

عهبدوڵڵا کهریم

له ١٩٨٨/٢/٢١ تا ١٩٨٨/٩/٦ سوپای عێراق لهماوهی ١٩٨ ڕۆژدا بههاوکاری فهوجهکانی خهفیفهی جاش سهراپا ناوچه ئازاد کراوهکانی گرتهوه که لهژێر دهسهڵاتی هێزی پێشمهرگهو شۆڕشدا بوون له(دۆڵی جافایهتی، شارباژێڕ، مهرگه، پشدهر، قهرهداغ، تهواوی گهرمیان، شارهزوور، ههورامان، پێنجوێن، گۆپتهپه، عهسکهر، دهشتی کۆیهو دهشتی ههولێر، بالیسان، باڵهکایهتی، بادینان).

ئهم تراژیدیایه سامناکترین جینۆسایدبوو، هێزی پێشمهرگه بهو توانا دیاریکراوه چیان لهتوانادا بوو کردیان، بهرامبهر بهو سوپا زهبهلاحه وهستانهوه که خاوهنی ههشتاو سی ساڵ جینۆسایدکردنی کورد و ههشت ساڵ شهری ئێران و عیراق، خاوهنی نوێترین چهکی تهکنهلۆژیای عهسکهری بوو بهچهکی کۆکوژی قهدهغه کراوی نێو دهوڵه تیشهوه.

**ئهنفالی یهك بۆ دۆڵی جافایهتی و مهرگه**

سوپای تۆتالیتاری عێراق لهسهر بهرنامهو نهخشهی وردی عهسکهری له ٢١/ ٢/ ١٩٨٨، یهکهم هێرشیان به پاڵپشتی تانك و زرێپۆش و تۆپی حهڤده ملیم و ١٣٠ ملیم، کاتیۆشا و فرۆکهی جهنگی و ههلیکۆپتهر کرده سهر دۆڵی جافایهتی و مهرگه بۆ داگیرکردنی ئهم ناوچه فراوانهو دهزگای ناوهندی راگهیاندن و ئیزگهی دهنگی گهلی کوردستان لهبهرگهڵو بوو، بارهگای سکرتێری گشتی (ی، ن،ك ) و مهکتهبی عهسکهری و چاپخانهی شههید جهعفهر و یهکێتی نوسهرانی کوردستان له یاخسهمهر بوو.

شهڕێکی بهرهیی فراوان به درێژایی ٧٠ کم بهرپا بوو، لیوا (روکن سوڵتان هاشم ئهحمهد) سهرپهریشتی فهیلهقی یهك و پێنج و بیست لیوای فهیلهقهکانی (٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧) و لیوای هێزی تایبهتی (٦٥، ٦٦) سهرکردایهتی گشتی هێزی چهکدار، لیوای

مغاویری فەیلەقی (٢، ٤، ٦) لیوای (١٩، ٣١، ٧٢، ٧٥، ١١٦، ٤٣٨، ٤٤٥) ی فەوجی مغاویری (٤، ٥)ی دەکرد، جگە لە ٣٠ فەوجی موالیدی ١٩٤٥ تەواوی سریەو فەوجی جاشە سوکەکانی کوردستان، ئەم سوپایە چەندان تەن ژەهری کیمیایی تابون و غەردەلیان بەسەر سەنگەری پێشمەرگەو گوندەکانی سەرگەڵو، یاخسەمەر، هەڵەدن، گویزیلە، چۆخماخ، چالآوە، کەرکەر، داباراند.

سوپای عێراق بەو هەموو هێزو تەکنەلۆژیا عەسکەرییەوە لەم قۆڵانەوە هێرشی کردە سەر ناوچەکە لە کۆتەڵەوە بۆ سیروان، چەرەچەتان

و کلکەی پیرە مەگروون، قولە پوسێن، قولە سەوز، هۆمەر قەوم، شەدەڵەو دابان هەلاج، سەرگەڵو، هەڵەدن، یاخسەمەر

لە قەمچوغەوە بۆسارا، سەرمۆدەو قەرەسەد، هازەڵە، فەڵمپاشا، سپی قەرەنگوێ، لەهەنارانەوە بۆ کانی گۆران،پیرکەو قزلەر،لوتکەی چایەر،کونەکۆتر، لەبەڵخەوە بۆ گاپیلۆن، ولآغ و گۆچار و گەرەدێو خەجەلەرزۆك، لە بنگردەوە بۆ کوێرەکان، سپێدەرو دۆڵەبی و هەنجیرەو شارستێن و مەرگەو ئاوەژێی و سیروان و کانی توو، لە ئەزمەرەوە بەرەو شاخی دووبرا، پشتی قەیوان،لە کارێزەوە بەرەو گاپیلۆن، خەجەلەرزۆك.

لەم شەڕە نابەرامبەرەدا هەشت هەزار سەرباز و ئەفسەر کوژران و دوکۆپتەر خرانە خوارەوە و زیاتر لە سەد پێشمەرگە شەهید و بریندار کران.

ژن و پیاو و منداڵ و پیری ئەو گوندانە بۆ خۆ دەربازکردن لە پەلاماری ئەنفالچییەکان لە ڕێگای شاخی کەرکەرەوە خۆیان گەیاندە گۆمەزەڵ دواتر بەناو بەفرو کرێوەی کوێستانەکانی دۆڵی شێخ محەمەدەوە گەیشتنە گەلآڵە، سەفرەی شاناخسێ وسنورەکان، هەندێکیان رویان کردە شارو شارۆچکەکان لە ڕێگا دەسگیرو بێسەرو شوێن کران(١)

هێزی پێشمەرگە لە ٢١/ ٢/ ١٩٨٨ شەرێکی بێوێنەیان رووبەرووی ئەو سوپا زەبەلاحە کردوە لە شەوی ١٧\١٨/ ٣/ ١٩٨٨ کشانەوە بۆ سنورەکان، لە سەعات ١١:٤٥ ی ١٦/ ٣/ ١٩٨٨ فرۆکە جەنگییەکانی عێراق هەڵەبجەیان بۆردومان و کمیا باران کرد، لە ١٩/ ٣/ ١٩٨٨ سەرکردایەتی گشتی عێراق بەلاغی ژمارە ٣٠٨٧ ی دەربارەی سەرکەوتنەکانیان لە سەرگەڵو لە هەموو رۆژنامەکانی عیراق بڵاو کردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

وەکو هەموو داگیر کەرە چاو چنۆکەکان، هیزەکانی خومەینی، زایۆنی پشتیان بە هەندێك لەو کەسانە بەست کە خیانەتیان لە خاکی نشتیمان و خەڵکی باکوری عێراق کرد، ئەوانەی کە خەڵکە کوردە چاکەکانن لە ریزەکانی خۆیانەوە وەدەر نابوو، ئەو کەسانەی کە حزمەتی پڕ لە شەرمەزارییان پێشکەش بە بێگانە کردوە، لە نێو کارە پر لەشەرمەزارییەکانیاندا ئاسانە هێنانە ناوەوەی هێزە داگیر کەرەکان بۆ گوندە سنوورییەکانی هەڵەبجە لە پارێزگای سلێمانی بە دەربڕین لە خواستی میلەتی مەزنی عێراق، هێزە چەکدارە ئازاکان لە گەڵ نیشتیمانیە بەشەرەفەکانی میلەتی کوردمان، لە وەڵامدانەوەی خیانەتی ئەو کۆمەڵە سەرلێشێواوانە، هیزە ئازاکانی بەدر، هیزە ئازاکانی قەمقاع، هێزە ئازاکانی موعتەسەم ئەو هێزانەی کە بە هێزە چەکدارەکانمانەوە لێکنرابوون، لە گەڵ فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی، ئۆپراسیۆنی ئەنفالەکانیان بەسەرپەرشتیکردنی فەریق سوڵتان هاشم کە بە شێوەی کاتی بۆ ئەو کارە دانرابوو سەرەرای ئەوەی کارە ئاساییەکانی خۆی ئەنجامدا هێزەکانمان پەلاماری ئەو یاخیبونانەیان دا کە جەلال تاڵەبانی خائین و دوژمنی عەرەب وکورد، لە ناوچەکانی سەرگەڵو بەرگەڵو و زێویێ و ناوچە سەختەکانی سلێمانی سەرکردایەتی دەکات، ئیمڕۆ لە سەعات دەی پێشنیوەڕۆ دوای شەرێکی تۆڵەسێنانەی ئازا لەگەڵ خائین و کۆمەڵە سەرلیشێواوەکاندا گیران، ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەوانی تریش بەشەرمەزاری رایان کرد، ئەمەش ئازایەتییەکی بێوێنەو راستە قینەیە ئەمە خەباتێکە مایەی تێڕامانی هەموو دنیایە، خەباتی میللەتی سەرکردە سەدام حسێنە، بە عەرەب و کورد کە خۆیان بۆ خزمەتی خاك و نیشتمان تەرخان کردووە و هەموو خۆشەویستی و دڵسۆزی خۆیان پێشکەشی سەرکردە گەورەکەیان کردووە، کە رەمزی سەرکەوتن و سمبوڵی پێشکەوتنیانە، میلەتەکەمان هەموو ئەو خائینانەی لە ناو ریزەکانیدا وەدەر ناوە، کە بەنرخێکی هەرزان خۆیان فرۆشتووە بە دوژمنی چاو چنۆکی بێگانە، سوپاس بۆ خواو بۆ سەرکەوتنەکە، شەرمەزاری بۆ سەر شۆڕان، ئیمزا سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان، ١٩/ مارسی ١٩٨٨ سەرچاوەی(٢).

### ئەنفالی دوو بۆ قەرەداغ

لە شەوی ٢٢\٢٣/ ٣/ ١٩٨٨ سوپای عێراقی بە چەکی تەکنەلۆژیای نوێوەو قورسەوە بەسەرپەرشتی لیوا ڕوکن (ایاد خلیل زەکی) هێرشیان کردە سەر ناوچەی قەرەداخ کە بارەگای یەکێتی نسشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شوعی و بزوتنەوەی ئیسلامی وپاسۆکی، لێبوو، هەمویان لەبەرەی کوردستانیدا یەکیان گرتبووەوە، سوپای تۆتالیتاریی عێراق لەم قۆڵانەوە پەلاماری ناوچەی قەرەداخی دا:

لە گردە سیرو میریاسیەوە بۆ گڵە زەردە و زڕگوێزەڵەو دارەرەش، لە بەرکەلەوە بۆ چەخماخەکان، شاخی گڵەزەرد،لە دەلابەندی خانەوە بۆ سەرگولان، زەردەو تەکییە، بەلەکجار، سێوسێنان، لە شارە زوورەوە بۆ ئاوەکەڵە، شەمەو وێڵەکە، کانی سارد، گولان چرچەقڵە، عەلیاوە، سێوسێنان، مەسۆیی، بەرزەبان، لە ئەلاییەوە بۆ ئالی بزاو، هەنجیرە، بالانجۆ، شیخمەن، دێلیژە، میولێ، خاوێ، قازانقایە، لە چەمچەماڵەوە بۆ دەربەند باسەرە، چەمچەماڵ، لەسەنگاوەوە بۆ هەنارە، کانیباجگە، جەعفەران، قەرەداغ.

ژمارەیەکی زۆر لە ژن و پیاوو منداڵی سێوسێنان بە ژەهری کمیایی گیانیان لە دەستداو بریندار بوون، سامانی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی تالان کران، سەراپا گوندەکانی خاپوور کران، ژمارەیەکی زۆر لە ژن و منداڵ و پیاو پیرو دەسگیرو بێسەرو شوێن کران، سەرکردایەتی سوپای عێراق لە ٢/ ٤/ ١٩٨٨ دا بەلاغی ژمارە ٣١٠٩ لە بارەی سەرکەوتنەکانیان لە ئەنفالی دوو لە رۆژنامەو کەناڵەکانی راگەیاندندا بڵاو کردەوە.

### ئەنفالی سێیەم

سوپای عێراق بە پاڵپشتی جاشە سوکەکانی خەفیفە بە پێی نەخشەو بەرنامەیەکی چڕو پڕی عەسکەری لەم قۆڵانەوە پەلاماری گەرمیانی دا، چەمچەماڵ، سەنگاو، لەیلان، قادرکەرەم، نەوجول، دوزخورماتوو، کفری، سەرقەلا، جەبارە، کەلار، باوەنوور، تیلەکۆ، دەربەندیخان، قەرداغ.

لە دوزخورماتووەوە بەرەو باشتەپەو ئاوەسپی، لە کفرییەوە بەرەو دەراجی، لە کەلارەوە بەرەو تیلەکۆو کوڵە جۆ، لە پێبازەوە بەرەوە شێخ تەویل، لە دەربەندیخانەوە بەرەو تەپە گەردوز، لە قادر کەرەمەوە بەرەو ئیبراهیم غولام، لە قەراغەوە بەرەو درۆزنە، لە قەرەحەسەنەوە بەرەو هەنارەو مەحمود پەریزە، لەلەیلانەوە بەرەو تازە شار، لە سەنگاوەوە بەرەو سەرقەلا.

سوپای تۆتالیتاری عێراق بەسەر پەرشتی عەمید روکن (بارق عەبدوڵا حاجی) لە هەموو قۆڵە جیاجیاکانەوە هێڵێکیان بە چواردەوری گەرمیاندا کێشاو هێرشیان کردە سەر قوڵای گەرمیان،

گەرمیان گرینگترین شوێنی ستراتیژی هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ بوو، لەبەر ئەوەی نزیکترین شوێن بوو لە کۆمپانیای بیرە نەوتەکان، رژێم سڵی زۆریانی لێ دەکردەوە، پشتێنە ئەمنییەکانی دەخستە مەترسییەوە، پێشمەرگەی تیپەکانی بیست و یەکی کەرکوک ٢٨ خاڵخاڵان ٥٧ سەرگرمە ٥١ ی گەرمیان ٥٣ی شێروانە ٩٣ی کۆیە ٨٦ی دەشتی هەولێر، زەبری توندیان لە شوێنە ستراتیژییەکانی رژێم دەدا، جوغرافیای گەرمیان بەستراوەتەوە بە شاری کەرکووک تکریت، دیالە، کە مەڵبەندی سەرەکی مۆڵبوونی هێزی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی و بڕیاردان بوو، لە ئەنفالی سێدا هیشتا هێزی پێشمەرگە لە روبەرووبونەوەی هێرشی ئەنفالی یەك نەگەرابووەوە نیوەی هێزەکان لە دۆڵی جافاتییەوە بۆ سنوور گەرانەوەیان لەو رێگاوبان و بەناو هێزەکانی سوپای عێراقدا کارێکی زەحمەت بوو هێزەکان کاتێ گەیشتنەوە گەرمیان ماندوو بوون دوژمن بەتەواوی ئابولوقەی گەرمیانی دابوو کۆنترۆڵی زۆری شوێنی کردبوو هێزی پێشمەرگە لە هەموو قۆڵەکانەوە چەند ڕۆژێك بەرگری کرد و هەموو هەل و مەرجەکان لە بەرژەوەندی دوژمندا بوون، سوپای عێراق ١٠٠٪ نەخشەو بەرنامەکانی ئەنفالی لە گەرمیان جێبەجێکرد، لە بەرئەوەی گەرمیان دوور بوو لە سنوورەکانەوە دەربازبوون بەناو ئەو هەموو سوپا و جاشەدا زۆر کارێکی دژوار بوو، رژێم سەراپا گوندەکانی سوتاند، لە ٨/ ٤/ ١٩٨٨ بۆ١٠/ ٤/ ١٩٨٨ دوژمن ژمارەیەکی بێشوماری خەڵکی گوندەکانی سەنگاوی لە گوندی قادرکەرم و ئالیاوە و سەرقەڵا کۆ کردەوە لە ١٥/ ٤/ ١٩٨٨ هەموویان گواستەوە بۆ چەمچەماڵ دواتر تۆپزاوەو دبس، ئەمانە دانیشتوانی چوارسەد گوندی سەنگاوو قادر کەرەم و جێگاکانی تر بوون بێسەرو شوێن کران، لە سەعات دەی سەر لەبەیانی ١١/ ٤/ ١٩٨٨ جەماوەری خاوەن هەڵوێستی چەمچەماڵ، گەورەترین خۆپێشاندان و هەڵوێستی پڕ نەمرییان نواند ئەو دەمانە دوژمن ٦٥٠-٧٠٠ ئۆتۆمبێلی سەربازی و پاسی پڕ کردبوو لە ژن و پیاو منداڵی پیری گوندەکانی سنووری سەنگاو و قادر کەرەم لە چەمچەماڵ دەیگواستنەوە بۆ مەعەسکەری تۆبزاوە، چەمچەماڵییەکان شاڵاویان برد بۆ پاسەکان، جامی ئۆتۆمبێلەکانیان شکاند تا

ئەنفالکراوەکان رزگار بکەن، چەند کەسێك توانیان هەڵبێن، چەند کۆپتەرێك بەنزمی بەسەر ئاسمانی چەمچەماڵەوە دەسوڕانەوە دەستڕێژیان لە خۆپێشاندەران کرد بۆ ئەوەی بڵاوەیان پێ بکەن، ئاگاداریان کردن هیچ کەس ئەنفالەکان لە خۆ نەگرێت، لە هەر ماڵێکدا بگیرانایە هەمان چارەنووسیان دەبوو پاشان هەموو ئەنفالکراوەکان بەرەو دۆزەخەکانی ئەنفال برد.

**ئەنفالی چوار**

سوپای تۆتالیتاری عێراق بەسەر پەرشتی عەمید روکن (بارق عەبدوڵا) لە ٢٠/ ٤/ ١٩٨٨ سوپایەکی پڕ لە چەکی قورسی بە پاڵشتی یەکەمی جەنگی هەلی کۆپتەرو جاش ئامادەکرد بۆ سەر ناوچەکانی ئاغجەلەر چەمی رێزان دەشتی کۆیە، تەقتەق قەرە هەنجیر بۆ ئەوەی ئەو ناوچانە ئەنفال بکات، لە ٣/ ٥/ ١٩٨٨ کیمیابارانی (گۆپتەپە و عەسکەرو مایلە سەرچما شێخان، کەڵە شێر چەمی رێزان، قۆجە بلاغ، زەرزیٚ)یان کرد، سپێدەی بەیانی ٤/ ٥/ ٢٩٨٨ سوپای عیراق بەسەر پەرشتی نزار عەبدولکەریم خەزرەجی هێرشیان کردە سەر ناوچەکان، ئەم هێرشانە بە پاڵ پشتی هەلیکۆپتەرو پیلاتۆز لە چەند قۆڵی جیاجیاوە هێرشیان کردە سەر (قەڵاسیۆکە، شوان، شێخ بزێنی، دەشتی کۆیە، دۆڵی بازیان، زەرزی) بەم شێوەیە لە چەمچەماڵەوە بۆ کانی عەرەبان و تلیان و تیژەو مەحمەخان، لە چەمچەماڵەوە بۆ ئاغجەلەرو گۆپتەبەو گەڵناغاج و سەرچنار، لە چەمچەماڵەوە بۆ ئاخجەلەرو دلاوەرو عەسکەر، لە چەمچەماڵەوە بۆ پەلکە رەش و فەقیٚ میرزا، لە تەقتەقەوە بۆ قەرەناوە و کەپەنەك و قەسرۆك و گرتخەبەرو کانی هەنجیرەی برایم ئاغا، لە تەقتەقەوە بۆ شیوە سورو تروکمان باغ و کاریزە، لە تەقتەقەوە بۆ کونەگورگ و باخەهەنجیرو گەرمك و تەکەلتو، لە تەقتەقەوە بۆ مخەرەس و مەلازیادو دەمزیٚ تا گۆمەشین و قزڵو، لە گۆپاڵەوە بۆ سەرچاوەو گانی بی و گەورەدیٚ، لە سوسێوە بۆ شیلە خان و عەودالان و زەرزی و قۆچە بلاغ، لە سوسێوە بۆ سەرد و دڕەنا و چۆمی سورقاشان و، لە دوکانەوە بۆ کلکە سماق و ئیڵەڵاو کانی سورو کلێسەو بۆگدو کانی بی، لە کۆیەوە بۆبامۆرتاکان و شەوگێرو بدجوان‌و ناسرئاغا، لەکۆیەوە بۆ قەیسەری ئاسکی کۆیە، تیمارۆك، دۆندارو پێبازۆك، لە شوانەوە بۆ جۆکان و پاپیلان و گورگان و قەتار، لە شوانەوە بۆ عەلی بەیان و شەوگێری شێخ بزێنی خوارو، لە قەرە هەنجیرەوە بۆ شوانی سەرخاسەو دەلۆ.

لەم نەخشە پڕ دڕتدانەیەدا ژمارەیەکی بێشوماری خەڵکی ئەو گوندانەیان دەستگیر بێسەرو شوێن کرد هەر لەو کاتەدا زێی دوکانیشیان بە خوڕ بەردایەوە تا کەس نەتوانی بپەڕێتەوەو قوتار ببێت.

**ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت**

لە سەعات شەشی بەیانی ٢٤/ ٥/ ١٩٨٨ سوپای ئێراق لە سێ قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر قەڵاتوکان، لە قۆڵی یەکەم لە گردی ڕەمکانەوە، قۆڵی دووەم لە گردی گازێوگورجی کاوی ، قۆڵی سێیەم لە گردی جیقنەوە هێرشیان کرد.

شەڕو پێکدادان لە هەموو قۆڵەکانەوە بەردەوام بوو بۆسەر ناوچەکانی سنووری مەڵبەندی سێ، ئەم هێرشانەی دوژمن لە ٢٤/ ٥/ تا ٣١/ ٨ بەردەوام بوو بۆ سەر قەڵا توکان ڕەزگە – شاخی ئارمۆشە سپیلکی ڕەوەند بنەکاول، هەندرێن، زەینی سەران، کێلی، دۆڵی ئاکۆیان، دەرگەڵە، زێنی سەران، کێلی، دۆڵی ئاکۆیان، دەرگەڵە سەرچاوە، شاخی هەڵە مۆند گەرووی مەنجەڵ، چیا بیتەزحێن، کەپکی حەمەدئاغا، زیارەت، کێل هەریر و گوندی فەقێیان، گوندی گەرەوان.

سوپای عێراق لەم هێرشەدا بە هێرشێکی گەورەی پیادەوە، کەتیبەی تۆپی قورسی دوور هاوێژ و کاتیۆشاو دەیان فڕۆکەی جەنگی و کۆپتەرو دەبابەو مەدرەعەو زەهری کمیاییان بەسەر وەرتێ دا باراند بە هەماهەنگی فەوجە سوسەکان لە ٢٦/ ٨/ ١٩٨٨ دوژمن هێرشی توندی کردە سەر هیزۆپبو بۆ هیران، لە شەقڵاوەوە بۆ هیران، لە دەربەند گۆمە سپانەوە بۆ شاخی سەفین لە سەرچاوەوە بۆ مێرگە سوور و نوسك و بێتوو، لە شاخی ماکۆکەوە بۆ کەژ وست، لە کێلکێلەوە بۆ ڕەشکی لەسەر، لە دۆڵە ڕەقەوە بۆ گەرووی مەنجەڵ، لە خەلیفانەوە بۆ گوندی ئالانە، لە بەنی هەریرەوە بۆ کەپکی حەمەداغە، لە شەکرۆکەوە بۆ شاخەسوور، پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سێی یەکێتی و چەند مەفرەزەو کەرتەکانی مەڵبەندی یەك و دوو لە ناوچەکەدا مانەوە.

لیژنەی ناوچەی کۆیە، شەقڵاوە هەریر، قەرەچوغ، پارتی و مەفرەزەی بارەگای لقی دوو لە دۆڵی بالسان، هیزی شارەزووی حزبی سۆشیالیستی کوردستان، مەفرەزەکانی دەشتی هەولێرو باواجی سۆشیالیست و مەڵبەندی حزبی شویعی عیراق و لەگەڵ پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سلێمانی، حیزبی شیوعی و دوو مەفرەزەی پارتی گەل و هیزێکی بچوکی بزوتەوەی ئیسلامی لە ١٥/ ٥/ ١٩٨٨ فڕۆکەکان کیمیا بارانی گوندی

وەرتێیان کرد، بووبە هۆی خنکاندنی ٢٢ کەس و بریندار بوونی چەندان ژن و پیاو منداڵ و پیر(٣)

هێزی پێشمەرگە لەسەراپا ئەو قۆلانەوە لەماوەی سێ مانگی تەواودا بەرگرییەکی بێوێنەیان کردو لە ١٩٨٨/٣/٣٠ دوژمن هێرشیان کردە سەر کونە کۆتر لە ١٩٨٨/٣/٣١ بە پێی نەخشەیەکی وورد کشانەوە بۆ قەندیل.

**ئەنفالی هەشت**

لە ١٩٨٨/٨/٣١ هەر حەوت زنجیرە ئەنفالەکان لە ماوەی حەوت مانگدا بەسەرپەرشتی علی حەسەن مجید بە پاڵپشتی فەیلەقی یەك و فەیلەقی دوو فەیلەقی پێنج و سوپای عێراق و پەلاماری ناوچەکانی (ئامێدی، ئاکرێ، شێخان، زاخۆ، دهۆك) یان دا.

سنوری جوغرافیای بادینان بەستراوەتەوە بە عێراق، تورکیا، سوریا، وە ئەم سنورە دەستکردە هیچ جۆرە بەربەستێکی سروشتی لە پارچەکانی کوردستانی ئەو وڵاتانەی جیاناکاتەوە، بادینان دەروازەیەکی گرنگ و ستراتیژی هەرێمی کوردستانە، موسوڵمان و مەسیحی و یەزیدی تێدا دەژی، سەرچاوەی داهاتی بەرهەمی کشتوکاڵی و دارستان و ئاوی کانزاییە، دوای پیلانی جەزائیری ١٩٧٥، ڕژێمی تۆتالیتاری عێراق، بە پێی نەخشەیەکی وورد بەرنامەی تەرحیل و تەعریبیان لەم دەڤەرەدا بە چەند قۆناغێك جێبەجێکرد، لە ١٩٨٨/٢/٢١ تا ١٩٨٨/٨/٣١ دوای ئەوەی سوپای عێراق سەراپای گوندەکانی پارێزگای (سلێمانی، کەرکوك، هەولێر) یان بەحەوت قۆناغی ئەنفال خاپور و سوتماك کرد، سامانی خەڵکەکەیان ڕەشبگیرو بێسەرو شوێن کرد، سامانی ئاژەڵداری و کشتوکاڵیان تاڵانکرد، سەراپا ژینگەکەیان ژەربارانکرد کانی و ئاوەکانیان بە شۆفڵ پڕکردووە، سنورەکان و زۆربەی ناوچەکانیان مین ڕێژ کرد، کەلتوری میللی کوردەکانیان سڕییەوە، لە ١٩٨٨/٨/٢٥ سوپای عێراق لەم قۆلانەوە هێرشیان کردە سەر بادینان:

لە زاخۆوە بەرەو گڵناسکێ و چیای بێخێ، لەزاخۆوە بەرەو حەوزی خاپور، لە کانی ماسیەوە بەرەو زیوە،شکاڤ،ئامێدی، ڕەشاوە، لە بیکۆڤەوە بەرەو بەکماڵە،بامەڕنێ و وچیای مەتین، لە باڵیندەوە بەرەو شەمدینان،بیبو ئارتیش، لە باتۆفەوە بەرەو مانگیش و زاویتە، لە سەرسەنگەوە بەرەو مەرگەتێ و چیای گاردا، لە ئەتروشەوە بەرەو سپێدە، لە سوارە توکەوە بەرەوەئەسپیندارو ئاتوش (٤).

(٢٠٠) هەزار سەربازو جاشی سوك بە پاڵپشتی ١٦ فیرقەی عەسکەری فڕۆکەی جەنگی و ئۆکتۆبەرو تۆپی قورس و دوور هاوێژ، شەوی ١٩٨٨/٨/٢٥ لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ناوچەکانی (دهۆك، زاخۆ، ئاکرێ، سمێل، شێخان، ئامێدی) یان دا، لەم پەلامارانەدا زیاتر لە ١٦٠ هەزار کەس سەریان هەڵگرت بۆ سنورەکانی تورکیا و ئێران، لە ئوردگاکانی (موش، دیار بەکر، ماردین، لە تورکیاو ئوردوگای زێوە لە ئێران جێگیربوون، زیاتر لە ١٣ هەزار کەس لەو ڕێگا و بانەکان و لە ناو گوندەکان دەستگیر کران و گوێزرانەوە بۆ قەلاَی نزارکێ لە دهۆك، ژمارەیەك گەنجیان زۆر دڕندانە بە بلۆك کوشت.

لەناو بەڵگە نامە نێودەوڵەتیەکاندا، دیکۆمینتێك بینراوە ناوی ٥٠ گەنجی تیا تۆمار کراوە تەمەنیان لە ١٧ ساڵ کەمترە و گوللە باران کران، ژن و منداڵەکانیش گوێزراونەتەوە ئوردوگای (بەحرکەو جەژنکەو گڕ حوشتر)ی هەولێر بە پێی دیکۆمێنتەکان عەلی حەسەن مەجید ویستویەتی سنوری تورکیا لە خەڵکی بادینان دابخات، بۆئەوەی خەڵکی ئەوێش وەك گەرمیان ڕشبگیرو شوێن بزربکات، بۆئەوەی میدیاکانی جیهان ئاگایان لێ نەبێت، ئەم نەخشەیە سەرکەوتو نەبوو، بەپێی هەندێك سەرچاوەی ناوخۆ سەرپەرشتیاری ئەم بەرنامەیە ئیعدام کراوە، زیاتر لە پێنج هەزار کەس دەستگیر کران بێ سەرو شوێن کران، هەر ئەو کاتانە مام جەلال لە لێدوانێکدا داوای لە ڕێکخراوە خێرخوازەکانی جیهان کرد، بە هانای ئەو پەناهەندانەوە بچن، داوای لە ڕای گشتی جیهان کرد سنورێك بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیای دژی کوردستان دابنێت، هەر ئەو کاتە ڕژێمی عێراق بڕیاری ژمارە ٧٣٦ لە ١٩٨٨/٩/٦ بەناوی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق دەرکرد، لێبوردنێکی گشتی فراوان بوو، هەموو کوردێکی دەگرتەوە تەنیا هەڤاڵ مام جەلال نەبێت.

ئەم لێبوردنە پڕ لە درۆو فڕو فێڵ بوو دەیان خانەوادەو خەڵکی هەڵەبجەو ناوچە جیاجیاکان لە ئێران و تورکیا گەڕانەوە بێ سەرو شوێنکران هەر ئەو کاتە هەواڵی کیمیا بارانکردن و ئەنفالکردنی بادینان وەك هەواڵی کیمیا بارانکردنی هەڵەبجە لە ڕێگای ڕۆژنامە نوسانەوە گەیشتە میدیاکانی جیهان،

ڕژێمی عێراق هەموو تاوانەکانی خستە گەڕ بۆ کۆنترۆڵکردنی سەراپا ئەو دەڤەرەو بێسەرو شوێن کردنی خەڵکەکەی، لەبەر سەختی ناوچەکەو بەربلاَوی شوێنەکان سوپای عێراق نەیانتوانی تەواوی سنورەکان کۆنترۆڵ بکەن.

دەیان هەزار ژن و پیاو منداڵ لە ناوچەکانی گوڵی،سندی، بەرواری ژوری و نێروەی و دێکانی، دۆسکی ژووری مزورعی ژوری کە دەکەونە سەر سنوری تورکیا خۆیان لە تۆڕی ئەنفال قوتار کرد، چەندان ژن و پیاو منداڵ لەبەرواری ژیری، مزوری ژێری، بەڕێگای نزاری، نەهلە زێبارو ناوچەکانی تری سنوری شێخان و ئاکرێ بە بۆردومانی کیمیا بارانی فڕۆکە جەنگیەکانی و کۆپتەرەکانی عێراق گیانیان سپارد، سەدانیان لێدەستگیر کراو لەلایەن فەرماندەی فیرقەی ٢٩ ەوە لە گوندی گوێزی ٩٥ کەس، لە گوندی هەمزا ٤٨ کەس، لە گوندی کەریمە ٣٣ کەس، گوللە باران کران، شەوی ١٩٨٨/٨/٢٣ کۆپتەرەکانی عێراق ٧٠ گوندی بادینانیان کیمیا باران کرد، هەندێك لەو گوندانە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوو، ئەوانی تریش لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوو، دوژمن زیانێکی زۆری لە خەڵکی (ئامێدی ،کانی، گەلی شێروانەدا جگە لەگوندەکانی تیکا،باوەرکە فرێ،برهینی،گلناسکی،مێرگەتوی،سارکێ،زێوەر)و چەندان گوندی تر.

کۆپتەرەکانی عێراق ڕۆژ بەبەردەوامی ژەهربارانی گوندو ناوچە سنوریەکانی کرد، تورکیا دەرگای سنورەکانی داخستبوو، نەیدەکردەوە، تا خەڵکەکە خۆیان لە ژەهر بارانەکە قوتار بکەن، ئەمەش ڕێکەوتنی نهێنی نێوان عێراق و تورکیا بوو، ئەو کاتانە هێزەکانی تورکیاو عێراق دەیان توانی بە قولأی (١٠-١٥)کم سنوری یەکتری ببڕن، سەدان ژن و پیاو منداڵ و پیر خۆیان گەیاندبووە، ئەودیو سنورەکانی عێراق، فڕۆکەکانی عێراق لە ناو خاکی تورکیاش هەر بۆردومانی دەکردن، دواتر ڕژێم پڕو پاگەندەی لێبوردنی گشتی لەناو کامپەکاندا لە ڕێگای تایبەتی نۆکەرەکانیانەوە بلأوکردەوە کەوا (حوکمەت لێبوردنی گشتی دەرکردووە، هەرکەسێ دەگەڕێتەوە دوای پەشیمانی دادی نادات، لەدەست حوکمەت دەرباز نابن، تورکیا تەسلیمی عێراقیان دەکاتەوە، ئەو پڕو پاگەندانە وای لە هەزاران کەس کرد کە ڕووبکەنە ناو ئێران، هەرئەوکاتە وەفدێکی عێراق سەردانی تورکیایان کرد، بۆئەوەی بە خەڵکەکە ڕابگەیەنن بگەڕێنەوە بۆ عێراق، ئەگینا سزا ئەدرێن، خەڵکەکە داواکەیانی ڕەت کردەوە، خۆپیشاندانیان کرد داوایان لە تورکیا کرد کە نابێت ئەو وەفدەی عێراق سەردانیان بکات،.

هەر ئەوکاتە دانیاڵ میتران دۆستی تەنگانەی کورد سەردانی کوردە پەناهەندەکانی ئۆردگای تورکیای کرد، دڵنەوای کردن، چەند بریندارێکی ژەهری کیمیای لەگەڵ خۆیدا برد بۆ فەڕەنسا، بۆئەوەی ڕاستەوخۆ بریندارەکان پیشانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی و

مافی مرۆڤ و کەناڵە جیهانیەکان بدات، کەلوپەلیان بەسەر پەناهەندەکاندا دابەشکرد، داوایان لە تورکیا کرد زیاتر هاوکاری پەناهەندەکان بکات، بواری زیاتریان بۆ ڕۆژنامە نوسانی جیهان ڕەخساند سەردانی مەیدانی کەمپەکان بکەن، ئەو مەرگە ساتە پڕ لە تراژیدیەی بە ژەهری کیمیاییەوە ئەنفال بەتەواوەتی میدیاکانی جیهانی هەژاند.

بەپێی ڕاپۆرتی فەرماندەی فەیلەقی پێنجی عێراق (١٣٣٥٩) پەنجا کەس لەکوردی موسڵمان مەسیحی، یەزیدی، دەزگیرو بێ سەروشوێن کراون سەدان کەسیش گولە باران کران.

عەلی حەسەن مەجید دەڵێ: ئێمە لەهەژدەی شوباتەوە تا چواری ئەیلولی ١٩٨٨ کارێکی جدیمان کرد، تەواوی فەرماندە یەك لەدوای یەکەکانی فەیلەقی یەك و فەیلەقی پێنج، فەریق نزار غەزرەجی سوڵتان هاشمی فەیلەقی یەك و تالع ئەلدوری فەیلەقی پێنج و هەموو ئەمانە لەو فەرماندانەن کەوا لەپلەی ملازمییەوە لەباکووری عێراق خزمەتیان کردوە یەکەم کەس کە هاتبێتە حیزبەوە تالع ئەلدوری بوو، کەوەختی خۆی ئێمە بڕیارماندا گوندەکان بڕوخێنین هێڵی دابەشکردنمان کێشا، ئەمە پێی دەوتری هێڵی سوور لە نێوان ئێمەو تێکدەراندا، یەکەم کەس کە دوا گومانی بۆ من دەربڕی لەبەر دەمی سەرۆکدا تالع ئەلدووری بوو یەکەم کەس کە ئاگاداری کردمەوە ئەو بوو، تا ئەمڕۆ ئەو کاریگەرییەی بەئاشکرا دیارە ئەو گوندانەی نەروخاند کەمن پێم گوت بیان روخێنە، ئەوە هەڵوێستی ئەو کەسەیە کەوا درێژترین تەمەنی لەناو حیزبی بەعسدا هەبوو ئەی کەوایە بۆ خەڵکی تر چۆن بن، چۆن قەناعەتمان پێ بکردایە کێشەی کورد چارەسەر بکەن ,

تێکدەرانیش لە ناو دەبەین بەم جۆرە بە تەلەفیزیۆن کەوتینە پێشاندانی ئەو تێکدەرانەی خۆیان بەدەستەوە دابوو بۆ ئەم فەرماندە پایە بەرزانە باشە دەکرا من هەروا بەسەلامەتی ئەمانە بهێڵمەوە، کەواتە من چیم لەم بزنانە بکردایە من پەیامبێکم لە پیاوە گەورەکان لە باوکەوە (سەدام حسین)وە پێگەیشت، تێیدا دەڵێت چاوت لە خێزانی تێکدەران بێت منیش پەیامەکەم خستە سەر سەرم، بەڵام چۆن چاوم لەوانەوە بێت، غەیر من بە بلدۆزەر دەیانکەم بە ژێر گڵەوە، دواتر داوای ناوی گیراوەکانم لێ دەکەن بۆ بڵاو کردنەوەیان، منیش دەڵێم ئێوە لەسەر تەلە فیزیۆن بینیوتانن لە رۆژنامەدا خوێندوتانەوە ئەی من ئەو خەڵکە بێشومارە لە کوێ بێنم، بۆیە بەسەر پارێزگاکاندا دابەشیان دەکەم ئەو کاتانەش بردۆزەرەکان بەملاو ئەولادا بڵاوە پێدەکەم.

ئەم لێدوانە پڕ لە خۆبایبوونەی عەلی حەسەن مەجید بەڵگەی تەواوی کۆمەڵکوژی و بێسەرو شوێن کردنی ژن و پیاوی گەنج و منداڵی ئەنفالەکانە، کە بەزمانی خۆی لەسەر ئەو نەخشەیە کارە پڕ لە جێنۆسایدەی خۆی دەدوێ کە لە ماوەی ١٩٨ رۆژدا لە هەر هەشت زنجیرەکەی ئەنفالدا ئەنجام درا.

### سەرچاوەکان

١/ژمارە(٤/٣) ی رێبازی نوێ تایبەت بە ئەنفال و کیمیا باران

٢/عێراق و تاوانی جینوساید،شالاوی ئەنفال دژی کورد – رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ – خۆرهەڵاتی ناوەڕاست/ جومال عەزیز لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ل٩٦، ل٩٧

٣/ئەنفال – کورد و دەوڵەتی ئێراق – شۆڕشی حاجی رەسوڵ/ چاپی دووەم/ لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی ٢٠٠٣

# ئەنفال
# گاریگەری لەسەر شوناسی نەتەوەیی

ئاسۆ ئەمین

ئەنفال پرۆسەیەکی سیستماتیزە کراو و تایبەت بوو کە ڕژێمی بەعس بەرامبەر نەتەوەیی کورد لەکوردستانی باشوور ئەنجامی دا. ئەنفال جۆرێکی تایبەتە لەقڕکردن و لەناو بردنی نەتەوەیەك کەئەویش نەتەوەی کوردە، کوردیش یەکێکە لەدێرینترین نەتەوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و تائێستا گەورەترین نەتەوەیە کە نەگەیشتۆتە مافە نەتەوەییەکانی و ئیستاش بەردەوامە لەهەوڵدان بۆپێك هێنانی قەوارەیەکی سەربەخۆی سیاسی. ئەنفال جۆرێکی ترو داهێنانێکی نوێی تر بوو لەلەناو بردن و قڕکردنی نەتەوەیەك کەهەزار ساڵە لەسەر خاکێکی دیاری کراو دەژیو بەزمانێك دەئاخفێت کەجیاوازە لەزمانەکانی دەوروبەری، کەلتورو جۆری ژیانی زۆربەئاشکرا لەنەتەوەکانی دیکەی دەوروبەری و دوونیا جیاوازترە. ئەنفال پرۆسەیەك بوو کەبەعس دەیویست لەریگەیەوە نەتەوەیەك بێ شوناس کات و ئاوێزانیکات و لە نێو نەتەوەی گەورەی عەرەب بیتوێنێتەوە. چونکە ئەوە خەونی لەمێژینەی بەعس بوو. ئەوەی من مەبەستمە لێرەدا تیشك بخەمە سەری ئەوەیە کە ئەنفال وەك دیاردەیەکی نەتەوەیی و هەروەها پرۆسەی ئەنفالو کاریگەری لەسەر لەناوبردنی ئەو بزوتنەوە نەتەوایەتی یەی کەناوی ناسیونالیزمی کوردی یە. هەروەها سەیرکردنی ئەنفال وەك ئەوەی کە لە سەرووی ئایدیای بەعسەوە تەماشا بکرێت و تەفسیری بۆبکرێت. چونکە لەڕاستیدا کەم نین ئەو هێزە توندڕەو عەرەبیانەی کەدوای نەمانی بەعس لەعێراقی پۆست بەعسدا ئامادەگی سیاسی و میلیشیایان هەیە و دەتوانم بڵیم تێڕوانینیان بۆ شتەکان لەبەعس فاشیترە. ئەم هێزانە لەو پەڕی چەپ تائەو پەڕی هێزی دینی توندڕەوی، تێدایە.

## تێڕوانین لە ئەنفال وەك دیاردەیەكی نەتەوەیی

ئەنفال وەك ووتمان پرۆسەیەك بوو دژ بە نەتەوەیەك كە بەنەتەوەی كوورد ناسراوە. واتە ئەم دیاردەیە ڕەهەندێكی نەتەوەیی هەیە، دژ بەئەنجام دانی نەتەوەیەك ئەنجام دراوە، ئەنفال لەهەموو ئەو كارەسات و تراژیدیایانەی تر كە لە عێراقی بەعس و لەعێراقی بەرلە بەعسیشدا ئەنجام دراوە جیاوازترە. چونكە ئەنفال گەر لە ڕویەكی سوسیۆلۆژیەوە سەیری كەین پرۆسەیەكە ئامانج تیایدا پوخت لەناو بردن و قڕكردنی نەتەوەیەك و ئەندامانی نەتەوەیەكی دیاری كراو بووە لەعێراقدا كەئەویش نەتەوەی كووردە. هیچ ڕەگەزو هیچ نەتەوەیەكی دی تیایدا جگە لەكوورد نەبوونە قووربانی. ئەنفال بەشێك نەبوو لە شەڕی نیوان دوو وولاتی وەك ئێران – عێراق. چونكە هەمومان دەزانین دوای وەستانی شەڕی نێوان ئەو دوو وولاتە ئەنفال گەیشتە لوتكە. ڕەنگە ئەوەی من ووتم بەوەی كە ئەنفالم وەك دیاردەیەكی نەتەوەیی ناوبردووە و تیایدا مەبەستی ئەنفالم خستۆتە ڕوو كەمەبەست تیایدا قڕكردنی نەتەوەیەكی وەك كوورد بووە, هەندێك كەس تیایدا بەگومان بن، زیاتر سەلماندنی ئەم قسانەی سەرەو بۆزیاتر بەزانستی و واقیعی كردنی من ئەم پرسیارە دەكەم ئایامەبەست لەئەنفال ئەو پرۆسەیە نەبوو كەبەعس دەیویست ئەو هێزە نەتەوەییە كوردیە كەپێی دەڵێین ناسیونالیزمی كوردی لەناو ببات و هەموو سەرچاوە مرۆیی و ئابوری یەكانی لە ڕەگ و ڕیشە دەربهێنێت و لەناوی بەرێت وەك ئەوەی كەكردی؟ ئامانجی ئەنفال یان ڕوونتر بڵێم ئامانجی بەعس لەئەنفالدا ئەوەنەبوو ناسیونالیزمی كوردی و لادێ و شوێنە كشتوكاڵی و لادێ نشینەكان كە نشینگەی ئەو بزوتنەوەیە بوون تەفرووتونا بكات و تەنانەت تاقە زیندەوەرێكیش نەتوانێت تیایدا بژی؟ ئایا بەعس لەئەنفالدا مەسجێكی سیاسی بە هەموو كورد ڕانەگەیاند كە نابێت كەس لەمەولا بیر لەهەستی نەتەوەیی بكاتەوە؟

بێگومان زۆرێكمان قایلین بەوەی كە بە بەڵێ وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بداتەوە. چونكە لەناو بردنی بزوتنەوەی و نەتەوایەتی نەتەوەیەك یەكسەر جاڕی مەرگی توانەوە و بێ شوناسكردنی ئەو نەتەوەی بەدوادێت (ئەڵبەت مەبەستم لەنەتەوە بەماناسیاسیەكەیەتی). چونكە وەك ئارنست ڕێنان دەڵێت ئەوەی نەتەوە درووست دەكات بزووتنەوە نەتەوایەتی یەكەیەتی (ناسیونالیزمە) نەك بەپێچەوانەوە[1]. ئەو بۆ چوونە هەڵە یە كە دەڵێت دەبێت لەپێشدا نەتەوە درووست بێت پاشان بزوتنەوەكەی لەڕاستیدا درووست پێچەوانەی وی ڕاستە. واتە ئێمە سەرەتا بزوتنەوەیەكی نەتەوەیمان

دەوێت تاوەكو وەك نەتەوە بناسرێین و شوناسمان هەبێت. نەتەوە بەرهەمی ناسیونالیزمە نەك بە پێچەوانەوە. لەڕاستیدا ئەوهێزە خەیاڵی و كەلتوری و دەزگایانەی كەهەموو تاك و گروپ و كۆمەڵە جیاوەزەكان كۆدەكاتەوە و یەك فانتازیایی نەتەوەییان پێدەبەخشێت پێیان دەڵێت ئێوە هەموتان ئەندامی یەك نەتەوەن، ناسیونالیزمە [2]. ئەوەی داوای بونێكی سیاسی لەفۆرمی نەتەوەیەكی خاوەن دەوڵەت دا دەكات بۆ كەلتورێكی تایبەت. ناسیونالیزمە ئەوەی یەك چاوەڕوانی و یەك وێنەی ڕوونی ڕابردوو و یەك شوناس بەئەندامانی نەتەوەیەك دەبەخشێت، بزوتنەوە نەتەوەیەكەیەتی (ناسیونالیزمە). بەكورتی كۆی ئەوشتانەی نەتەوەیەك درووست دەكەن، دەبێت بزاوتێكی ناسیونالیستی پێش وەخت هەبێت و بەرهەمیان بێنێت[3]. ئەوەی من زیاتر مەبەستمە لێرەدا لەچەمكی نەتەوە و ناسیونالیزم لەڕوانگەی ئەو كۆمەڵە فەیلەسووف و تیوریست و سوسیولوجیستانەوە باسی دەكەم كە نەتەوە و درووست بوونی نەتەوە لەفاكتەرە خوودیەكانەوە دەخوێننەوە و لای ئەمان نەتەوە بریتی یە لەڕۆحیەتێكی تایبەت و دیاری كراو، لەبڕیاردانی پێكەوەبوونی سیاسی وئیرادەگەرانە و ویستی پێكەوەژیان. نەك شتێكی پێدراو جێگیر ونەگۆڕ. نەتەوە لەم بۆچونەدا لەسەر بنەمای فاكتەرە بابەتیەكانی وەك زمان و ئابوری هاوبەش و كەلتورو سەر زەمینی هاوبەش درووست نابێت. بەڵكوو نەتەوە لەسەر بنەمای تری وەك ئازار چەشتنی پێكەوەیی و كاری پێكەیی و خەون و هیوای پێكەوەیی درووست دەبێت[4] .

كەواتە ئەنفال ئەگەر پرۆسەی لەناو بردنی نەتەوەیەك نەبیت بەیەكجاری و یەك بەیەكی ئەندامانی ئەو نەتەوە بەشێوەیەكی گشتی. ئەوا هەموومان لەوە دڵنیاین پلانێك بوو كەتیایدا وویسترا ئەو بزوتنەوە نەتەوەكوردیەی كەلە باشوری كوردستان هەبوو بەتەواوی ئاگری بكوژێتەوە و كۆتایی پێبهێنرێت. ئێستا كاتی ئەوەیە بێمە سەر ئەو بەڵگانەی كەئەنفال و ئامانج لەئەنفال لەناو بردنی نەتەوەی کوورد بووە، كەبەعس لەكۆتای سەدەی بیستەمدا ئەنجامی داوە. بەڵام وەك پێشتر باسم كرد ئەنفال ئامانجی لەناو بردنی ئەو بزوتنەوە ناسیونالیزمیە کووردیە بوو كە لە هەر شوێنیك رۆڵی هەبوبێت بەعس لەوشوێنەدا ئەنفالی ئەنجامداوە.

**بەڵگەی یەكەم/** (عەدنان خیراللە) ئەو كاتە وەزیری بەرگری عێراق بووە لەچاوپێكەوتنێكی ڕۆژنامەوانی دا باسی ئەوە دەكات كەناكرێ جیاوازی لەنێوان خەڵكی

مەدەنی و پێشمەرگەدا بکرێت لەکاتی هێرشکردنە سەرناوچەکان، ئەوانەش کەبەر هێرشەکانی ئێمە دەکەون هەموویان کوردن و جلی کوردیان لەبەرە[5].

**بەڵگەی دووەم** /(تاریق عەزیز) وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی عێراق ساڵی 1983 بە بەرپرسێکی نێو بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی ووتبوو. (ئەگەر یارمەتی عێراق بدەن لەدژی ئێران ئەوا هەرگیز لەیادمان ناچێت، بەڵام بەپێچەوانەوە دوایی تەواو بوونی شەڕ لەگەڵ ئێراندا هەمووگوند نشینە کوردەکان وێران دەکەین ) [6].

**بەڵگەی سێ یەم** / رادیویی لەندەن لەپێنجی ئەیلولی ساڵی 1985ڕایگەیاند کە حکومەتی عێراق، ڕاوەستانی شەڕی لەگەڵ ئێران قۆستەوەو سوپا پڕچەك و مۆدێرن و وێرانکەرەکەی لەبەرەکانی شەڕ گواستەوە بەرەو کوردستان. هەروەها ئەوکاتەی بەباشترین کات زانیوە بۆ لەناوبردنی کوردە شاخاویەکان کەلەوشاخانە ماونەتەوە. سەرکردایەتی سوپای عێراق ئەم هێرشە بەربلاٌوەی بەچارەسەری کۆتایی دانابوو بۆ کێشەی نەتەوەیی کورد لەعێرقدا[7].

بەرلەوەی بچمە سەر بەڵگەکانی تر لەم بەڵگانەوە دەمەوێت ڕاستیەك بخەمە ڕوو ئەویش ئەوەیە، کەئەنفال هەرگیزو بەهیچ شێوەیەك بەشێك نەبووە لەشالاٌوی هێرشەکانی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق _ئێران. ئەمە لەلایەك, لەلایەکی تر زۆربەی ئەو سنورانەی ئەنفال تیایدا ئەنجام دراوەناوچەی سنوری شەڕی عێراق _ئێران نەبوون. وەك لەقسەکانی تاریق عەزیز دەردەکەوێت بەرواری ڕوودانی ئەنفال دەکەوێتە دوای وەستانی شەڕی عێراق _ئێران ە وە، وەئەم قسەی تاریق عەزیز بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کەئەنفال شتێکە پێش وەخت بەرنامەی بۆ داڕێژراوەو بیری لێکراوەتەوە.

**بەڵگەی چوارەم**/ (یوست هیلتەرمان) سەبارەت بەپیادەکردنی پرۆسەی ئەنفال بۆچوونی ڕوون و ئاشکرای خۆی هەیە و دەڵێت (ئەنفال خەسڵەتێکی دژەکوردی هەبوو,ناوچە دیاری کراوەکان لەئەنفالدا هەموویان کووردنشین بوون و ناوچە کوردیەکان بوون، ئەوانەی کە لەم ناوچانە گیران و هیچیان بەسەر نەهات و رژێم نەیکوشتن وپەیوەندی بەوەوەنەبوو کەباوەڕپێکراوی ڕژێم بوون یان نا، بەڵکو پەیوەندی بەوە هەبوو کە کوورد نەبون، لەشالاٌوی ئەنفالدا تاکەکسێکی عەرەب نەگیراوە و نەکوژراوە، لەکاتێکدا ئەو گوندانەش کەباوەڕپێکراوی ڕژێم بوون لەگەڵ گوندەکانی تر تێکدران و خەڵکەکەش لەناوبران [8].

**بەڵگەی پێنجەم/** سمیر خلیل (ناوە ڕاستەقینەکەی کەنعان مەکیەیەو نوسەرێکی عەرەبی عێراقەو لەدەرەوەی وولاَت دەژی) چاو پێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی ئەڵمانی (دی تاگس چای تونگ) کردووەو تیایدا باس لەوە دەکات کە (300000_100000) سەد تا سێ سەد هەزار مرۆڤی کورد لەناو بران. زۆربەی لەکاتی شالأوەکانی ئەنفالدا بووە[9].

**بەڵگەی شەشەم/** (دکتور جەبار قادر) دەربارەی ئەنفال دەنوسێت (بەڕای من ئەنفال بۆ کوورد کارەساتێکی نەتەوەیی بوو، کە کردەوەکانی ڕەشەکووژی، قەلاچۆکردن، بەکۆیلە کردنی کوردو تێکدان و وێرانکردنی کوردستان سەر دێرو لاپەڕە ترسناکەکانی بوون)[10].

**بەڵگەی حەوتەم/** (عەلی حسن ئەلمەجید) ئەندازیاری پرۆسەی ئەنفال لەکۆبونەوەیەکدا لەگەڵ ئەندامانی تری حیزبی بەعسدا هەوڵی دەدا کورد ئەوەندە سوك و بێکەڵك پیشان بدا کەهیچ بەزەیی و سۆزێك لەگەڵیاندا نابیت بنوێنرێت کاتێ دەڵێ(ئەم بزنانە چی لێبکەم. ..ئەم تێکدەرانە چۆن لەنێوببەم، بەبلدۆزەر دەیان خەمە ژێر خاکەوە. ..ئەوانەش ئێوە لێیان دەترسان کێیان هەیە شتێ بلێ؟ وا وایان لێدەکەم ئەوانەش والێدەکەم کە گوێیان لێدەگرن. ..پازدە ڕۆژ بەکیمیایی لێبان دەدەم نەك یەك ڕۆژ. وەك مریشکیان لێدەکەم کەجووجەڵەکانی بخاتە ژێر باڵیەوە. بۆرێگەیان بدەم وەك کەر کەهیچ شتێ نازانێ لەوێ بژین؟ گەنمیانم ناوێ کشتوکاڵ و بامیەو تەماتەو خەیاریانم ناوێ، ئێمە داوامان لەمووسڵ کرد کوردەکان ڕەوانەی چیا بکەن باوەك بزن بژین. ژنەکانیان خراپ کەن. سەریان پان دەکەمەوە ئەو سەگانە سەریان دەهاڕم. وەك خەیار لەت لەتیان دەکەم[11].

ئەو حەوت بەڵگەی کەباسم کرد تاڕادەیەك ماناو مەبەستی پشت پرۆسەی ئەنفالی خستە ڕوو. ئەم حەوت بەڵگەی کەباسم کرد تەنانەت مشتێکیش نیە لەخەروارێك و بگرە زۆر زۆر کەمترە. بەلام ئەوەندە بەسە کەئیتر ئێمە ئەنفال وەك دیاردەیەکی نەتەوەیی تەماشای بکەین و شوناسێکی بان حیزبی و بان ناوچەیی پێبدەین و مامەڵەی لەگەڵ بکەین.

ئەوەندە بەسە تاوەکوو ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ ئەنفال مامەڵەیەك بێت لەئاستی مامەڵەکردن لەگەڵی وەك قڕکردنی نەتەوەیەك و ڕیشەکێشکردنی بزوتنەوە نەتەوەیەکەی ئەونەتەوەیە.

**ئەنفال و ناسیونالیزمی کوردی**

دیارە ئەنفال بۆنەتەوەیەکی وەك کورد کارەساتێك و کۆستێکی نەتەوەیی گەورە و حیکایەتێکی نەتەوەیی هاوبەش و گرنگ بوو، ئەگەر بەپێی پێوەرە زانستیەکان بێت کە قیاسی درووست بوونی نەتەوەیان پێدەکرد وەك ئەوی پێشتر باسمان کرد، دەبوو ئەنفال بەهێزترین و تۆکمەترین بوونیادی نەتەوەیی ئێمە بوایە تاوەکوو ئێمە شووناسی سیاسی نەتەوەییمان لێوە داڕشتایەتەوە. شوناسێك کە بۆڕۆژگاری مۆدێرنە گرنگ و بە بایەخەو زۆر بەئاسانی دەمان توانی ئەم کۆستە گەورەو تراژیدیە نەتەوەییەمان گلۆبالیزەکردایە.

بەڵام ئەوەی ئەم خەم و تراژیدیا نەتەوەییە دەخاتە چوارچێوەیەکی سیاسی یەوە و هێماو فۆرمێکی سیاسی پێدەدات ناسیونالیزمە. ناسیونالیزم ترۆپکی هۆشیاری نەتەوەیەك نیشان دەدات لەهەست بەخۆکردن و گرنگی بەخۆدان. ناسیونالیزم دەتوانێت ئەوحیکایەتە ڕۆژانەو سالآنە ی لەنێو ئەندامانی نەتەوەکەی زۆربەئاسانی دابڕێژێتەوەو برەویان پێبدات. بەو مەبەستەی ئینتیمای ئەندامانی ئەونەتەوەیە بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت. ناسیونالیزم دەتوانێت ببێتە ئەو بڵندگۆیەی کە تاکەکانی نەتەوەیەك ئاگادارکات لەحیکایەت و کارەساتەکانی ڕابردووی نەتەوەکەیان و هەروەها ئەو مەترسیانەش کەلەداهاتوودا دێتە ڕێگای ئەو نەتەوە بەڵام ناسیونالیزمی کوردی هەرچەندە بزوتنەوەیەکی مەوزووعی و مێژوو کرد بووە، هەرچەندە تاڕادەیەك تەعبیر بووە لەئیرادەو ئاواتەکانی گەلی کورد لەپێناو بەدیهێنانی مافەنەتەوەیەکانی دا [12].

کەچی ئەم بزوتنەوەیە بەدرێژایی تەمەنی نەیتوانیوە وەك پێویست مامەڵەی واقیعی و زانستی لەگەڵ کارەسات و حیکایەت و خەمەکانی نەتەوەیی کوردا بکات ناسیونالیزمی کوردی بەرامبەر گۆڕان و نوێ بوونەوە و گەشەکردن تووشی جۆرێك لەچەقبەستن و دوگما بووون هاتووە، چەقیوە تەنێو لیتەی دواکەوتووی و نەزانی و جوینەوەی ڕابردووو بەشێوەیەکی کلاسیکیی[13]. قۆناغی خەباتی چەکداری ناسیونالیزمی کووردی لەزۆر ڕووەوە گەڕانەوەیە بۆ سەدی هەژدەو نۆزدەهەم. مێژووی شۆڕشی چەکداری حیزبە بەرهەڵستکارەکان لەشەستەکان بەدوا لەمێژوویی پەیوەندی نێوان ئەمارەتە کووردیەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەچێت. ئەوەی لەم مێژووەدا وونە ئامادەگی ئەو چوارچێوە نەتەوەییە بەر فراوانەیە، کەبتوانێت جیاوازیەکانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی

لەخۆیدا کۆبکاتەوە[14]. ئێمە نەمانتوانی لەسەدەی بیستەمدا نەتەوە نەک بەمانا سیاسیەکەی درووست کەین. بەڵکوو زۆربەی بناغەکانی نەتەوەو شوناسی نەتەویشمان لاوازکردووە[15]، مامەڵە کردنی ناسیونالیزمی کوردی لەگەڵ کۆستە نەتەوەیەکان و بەتایبەت لەگەڵ ئەنفالدا، مامەڵەیەکی یەکگرتوو نەبووە. واتە هەمووومان یەک تێڕوانینمان بۆ ئەنفال نیە تاوەکوو ئەنفال لەو تێڕوانینەوە بخوێننەوە. هەموولا یەک تێروانینیان نیە بۆ داهاتوویەک کەلەسەر ئەنفال بوونیاد بنرێت.

ناسیونالیزمی کوردی نەک لەغیابی هەموو ئەفسانەیەکی نەتەوەی گشتیدا دەژی، بەڵکو لەغیابی هەر چوارچێوەیەکی سیاسی یەگرتووشدا دەژی کەتیایدا هێزە جیاجیاکان مەودای تەعبیر کردنیان وەک بەشی جیاوازی یەک نەتەوەهەبێت[16].

ئەنفال لای ناسیونالیزمی کوردی نەبۆتە پرۆژەیەکی جددی تاوەکو کاری جددی و عەمەلی لەبارەوە بکرێت. ئەنفال لای ناسیونالیزمی کوردی شێوازێکی پچڕ پچڕ و فرەماناو فرە ڕەهەندی بچوکی وەرگرتووە لەسیاسەت و تەفسیرکردنە نەتەوەیەکەی دا. چونکە سەدەی بیستەم سیاسەتی ناسیونالیزمی کوردی سیاسەتی سەدەی نۆزدەو هەژدەو سیاسەتی بەرلە درووستبوونی نەتەوە بووە سیاسەتی یەکسانکردنی نیشتیمان بەماڵی خێڵ و ماڵی حیزب و ماڵی سەرکردە لەسەدەی بیستەمدا لەهەرکاتێکی مێژوو تر لای ئێمە بەهێز ترو هەمەلایەن تر بووە.

لەڕاستیدا ئەنفال لای ناسیونالیزمی کوردی تائێستا نەبۆتە ئەوکاراکتەرەی کەڕۆڵی درووستکردنی شوناسی سیاسی نەتەوەیەکی خاوەن جینوساید و نەتەوەیەک کەهەوڵی قڕکردنی درا بێت. ئەنفال بۆکورد و بۆناسیونالیزمی کوردی دەکرا سەرەتای قۆناغێکی مێژووی نوێ و جەوهەری بێت. ئێمە دەمان توانی لەدوای ئەنفال بناغەیەکی توکمەی بوونیادی نەتەوەیەک دابمەزرێنین، کەزۆر تۆکمەو بەهێزتربێت لەبوونیادەکانی تری درووست بوونی زۆر نەتەوەی تر کە لەسەر چیرۆک وخەیاڵ و ئەفسانە دامەزراون.

ئەنفال، نەتەوەی کوردو ناسیونالیزمی کوردیی لەقۆناغێکەوە گواستەوە بۆ قۆناغێکی جیاوازتر. جیاوازتر لەڕووی سیاسی و مەعریفی و سۆسیولۆژی یەوە، جیاوازتر لەهەموو قۆناغەکانی تری پێش خۆی.

ئەنفال، کوردی وەک نەتەوە لەو بۆچوونەی ئارنست گێڵنەر دەرباز کرد کە دەڵێت (پێویستە زۆر نەچینە بنج و بناوانی نەتەوەوە چونکە هەموو نەتەوەیەک لە بنج وبناواندا

ئەفسانەو خورافیاتە، گەر ئێمەش كارێكی وەها بكەین حەقیقەتی نەتەوە كەشف دەكەین) [17]. ئەنفال شوناسی نەتەوەی كوردی لەوڕیسكە ڕزگاركرد كەگێڵنەر لەدرووست بوونی نەتەوەدا باسی دەكات. بەڵام ئەوەی جێگای مەترسیە و دەكرێت جێگای باسكردن و مشت و مڕو توێژینەوە بێت ئەوەیە كەناسیونالیزمی كوردی هەڵگری گوتارێكی بەهێزو یەكگرتوونیە بەرامبەر ئەنفال و پرۆسەی كورد قڕان. ئەنفال لای ناسیونالیزمی كوردی حیكایەتێكە كە كەمترین جیاوازی نیە لەو حیكایەتە سادانەی كە لەخەیاڵی ئێمەدا ئامادەگی هەیە. بگرە زۆر جار ئەنفالیان كردوە بەو كاراكتەرەی كەزۆر شتی ڕۆژانەی پێ دەشوبهێنن لەكەناڵە راگەیاندنەكانیاندا. سادەكردنەوە و بچوكردنەوەی ئەنفال و هێنانی ئەنفال بۆ ئاستە خوارو بێماناو شت و مەكەكانی ڕۆژانەمان گەورەترین هەڵەیە لەڕووی بەرژەوندی نەتەوەیی یەوە، كارەسات لەوەدایە میدیاكان پشكی گەورەیان هەیە لەوەی كەلەسەرەوە باسمكرد. گەورەترین مەترسی ئەوەیە كەئەنفال تائێستا نەبۆتە خاڵی وەرچەرخان لەمێژووی سیاسی ونەتەوەیی ئێمەدا. تاوەكوئێستا كەمترین خوێندنەوەی زانستیمان بۆ ئەم هۆڵوكۆستی كوردە كردووە. تاوەكووئێستا لەئەنفالمان نە ڕوانیوە وەك ئەوەی چارەنووسی نەتەوەیەكی لەسەر بەندە.

**ئەنفال وەك پرۆژەیەكی پان بەعسیزم**

گەورەترین هەڵە كە دەكرێت تێی بكەوین یاخوود تێی كەوتبین ئەوەیە كەئەنفال بەتەواوی لەبەعس و ئایدۆلۆژیای بەعسەوە بخوێنینەوە و تەفسیری كەین و لێكدانەوەی بۆبكەین و نەیبەستین بەهیچ ڕەهەندێكی كۆمەڵایەتی و ئاینی و سیاسی و ئابووری عێراق بەگشتی و نیشتیمانی عەرەب بەتایبەتی. چونكە بەدوای ئەو هەڵەدا بمانەوێت یان نا یەكسەر دەكەوینە نێو هەڵەیەكی مەعریفی و سۆسیولۆجی ترەوە كەزۆر لەو هەڵەی یەكەم جارمان گەورەترە, چونكە ئەنفال وەك پرۆژەی حیزبی بەعس و ئایدۆلۆژیای بەعس مامەڵە لەگەڵ دەكەین. ڕونتر بڵێم ئەنفال بەهەموو شێوەیەك توند بیبەستین بە بەعسەوە و لەئایدیای بەعسەوە ئەنفال بخوێنینەوە بەتەواوی .

ڕاستە حیزبی بەعس لەو ڕۆژەی چاوی بەدنیا هەلهێنا گرنگی داوە بەبیری ناسیونالیزمی عەرەبی ژیاو(حی) كەڕۆحی عەرەب نوێنەرایەتی دەكات. گرنگی یان داوە بەكەسایەتی و ڕابردووی عەرەب و ڕوحی نەتەوەیی عەرەب. هەروەها گەورەترین

هەوڵیان دا تاوەکو ئاین و ناسیونالیزمی عەرەبی[18] بەشێوەیەك تێکەلاوی یەکتر کەن ، چی کاراکتەری ئەو دوانە هەیە واتێکەلاُو بن. هەرگیز نەناسرێنەوە. زۆر هەوڵیان دەدا تاوەکو کەمینەکانی نێو نیشتیمانی عەرب قڕوقپ کەن بەرامبەر سادەترین داواکاریان. بەلاُم لەگەلْ هەموو ئەوانەشدا کەباسم کرد ئەنفال ڕەگێکی مێژوویی و کۆمەلاُیەتی قوڵی هەیە لەعێراقدا ناکرێت بەڕەهایی بەبەعسەوە ببەسترێت یاخوود تەنانەت بەو ڕژێمانەش کەمیكْ پێش بەعس لەعێراقدا دەرکەوتن. یان ناتوانین بڵێین دووبارە ئەنفال نابێتە پرۆژەی حیزب‌و ئایدۆلۆژیایەکی تر بۆلەناوبردنی شوناسی سیاسی نەتەوەیەك لەعێراقی پوست بەعسدا. کەهەمومان دەزانین لەعێراقی دوای بەعس و دوای صەدام وك چەند جارێك دووبارەم کردوٚتەوە چەندین هێزی ناسیونال و سەلەفی و توندڕەوی عەرەبی پەیدابوون کە بەرامبەر کێشە نەتەوەیەکانمان و پرسی هاولاُتی بوونمان لەعێراقی دوای بەعسدا، لە بەعس توندتر بیر دەکەنەوە و ڕەفتاردەکەن، بۆخویندنەوەی ئەنفال‌و ئەو هۆکارانەی وای کرد کەئەنفال ڕوویدات دەبێت لەپێك هاتەی سوسیولوژیای عێراقەوەدەست پێبکەین. پێویستە مێژووی کۆمەڵگای عێراقی بەدیدێکی سوسیولوژیەوە بخوێنینەوەو ڕاڤەی کەین. تاوەکو کەمترین هەڵە زانستی بکەین لەخوێندنەوەمان بۆ ئەنفال. ئەوەی لەعێراقدا دەبێتە هۆی هەڵهێنا ن و درووست کردنی دەیان هێزو ئایدۆلۆژیای فاشی و ڕەشی تری وەك بەعس, هە موو ئەو بونیادە کۆمەلاُیەتیانەیە کە کۆمەڵگەی عێراقی لەسەر بەندە. دەبێت بۆ ئەنفال کۆمەڵگای عێراقی لەهەموو قۆناغە جیاوەزە مێژوویەکانی بەدیدێکی سوسێولۆژیی یەوە بخوێنینەوە.

گەورە کۆمەڵناسی عێراق (د.علی الوردی) دەڵیت (کاتیْ لەکۆمەڵگەی عێراقی دەکۆلاُمەوەو کۆمەڵگەی عێراقیم تاوتویْ دەکرد, چونکە ماوەیەکی زۆر خولیای بووم. بۆم دەرکەوت ئەگەر لەو ڕووداوانە تێنگەم کەلەڕابردوودا لەعێراق ڕوویانداوەو ئەوڕووداوانەی بەسەر عێراقدا هاتوون. هەرگیز ناتوانم لەباروودۆخی ئێستای عێراق تێبگەم )[19].

وەردی لەو توێژینەوەمەزنەی کەلەسەر کۆمەڵگای عێراق کردی حەقیقەتێکی گەورەی سوسێولۆجی خستە بەردەستمان. ئەویش ئەوەیە کە وەردی پێی وایە کۆمەڵگا دەبێت وەك مرۆڤێکی هەرزەکار لێك بدەینەوە، کەهەنوکە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوشتانەی لەڕابردوودا بەسەری هاتوون ڕەنگە زۆرجار ئەم کاریگەریە نائاگاو لەهەستەوەنەبێت.

بەڵام هەرچۆنێك بێت بوونی هەیە و ڕەنگە مرۆڤ هانبدات هەندێ کاری پروپوچ و بێمانا ئەنجام بدات و لەژێر هاندەرێکی خۆنەویستدایە.

ئەوانەی حوکمی عێراقیان کردووە لەبنەماڵەی هاشمەوە تاوەکوو ڕووخانی بەعس و هەندێك جار هەنوکەش کێشەی نەتەوەی کوردیان لە عێراقدا بەناڕەواو ناهەق زانیوە. بەلای ئەو دەسەلاتە یەك لەدوای یەکانەی عێراقەوە. کیشەی کوردیان بەگەورەترین ریسك داناوە لەهەڕەشەکردن لەنیشتیمانی عەرەب و خاکی عێراق[20]. ئەوەی لەعێراقدا حاکم بووە کوردی بەمەترسی داناوە بۆسەریەکێتی و یەکپارچەیی خاکی عەرەب. کورد لەعێراقدا هەمیشە لەبەردەم پرۆسەی توانەوە و ئاوێزانکردن و بێ شووناسکردن دا بووە، دەسەلآت و دەوڵەتی عێراق هەمیشە لەهەوڵی پیادەکرنی سیاسەتی ئیندیماجیەت دا بوون. خۆئەگەر هەر جووڵانەوە یەك پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە وەستابێتەوە و لەدژی ئەو مەبەستانە خەباتی کردبێت، چارەنووسی ئەوکەسانە بەکووشتن و گرتن و ئەنفال کۆتایی هاتووە.

ئەوەی گرنگە لەکۆتایدا بووترێت ئەوەیە ئێمە ئەنفال وەك پرۆژەیەکی بان بەعسیزم بخوێنینەوە و تەفسیری کەین. ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەنفال نەخەینە نێو چوارچێوەی ئایدیای بەعسەوە و، وابزانین عێراقی دوای بەعس وەك کورد دەڵێ شامی شەریفە. یان لەعێراقی پوست بەعسدا هیچ کەس و ئایدۆلۆژیاو حیزبێکی تری ناسیونالیزم و شۆڤینی زاتی ئەوەی نیە بیر لەلەناوبردنی نەتەوەیەك یان لەسەر کوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیەکەی بکاتەوە.

### ئەنفال و زیندوو هێشتنەوەی دوایی پرۆسەی دادگایکردنی تاوانباران

ئەنفال لەڕابردووی ئێمەدا قوورسایەکی گەورەی جێهێشتوە، هەروەها لەناو فەرهەنگو ڕۆشنبیری و یاداوەریماندا. ئەنفال ڕابردووی ئێمەی زیاتر تراژیدی تر کرد. زیاتر لەوەی کە لەپێش ئەنفالدا هەبوو. ئەنفال لەڕابردوی نەتەوەیی ئێمەدا جێگەیەکی بەنرخی هەیە. کەوابزانم هەرکات بمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوومان مادام ئەنفال هەیە پێویست ناکات هەنگاوی دوور لەنێو ڕابردوومان‌دا بنێین. بەڵکوو دەتوانین هەر یەکسەر لەئەنفالەوە دەست پێبکەین. ئەنفال گرنگترین کەرەستەی دروست کردنی نەتەوەیە بەمانا سیاسیەکەی. نەتەوەیەك کە لەڕۆژگاری مۆدێرنەدا خاوەنی گەورەترین کارەساتە[21] نەتەوەی کورد هەر لەدێر زەمانەوە وەك هەموو نەتەوەیەکی تر خەونی

ئەوەی هەبووە کەتۆڵە لە دووژمنەکانی بکاتەوە ئیتر بەهەرشێوەیەك بێت. هەرکاتێك بۆی لوابێت وەك قوربانیەکی بێ دەسەلأت هەوڵی داوە تۆڵەی خۆی بکاتەوە. هەمیشە بەشێك لەخەونی ناسیونالیزمی کوردی گەڕان بووە بەدوای تۆڵە سەندنەوە لە دووژمنەکانی و سزادانیان[22].

خەون و بیری تۆڵە سەندنەوە لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغیکی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە جیاواز بووە. سەردەمێك هەبووە تۆڵە لەدەرەوەی هەموو یاساو دادگایەك کراوەتەوە بەبێ پارێزەرو بێ هیچ پاراستنێکی یاسایی. بەلأم ئەم شێوازە وورده وورده گۆڕانی بەسەرداهاتووە. گۆڕاوە بۆ داواکردنی تۆڵەیەك کە یاسایی یە و شەرعیەتی لەڕێگای دادگاوە پێدراوە و پارێزەری تایبەتی تێدایە. لێپرسینەوە و تۆڵەکردنەوە لە دوژمنانی نەتەوەی کورد هەمیشە بەشێك بووە لەو مژدە بەردوامەی کەناسیونالیزمی کوردی دەیدا. بەلأم چۆنیەتی داواکردنی ئەم لێپرسینەوە و تۆڵەیە لەڕۆژگاری مۆدێرنەدا و لەسەردەمی مافەکانی مرۆڤ و دادگایی نێونەتەویدا، ئەمانیش شێوازێکی مۆدێرن و ڕێکخراو دەگرنە خۆ[23].

یەك لەو تۆڵەگەورانەی کەنەتەوەیەکی وەك کورد بەدوایی دا دەگەڕا، ئاوات و خەونی لەمێژینەی بوو. لێپرسینەوەی سەرانی بەعس و ئەوانەی بەشداربوون لەئەنفالدا و دەستیان لەسازدانی ئەو دۆزەخەدا بوو بۆ کورد [24].

ئەم تۆڵەو لێپرسینەوەیە زیاتر ڕەهەندێکی سایکۆلۆژی وەرگرتووە و جۆرێکە لەئارامی بەخشین بەهەریەکێکمان. هەروەها یەکیك بوو لەو مژدەی کەبەردەوام ناسیونالیزمی کووردی پێمانی دەدا[25].

پرۆسەی قڕکردنی کورد لەئەنفالدا ئەتوانم بڵێم لە مێژووی عێراقدا لەکۆن و نوێشدا هاوشانی نیە. لەچاڵ نان و بێسەروشوێن کردنی زیاتر لە سەد هەزار مرۆڤی کورد لەساتێکی دیاریکراو کورتدا. جیاوازترە لەهەموو تراژیدیاو کارەساتەکانی نێو ولأتێکی دروستکراوی وەك عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕیزبەندی ئەوتاوانانەی کەسەرانی بەعس لەسەری دادگایی دەکرێت، تاوانی ئەنفال دەچێتە نێو ڕیزبەندی تاوانەکانی ترەوە کە هەندێکیان هێندە بچوکن لەچاو ئەنفالدا کە هەربەراورد ناکرێت. سەرەڕای ئەوەش ئەنفال لەم ڕیزبەندیەدا پلەی دووەمی وەرگرتووە. ئەمە خۆی لەخۆیدا جگە لە بچوکردنەوەی کەیسێکی گەورەی نەتەوەیی وەك ئەنفال کەهاوشانی نیە هیچی تری بۆ

ئێمە لێچاوەڕوان ناکرێت. حساب نەکردنە بۆ ئەنفال وەك ئەوەی پرۆسەی قڕکردنی نەتەوەیەکە[26]، دادگایکردنی تاوانباران لەسەر ئەنفال زیاتر کێشەکە بچوك دەکاتەوە، چونکە هەم داد وەرو هەم پارێزەرو هەم شکات کارانیش، ئەوەندە بەشتی لاوەکیەوە خەریکن ئەوندە دەچنە نێو شتە بچووکەکانەوە. ئەوەندە گرنگی بەکێشەکەنادەن وەك ئەوەی کێشەیەکی سیاسیو نەتەوەییەو نیەتو ئامانج تیایدا قڕکردنی ئەندامانی نەتەوەیەکە. خەم ساردی ئەوکەس و لایەنە کوردیانەی کەشکاتکارانو پارێزەران دەنێرنە نێو ئەو دادگایەوە. بەوەی دەبوایە هەم پارێزەران و هەم شکاتکاران پرسیاری گرنگ گرنگیان سەبارەت بەئەنفال و نیەت و مەرام و ئامانجی ئەنفال بخاستایەتە ڕوو, دەبوو بپرسرایە ئەم کوورد قڕانە بۆ ناوی ئەنفالی لێنرا؟، بۆچی لەئەنفالدا هەوڵی لەناو بردنی هەموو ڕەهەندە ژیاری و شارستانیەکانی کوردستان دراوە. یان بۆچی بەعس وویستبووی لەئەنفالدا کورد بەکافرو جولەکەو بێ دین بەدوونیای دەرەوە بناسرێت؟ ئەمانەو چەندان پرسیاری تر کەدەبوو لەبری داوای قەرەبووکردنەوەی ماڵ و سامان لێرەوە پرسیاری سیاسیو نەتەوەیی ڕووبەرووی ئەنفالچیان بکرایەتەوە.[27] دەبوو کەسو کاری ئەنفالەکان هێندە لەلایەن دەسەلأتی کوردیەوە قەربوی ماددیو مەعنەوی بکرانایەتەوە کەبەهیچ شێوەیەك ئەو داواکارییە بچوکانە یان لەو دادگایەدا نەخستایەتە ڕوو.

دادگایی کردنی سەرانی بەعس لەعێراقدا و بەقانونی دادگایی عیراقی زۆرکاری لەبچوکردنەوەی کەیسی ئەنفالکردووە و وەك لەوەی ئەنفال لەدادگایەکی گەورەی نێونەتەوەیی دا بخرایەتەڕوو باسکرایە[28].ئەوەی زۆرجێگەی مەترسی و ناخۆشە دەرەنجامەکانی دوایی دادگایی کردنی ئەنفالە. چونکە هەر پرۆسەی دادگای ئەنفال کۆتایی هاتو بەرپرسانی ئەنفال سزای خۆیان وەرگرت. ئیتر وەك چۆن ئەنفال لەدادگادا دەپێچرێتەوە ودەچێتەنێو ئەرشیف بەهەمان شێوەش ئەم کارەساتە نەتەوەیی یە لەیاداوەری ئێمەی کوردا دابخرێت و وابزانین هەمووشت تەواو بوەو گەشتوەتە کەناری ئارامیو داوای ڕەوای خۆمان وەرگرتووە[29]. بۆیە ئەگەر دادگایی کردنی ئەنفال لەسەرێکەوەو لەڕووی سایکولوژیەوە جۆرێك لەئارامی مان بۆبێت، ئەوا لەسەر ئاستی نەتەوەییو پرۆژەی سیاسی نەتەوەیماندا ڕەنگە زەرەرو زیانی گەورەی لێمان دابێت بۆیە دەبێت بەشێك لەکاری سیاسیو میدیای کوردی ئەوەبێت کار بۆ بەرزراگرتن و

زیندوو هێشتنەوەی ئەوکۆستە نەتەوەییە بکات بەتایبەت دوایی ئەم دادگایە و حوکمدانی تاوانباران لەسەر دۆسیەی ئەنفال[30].

**ئەنفال و جیهانگیری**

ئەنفال هەنگاوی یەکەمی کۆنترۆڵکردن و دیسپلینکردنی سەرتاسەری هەموو کۆمەڵگای ئێمە بوو، وێرانکردنی لادێکانی کوردستان کەستراتیژی سەرەکی ئەنفال بوو، وێرانکردنی هەموو ئەوتوانایانەی کە کومەڵگای ئێمە بۆ خۆپارێزگاری و خۆژیاندن لەبەردەمی دا بوو[31] ئەوەی سەرەوە بەشێك بوو لەڕاڤە و تەفسیرکردنی ئەنفال بەلاَم ئەوەی گرنگە لێرەدا بیخەینە ڕوو ئەوەیە، کەمێك تیشك بخەینە سەر ئەو پرۆسەی کەئەمڕۆجیهانی گرتۆتەوە و بەجیهانگیری ناسراوەو پەیوەندی ئەنفال بەجیهانگیر یەوە، قسەکردن لەسەر ئەوەی کە چۆن ئێمە وەك نەتەوەی کورد بچینە نێو جیهانگیرییەوە بەهۆی ئەنفالەوە.

بەبیَ ئەوەی سروشتێکی ئەفسانەیی بەپرۆسەی بەجیهانی بوون بدەین. دەتوانین بڵێین ئەو جیهانەی چارەکە سەدەیەك لەمەوبەر لەئارادا بوە. زۆر جیاوازە لەو جیهانەی ئێستا تیایدا دەژین. ئەم جیاوازیە تەنها لەئامادەگی ئەو توانا گەورەیەی پەیوەندی کردن و جوڵەو گەشەکردنی تەکنۆلۆژیادا بەرجەستەنیە. بەڵکوو ئەم ئامادەگیە لەئاستی سیاسیو ئابووریو کەلتوریو سەرلەنویَ داڕشتنەوەی نەخشەی جێپۆلەتیکی جیهانیشدا زۆر گەورە دەبینرێت[32].

چەمکی بەجیهانی بوون چەمکێکی ئاڵۆزە و لەزۆرێك لەزانستە کۆمەلاَیەتیەکاندا لێکۆڵینەوەو باسو لێدوانی تایبەتی لەسەرکراوە. لەگەلَ ئەوەشدا یەکێکە لەئاڵۆزترینو پڕکێشەترین چەمك.

جیهانگیری پرۆسەیەکی بەرفروانی بەرهەم هێنانی جیاوازی ڕێژەیبوونە. جیهانگیری ئەو حەقیقەتە بۆتاكو بۆ گروپو بۆ کۆمەڵگاکان ئاشکرا دەکات، ئەویش ئەوەیە کەجیهان زۆر گەورەترە لەودنیابینیەی کەئێمە بەهۆی ئەو کەلتورو ئاینو ژینگە داخراوەی دەوروبەرمان بۆمان درووست بووە.

پرۆسەی جیهانگیری پرۆسەیەکی هەمەلایەنەو گشتگیرە، هەڵەیەکی مەعریفی گەورە دەکەین ئەگەر پێمان وابێت تەنها بەهۆی بەرهەمو کالاَو بازرگانیەوەو بەهۆی ئابووریەکی بەهێزەوە دەتوانین بچینە نێو پرۆسەی جیهانگیریەوە. ئەوەی بەجیهانی دەبێت تەنها

کالاَو بەرهەمی بازرگانی نیە. بەڵکوو زمان و فەرهەنگ و سیاسەت و ئایدۆلۆژیاو کەلتوورو شتی ترە. ئەوەی ڕۆڵی گرنگ لەم پرۆسەی بەجیهانی بوونەدا دەگێرێت بوونی دەزگای ڕاگەیاندن و میدیاکانە. کەلەڕێگەی ئەمانەوە سنورەکان ببەزێنرێن. ڕاستە ولاَتە پیشەسازیە زلهێزەکان ئاسانترو زوتر چونەتە نێو پرۆسەی جیهانگیریەوە پشکی گەورەیان لەم پرۆسەیەداهەیە، بەهۆی ئەو کالاَو بەرهەمانەی کەدەیخانە نێو بازاڕەکانەوەو هەیمەنەو مانۆڕی ئابوری خۆیان بەهۆی گلۆبالیزاسیونەوە مانێفیست دەکەن. بەلاَم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت نەتەوەو ولاَتانی تر ناتوانن بێنە نێو ئەم پرۆسەیەوەو یاخوود شتێك نیە تاوەکوو لەم پرۆسەیەدا بیخەنە ڕوو.

جیهانگیری دەسکاری کۆی بونیادەکۆمەلاَیەتیەکانی کۆمەڵگاکان دەکاتو دەیانگۆڕێت، هەم بونیادی دینیو هەم بوونیادی ئابووری و هەموونیادەکانی تر کەکۆمەڵگا یان نەتەوەیان لەسەر بەندە لەڕۆژگاری گلۆبالیزاسیوندا دەکەونە ژێر پرسیاری قوڵ و گەورەو گرانەوە.

ڕەنگە بپرسرێت کورد وەك نەتەوەیەکی ژێر دەست و داگیر کراو چی هەیە تاوەکو گڵۆبالیزەی کات یاخوود ئێمە چی مان هەیە تاوەکوو پێی بچینە نێو جیهانگیریەوەو لەوێدا مانیفێستی کەین؟ یان هەندێکمان زۆر ڕەشبینانە دەڕوانین بو ئەم بابەتەو پێمان وایە ئەگەر هەموونەتەوەو ولاَتێك بچێتە نێو پرۆسەی جیهانگیریەوە، کورد ناتوانێت بچێتە ناوییەوە و بەشداربێت, وەك ئەوەی بکەربێت لەم پرۆسەیەدا .

ئەم بۆ چوونە کەم تازۆر بۆچونێکی هەڵەیە چونکە نەتەوەی کورد چەندین کۆستو حیکایەتی تراژیدی لەسەدەی بیستەمدا هەیەو خاوەنی یەتی، تاوەکوو پێی بچێتە نێو گلوبالیزاسیونەوە پێیانەوە بناسرێت. هەڵەی مەعریفی ئەم جۆرە بیرکردنەوانەو تێڕوانینانە لەوێوە دەست پێدەکات کەتێڕوانێکی پوخت ئابووری هەیەو هەیمەنەی هەیەو بەرجەستەیە لەبیرکردنەوەماندا. ڕاستە بەرهەمهێنانو دەسەلاَتی ئابووری گەورەترین پشکی بەردەکەوێت لەڕۆژگاری جیهانگیریو لەبەردەوامی پرۆسەی بەجیهانی بووندا.

ئەگەر نمونەیەك بۆ ئەو بۆچوونەی سەرەوە بهێنمەوە وابزانم زیاتر ئەو شتە ڕوون دەبێتەوە. کۆڕەوەکەی سالَی 1991 وای کرد کە ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری (688)ی دەربکاتو بڕیاری جێ بەجێ کردنی بدرێت بەزوترین کات، باشوری کوردستان بەشێکی

ببێتە زۆنێكی ئەمنیو ئارام بۆ كورد دابنرێتو تاوەكوو ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە4/9ی 2003[33].

ئەوەی كەوای كرد ئەنجومەنی ئاسایش ئەو بڕیارە كتوپڕە دەربكات و دەست وەرداتە كارووباری ناو خۆی وڵاتێكەوە كە پێشتر ئەو شتانە بەبەزاندی سنوری سەروەری نیشتیمانی دەوڵەتێك حسابی بۆ دەكرا، ئەوەی كەوای كرد بوونی ژمارەیەكی زۆر چاوی كامێراو دەزگاو ڕاگەیاندن و میدیای جیهانی لەناو شاخەكانی سنوری عێراق _ئێران، كە لەگەڵ هەزاران هەزار كوردی ڕاكردو و ماڵ بەجێماو دەمانەوەو هەموو وێنە ترسناك و تراژیدیاكانی ئێمەیان بۆ دوونیا گواستەوە، دیمەن و وێنەكانی منداڵی بەر بە فرو برسی و منداڵی مردوو. پیاو و ژنی پیرو برسی ونەخۆش، بەهەموو جیهان پیشانداو وای كرد جیهان بوروژێنن و دنیا لەكێشەی كورد تێبگەین دواتر ئەوبڕیارەی ئەنجومەنی ئاسایشی لێبكەوێتەوە[34].

كەواتە ئەگەر یابان و سەنغافورە و مالیزیا بەهۆی پیشەسازی و بەرهەمەوە و ئەگەر ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بەهۆی سیاسەسەتەوە و ئەلقاعیدە بەهۆی وێنەكانی زەواهیری و ئوسامەو تیرۆرەوە بچنە ناو گلوبالیزاسیونەوە. ئەوا كوردیش خاوەنی خەم و كۆستی نەتەوەیی وەك هەڵەبجە و ئەنفالەو دەتوانێت بەئاسانی بچێتە نێو پرۆسەی گلۆبالیزاسیونەوە. ئەمەش لەسەر ئاستی نەتەوەیی زۆر سوودی هەیە تاوەكو شوناسێكی سیاسی نەتەوەیی بەهێزی پێدرووستكەین دواتر دەوڵەتێكی نەتەوەیی بۆ كورد بوونیاد بنرێت.

ئەگەر زۆر ووڵات لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕستدا بەهۆی ئەو كەلتورە داخراو بونیادە كۆمەڵاتیە دوگماو چەق بەستوانەی كەهەیانە نەتوانن زۆر گلوبالیزەبن و یاخوود بەهۆی بیركردنەوەیەكی ساویلكە كە لایان ئامادە یە بەوەی واهەست دەكەن بە هۆی گلوبالیزاسیونەوە زەرەرو زیانی گەورەیان كردووە و ڕۆژ دوای ڕۆژ كومەڵگاو بونیادەكانی كۆمەڵگاكانیان پەرتەوازە دەبێت و فرە ڕەنگ دەبێت. وەك ووتم ئەگەر بۆ ئەو وڵاتانە جیهانگیری ئەوەبێت و وابیر بكەنەوە لەم پرۆسەیە، ئەوە جیهانگیری بۆ نەتەوەیەكی چەوساوەی وەك كورد لەم ناوچەیەدا لەزۆر ڕووەوە سودو قازانجی گەورەی هەبووە و هەیەتی. لەلایەك ناساندنی كێشەی نەتەوەیی كورد بەهەموو دونیا و بەهۆی میدیاكان و دەزگاكانی ڕاگەیاندنەوە، لەلایەكی تر ئاگادر بوونی UN و چەندان ووڵات و ڕێكخراوی مرۆڤ دۆست لەكێشە نەتەوەیی و داخوازی یە نەتەوەیەكانمان[35].

ئەوەی پێویستە ئێمەبیکەین و کاری بەردەوامیان بێت، ئەوەی کەناسیونالیزمی کوردی لەڕۆژگاری گلوبالیزاسیوندا ئەرکی سەرشانیەتی، ئەوەیە کەکورد زیاتر بناسرێت کێشەو داخوازیە نەتەوەیەکانی زیاتر گلوبالیزە بکات. ئەوەی زۆر گرنگە بیکەین ئەوەیە ئەنفال وەك هولوکوست گەورەکەین و گلوبالیزەی کەین وەك ئەوەی ئەنفال پرۆسەیەك بوو لەعێراقدا دەویسترا نەتەوەیەکی وەك کورد تیایدا قڕبکرێت و لەناوببرێت، ئامانج لەئەنفال لەناوبردنی شوناسی نەتەوەیەك بووە. پێویستە لە ڕۆژگاری گلوبالیزاسیوندا ئەنفال بکەینە شوناسێك تاوەکوو کوردی وەك نەتەوەیەکی قڕکراو پیێ بناسرێتەوە.

### کورد دوایی پرۆسەی ئەنفال

ئەوەی دەمەوێت لێرەدا گرنگی پێبدەم باسکردنی نەتەوەیی کوردە لە ڕووی ئەجێنداو پرۆژەی سیاسیەوە لەدوای ئەنفال. بەوەی تاچەند ئێمە کاری زانستی و بابەتی و مەعریفییمان کردووە تاوەکوو لەئەجێندای سیاسیماندا ئەنفال جێگای دیارو بەرچاوی هەبێت[36]. لەڕووی پرسە سیاسی و نەتەوەیەکانمانەوە ئەنفال تاچەند ئێمەی بەدونیای دەرەوە ناساندوە. یاخوود ناسیونالیزمی کوردی چەندە لەهەوڵی ئەوە دابووە کەچیدی ئەنفال نابێتەوە بە پرۆژەیەکی تری لەناو بردنی کورد لە عێراقی پوست صەدامدا، بەتایبەت دوایی ئەوەی ئێمە بەدەستی خۆمان بەدەستور بووینەوە بەعێراقی. ئەوەی تائێستا نەکراوە و دەبوو کاری جددی بۆبکرایە ئەوەیە، دەبوو ئێمە قۆناغی دوایی ئەنفالمان هێندە تۆکمەو توند بوایە لەڕووی یەکگرتووی گوتاری نەتەوەیی مانەوە. تاوەکوو خۆمان بەدوونیای دەرەوە بەشێوەیەك بناسێنین، مەسیجێك بۆگشت لا بنێرێن و بڵێین زۆر هەوڵدرا تاوەکوو نەتەوەی ئێمەو بزوتنەوە نەتەوەیەکەی کورد لەناوببرێت بەتایبەت لەئەنفالدا، کەچی ئەوەتا دوایی ئەمە زیاتر بەهێز بووین و گوتاری مانەوەمان زیاتر بەهێز بووە زۆر پێچەوانەی ئەوە دەرچوو کەبەعس لەئەنفالدا وویستی.

ڕەنگە کورد لەئاست بونیادنانی شوناسی نەتەوەیی و شوناسی سیاسیدا دا زۆر سودی وەرنەگرتبێت. ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆئەو شپرزەیی و لێکترازانەی لەنیو ماڵی کوردی دا هەبووە، ونەبونی گوتارێکی نەتەویی بەهێز تاوەکوو پرۆژەی داهاتووی نەتەوەیی لەسەربنیاتن بنیا بنێین[37]. دوای ئەنفال کەمترین گۆڕانی جەوهەری و

مەعریفی لەگوتاری ناسیونالیزمی کوردی دا ڕوویداوە. لەزۆر ڕوەوە ئەم گوتارانە هەمان گوتاری نەتەوەیی بەر لەئەنفالن. تەواو کلاسیکیو تەقلیدین هەم لەرووی داخوازی نەتەوەیی و هەم لە خستنە ڕووی کێشەنەتەوەیەکانمانەوە. لەوانەش ئەم لاوازیە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کەبزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی وەك پێویست لەئەنفال و مەرامەکانی پشت ئەنفال تێبگات و تەفسیری کات زانستیانە لێی بکۆڵیبێتەوە. یان بەروەژەندی حیزبی و خێڵ و تۆخ کردنەوەی شوناسی ناوچەگەری و حیزبی لەجێی شوناسی نەتەوەی وای کردووە ئەنفال وەك بابەتی بەهێزکردنی هەموو شوناسێك جگە لە شوناسی نەتەوەیی سودی لێوەربگرێت. دەتوانم بڵێم کورد وەك نەتەوە تاوەکو ئێستا نەیتوانیوە بچێتە قوناغی دوایی ئەنفالەوە هەم لەئەجێندای سیاسی وهەم لە درورستکردنی و شوناس وکیانێکی نەتەوەیی دا.

**لێرەدا لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی پێشاندەدەین دەربارەی کاریگەری ئەنفال لەسەر شوناسی نەتەوەیی**

**خشتەی ( 1 ) رەگەزی ئەو کەسانە دیاری دەکات کە لە نمونەی لێکۆڵینەوەکەدا وەرمانگرتون**

| رەگەز | ژمارە | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| مـــێ | 23 | ٪23 |
| نێــــر | 77 | ٪77 |
| کـــۆ | 100 | ٪100 |

لەخشتەی ژمارە (یەك) بۆمان دەردەکەوێت کەژمارەی ئەوکەسانەی کەمێینەن و ئێمە لەنمونەی توێژینەوەکەمانداوەرمانگرتووە ژمارەیان (23)مێینە، هەروەها ژمارەی رەگەزی نێر تیایدا( 77)نێرینەیە. ئەم جیاوای یەی نێوانین زۆر گەورەیە، لەکاتێکی توێژینەوەکەماندا گەشتینە ئەو ڕاستیەی کە رەگەزی مێینە کەمتر بایەخ بەم جۆرە ڕۆشنبیریانە دەدەن. وەك پێویست گرنگی پێنادەن.

**خشتەی (2) تەمەنی کەسەکانی ناو نمونەی توێژینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە**

| تەمەن | ژمارە | ڕێژەی ســــــەدی |
|---|---|---|
| 20 –29 | 55 | ٪ 55 |
| 29–30 | 27 | ٪ 27 |
| 40–49 | 18 | ٪ 18 |
| کـــــــۆ | 100 | ٪ 100 |

لەخشتەی ژمارە (2 )کەتەمەنی کەسەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە دەرەرکەوتووە کەژمارەی زۆری ئەوکەسانەی لەم نمونەیەدا بەشداریان کردووە لەنێوان تەمەنی لاوێتی و پێگەیشتنی تەواو دان و دەتوانن هەموو دیاردەکان بەشێوەیەکی واقعی لێك بدەنەوە، چونکە مرۆڤ لەخوار ئەم تەمەنەوە، زۆر بەتەواوی ناتوانێت دیاردەکانی چواردەوری لێك بداتەوە.

**خشتەی ژمارە (3) ئاستی خوێندەواری نمونەی توێژینەوەکەمان ڕوون دەکاتەوە**

| ئاستی خوێندەواری | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| دکتورا | 4 | ٪4 |
| ماستەر | 7 | ٪7 |
| بەکالوریوس | 23 | ٪23 |
| خوێندکاری زانکۆ | 67 | ٪67 |
| کـــــــۆ | سەد کەس | ٪100 |

خشتەی ژمارە (3) ئاستەکانی خوێندەواری کەسەکانی نمونەی توێژینەوەکە پیشان دەدات، کەتیایدا خۆمان بەشێوەیکی مەبەستدار و ناهەڕەمەکی ئەم ئاستانەمان دەست نیشان کردووە. ئاستی بەرزی خوێندەواری و جۆری خوێندن گرنگە تاوەکوو نمونەی

تویژینەوەکە بەشیوەیەکی راست و گونجاو دەربچیت. ئاستەکانی خویندن گرنگە تاوەکو تۆ بتوانیت کەسایەتی کەسەکانی نمونەی تویژینەوەکەت هەلسەنگینیت.

**خشتەی (4)ئەو بڕوایە ڕوون دەکاتەوە کەئیمە کۆمەڵگەیەکی پوست ئەنفالین، واتە ئەنفال لەدوامانەوەیە.**

| ئایا ئیمە کۆمەلگەیەکی پوست ئەنفالین | ژمارە™ | ڕیژەی سەدی™ |
|---|---|---|
| نەخیر | 84 | ٪84 |
| بەلی | 7 | ٪7 |
| تاڕادەیەك | 9 | ٪9 |
| سەرجەم | سەدکەس | ٪100 |

ئەم خشتەیە پرسیارکردنە لەوەی کە ئیمە ئایا ئەنفالمان جیهیشتووە, واتە ناکریت ئیمە بە نەتەوەیەك بناسریین کە دەکریت ئەنفال جاریکی تر بەرامبەرمان بکریتەوە لەعیراقی دوایی صەدامدا. بەلام ریژەی زۆری وەلامەکان بە (نەخیر) دراونەتەوە. واتە نەخیر ئیمە کۆمەڵگەیەکین هیشتا ئەنفالمان جینەهیشتووە و دەکریت ئەنفال بەچەندین شیواز لەعیراقی دوای صەدامدا رووبداتەوە. خستنە ڕووی پرسیاریی لەم شیویە رەنگ بیت لەسەر هەردوئاستی کومەلایەتی و سیاسی لیکدانەوەی ووردی بۆکریت، رەنگ بیت بەشیکی زۆری وەلامە نەخیرەکان بەهۆی ئەو بیمتمانەییەوە بیت بەو چوارچیوەیەی کەناوی دەوڵەتی عیراقی لینراوە، میژوویەکی هەیە لەکوشتارو خوین و حوکمی دیکتاتوری و دەسەلاتی شمولی. هەروەها رەنگ بیت بەهۆی ئەوەوە بیت کەخەلکی لەگورانکاریە سیاسیەکان بەگومانن و بەهیچ شیوەیەك ناتوانن متمانەی تەواوی خۆیان بە بەلینە سیاسی و بارودۆخە سیاسیەکان ببەستن، بۆیە ئیمە پیویستمان بەکۆمەلیك گرەنتی پتەو و نەگۆڕ هەیە تاوەکو دلنیامان کات لەوەی کەلەعیراقی دوایی صەدامدا ئیتر ئەنفال دووبارەنابیتەوە.

**خشتەی ( 5 ) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەئایا بونەوەمان بەعێراقی مەترسی دووبارە بوونەوەی ئەنفالی هەیە.**

| وەڵام | ژمـــارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڵێ | 83 | ٪83 |
| نەخێر | 7 | ٪7 |
| تاڕادەیەك | 10 | ٪10 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیەی کە ئەم پرسیارەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە تیایدا دەردەکەوێت کەرێژەی کەسەکانی ناو نمونەی توێژینەوەکە کە وەڵامەکەیان بە(بەڵێ)یە ڕێژەیەکی زۆر گەوریە. لەوەی کەدووبارە بوونەوەمان بەعێراقی و لە سەر ئیختیاری خۆمان، کارێکی هەڵەبوە و لەوانەیە بەهۆیەوە دووبارە بونەوەی ئەنفال شتێکی مەحاڵ نەبێت و دوبارەبێتەوە، بونەوەمان بەعیراقی بەپێی دەستوور بەبێ ئەوەی هیچ مەرجێکی نەتەوەیی مان هەبێت. وای کردووە کەزۆرێك لەخەڵکی لەدەرەنجامەکانی دوایی ئەم پرۆسەیە بترسن و بەچاوی گومانەوە لێی بڕوانن.

**خشتەی ژمارە ( 6 ) باس لەوەدەکات ئەگەر هەرهێزێکی تری عەرەبی لەدوایی بەعس هاتەسەر حوکم و ئەو هەلەی قوستەوە ئایا ئەنفال نابێتە بەشێك لەئجێندای سیاسی ئەو هێزە.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڵێ | 36 | ٪36 |
| نەخێر | 12 | ٪12 |
| تاڕادەیەك | 52 | ٪ 52 |
| سەرجەم | سەد کەس | ٪100 |

ژمارەیەکی زۆری وەڵامی ئەم خشتەیە بەتاڕادەیەك (لەوانەیە) وەڵام دراوەتەوە ئەمەش ئەوەدەردەخات کە تاوەکوو ئێستا خەڵکی بەگومانن لەو هێزە عەرەبیانەی کەلەعێراقدا ووجودیان هەیە و ئێستا لەساحەکەدا ئامادەن. زۆرێك لەم هێزانە هەرچەندە بەشداری هەڵبژاردن و پرۆسە دیموکراسیەکان دەکەن بەڵام لەبناغەدا هێزی تاریکن و باوەڕیان بەکرانەوە نیە ناتوانن دیموکرات خوازبن و توانای پێکەوە هەڵکردنیان نیە لەگەڵ زمان و نەتەوەی جیاوازتر لەخۆیان. بۆیە هەرچەندەکەرستەکانی دیموکراسی لەعیراقدا ئامادەن بەڵام ئەمە هیچ گەرەنتی ئەوەمان پێنادات کەچیتر دەسەڵاتێکی دیکتاتوری ناگەرێتەوە سەرحوکم و ئەنفال نابێتە بەشێك لەئەجێندای سیاسی ئەو هێزە. بۆیە هەرحساب نەکردنێکی ووردو قوڵ لەو بارەوە رەنگە مەترسی ئەم گریمانەیە زیاتر کات لەعێراقی پوست صەدامدا.

**خشتەی ( 7 )ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەئایا دەکرێت عێراق دیموکراتیزە بکرێت لەگەڵ بونی ئەو هەموو هێزە ناسیونال و شوڤینی و ئاینییەی کە لە عێراقی پۆست بەعسدا هەیە.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڵێ | 5 | 5٪ |
| نەخێر | 86 | 86٪ |
| تاڕادەیەك | 9 | 9٪ |
| سەرجەم | سەد کەس | 100٪ |

ئەم خشتەیە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە زۆر مەحاڵە عێراق بچێتە نێو پرۆسەیەکی دیموکراسیەوەو دیموکراتیزە بکرێت. چونکە عێراق ووڵاتێکی فرە مەزهەب و فرەئاین و فرەنەتەوەیە. وەك دەبینین دوایی بەعس چەندین هیزی تری عەرەبی هاتونەتە ساحەکەوەو هەریەك بەئاوازو تۆنێك جیاوازتر لەوانی دی دەخوێنێت. ئامانجی هەریەکەیان جیاوازە. ئەمیان دەیەوێت ئەوی تر لەناو ببات و نەیهێڵێت. زۆرێك لەم هیزە عەرەبیانە ئایدولوژیەتیان قابیلی دیموکراتیزەکردن نیە هەرچەندە بانگەشە بۆ ئەم پرۆسەیەدەکەن بەڵام لەپراکتیك کردنی ئایدۆلۆژیەتیاندا رەنگ ناداتەوە، بۆیە ئەگەر نەتوانرێت لەسەردستی ئەم هێزانە دیموکراتیزە بکرێت، ئەوە ڕوودانەوەی ئەنفال لەعێراقی پوست بەعسدا مەحاڵ نیە.

**خشتەی (8) باس لە پەیوەست کردنی ئەنفال دەکات بەئایدولوژیای بەعسەوە، نەخوێندنەوەی ئەم کارەساتە لەسەر ئاستە کەلتوری و ئاینی و بوونیادە ڕۆشنبیریەکانی دوونیای عەرەبی، بەوەی کارێکی لەم شێوە ئایا تووشی هەڵەی مەعریفیمان ناکات.**

| وەلاّم | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| بەڵـــێ | 94 | ٪94 |
| نەخـــــێر | 1 | ٪1 |
| تاڕادەیەك | 5 | ٪5 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

وەلاّمی بەشێکی زۆری نمونەی توێژینەوەکە بە (بەڵێ) بۆئەم پرسیارە ئەوەدەخاتە ڕوو کە هەڵە دەکەین ئەنفال ببەستینەوە بەئایدولۆژیای بەعسەوەوە تەواو. نەخێر دەبێت بەدوایی هەموو ئەو هۆکارو ڕەگ و ڕیشەمێژووی و کەلتوری و ئاینیانە بگەڕێین کەوای کرد ئەنفال لەسەردەستی هێزێکی شۆڤێنی وەك بەعس ڕووبدات. هەروەها بەدوایی ئەودا بگەڕێین بزانین ئەوهۆکارانەی وایکرد ئەنفال ڕوبدات ئایا لای هێزی عەرەبی لەعێراقدا دەبینرێت، چونکە هەرحساب نەکردن و فەرامۆشکردنێك دواتر دەمانخاتە بەردەم زنجیریەك ریسکی یەك لەدوایی یەکی چاوەرێکراو.

**خشتەی (9)باس لەدادگایی کردنی سەرانی بەعس دەکات لەسەر کەیسی ئەنفال لەدادگایی عێراقی دا ئایا کاریگەری نەبووە لەبچوك کردنەوەی ئەم کارەساتەبەوەی کەنەبراوە بۆ دادگایەکی نێو دەوڵەتی.**

| وەلاّم | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| بەڵــــــێ | 97 | ٪97 |
| نەخێـــــــر | 0 | ٪0 |
| تاڕادەیەك | 3 | ٪3 |
| سەرجەم | سەد کەس | ٪100 |

دادگایی كردنی سەرانی بەعس لەسەرئەنفال لەدادگایی عێراقیداو نەبردنی ئەم كارەساتە بۆ دادگایەكی نێودەوڵەتی كاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر بچوكردنەوەی قەبارەی ئەم كارەساتی مرۆڤ قڕانە, زۆریكی خەڵكی وای بۆ دەچن كە دادگایی عێراقی كەیسی ئەنفالی خستۆتەپاڵ چەند كەیسێكی كەوە و بوەتە هۆی بچوك بوونەوەی ئەم كەیسەو، وای كردووە كەنەتوانین ئەنفال وەك كارەساتێكی نەتەوەیی گەورە بناسرێت.

**خشتەی ( 10 ) ئەوە روون دەكاتەوە كەئایا ئەنفال پرۆسەیەك بوو بۆ لەناو بردنی نەتەوەی كورد بەمانا سیاسیەكەی واتە لە ناوبردنی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی كوردی.**

| وەڵام | ژمارە | رێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| بەڵـــــێ | 94 | ٪94 |
| نەخێـــر | | |
| تاڕدەیەك | 6 | ٪6 |
| سەرجەم | سەد كەس | ٪100 |

زۆربەی زۆری نمونەی تویژینەوەكە باوەڕیان بەوەیە كە ئەنفال بۆ ئەوە كرا تاوەكوو جاڕی نەمان و فەوتانی نەتەوەیەك و بزوتنەوە ناسیونالیزمیەكەی بدات، ئامانج لە ئەنفال بۆ سڕینەوەی شوناسی سیاسی نەتەوەیەك بوو، ئەنفال پەیامیكی تایبەت بوو بۆ كەسێك لەبیری هوشیاركردنەوەی نەتەوەكەیدا بوو.

**خشتەی ( 11 ) باس لەوەدەكات كەئایا دەسەڵاتی كوردی لەسەر هەردوو ئاستی تیوری و پراكتیكی توانیویەتی مامەڵەیەكی زانستی لەگەڵ ئەنفالدا بكات.**

| وەڵام | ژمارە | رێـــــــژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| بەڵـــــێ | 5 | ٪5 |
| نەخـــــێر | 86 | ٪86 |
| تاڕادەیەك | 9 | ٪9 |
| سەرجەم | سەد كەس | ٪100 |

دەسەلاٌتی کوردی لەئاست ئەم کارەساتەدا کەتەرخەم بووە وەك لەم نەخشەیدا دەردەکەوێت، نەیتوانیوە وەك پێویست بایەخ بەئەنفال بدات لەناوەندە ئەکادیمی زانستیەکاندا. نەیتوانیوە ئەنفال بکاتە بابەتێکی زانستی و ئەکادیمی لە زانکۆکان و ناوەندەکانی تری خوێندندا، تا ئێستا دەسەلاٌتی کوردی نەیتوانیوە بایەخ بەئەنفال بدات لەوەی سەنتەرێکی توێژینەوەی زانستی لەسەر ئاستی نەتەوەیی دابمەزرێنێت. یان وەك پێویست بایەخ بەوکارەساتە نادرێت لەیادکردنەوەی دا بەوەی کە ئەمە یادی کۆست وکارەساتێکی نەتەوەیی گەورەیە.

**خشتەی ( 12 )ئەوەدەخاتە ڕوو کەئایا میدیای کوردی توانیویەتی ئەنفال گلوبالیزەکات و وەك کێشەیەکی نەتەوەیی بیناسێنێت.**

| وەلاٌم | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەلـــــێ | 25 | ٪25 |
| نەخێـــــر | 67 | ٪67 |
| تاڕادەیەك | 8 | ٪8 |
| سەرجەم | 100 | ٪ 100 |

بەشێکی زۆری وەلاٌمی کەسانی ناو نمونەی توێژینەوەکە بەوەیە کەمیدیای کوردی نەیتوانیوە ئەنفال گلۆبالیزەکات و وەك کێشەیەکی نەتەوەیی بەجیهانی بناسێنێت، ناساندنی کارەساتی ئەنفال بەجیهان کۆمەلێك دەسکەتی نەتەوەیی و سیاسی دەستەبەردەکات لەوەی ئەنفال دەتوانێت لەڕۆژگاری جیهانگیریدا ببێتە شوناسێکی نەتەوەیی و سیاسی بەهێز تاوەکوو کوردی لەجیهاندا پێبناسرێت. دواتر وەك میللەتێکی جینوساید کراو دانمان پیابنێن. بۆ ئەوەی هەردواکاریەکی سیاسیمان هەبو لەعێراقی دوایی صەدامدا پشتگیری نێو دەولەتی بەدەست بێنین.

**خشتەی ( 13 )ئەوە دەخاتە ڕوو کەئایا ئەنفال بووەتە هۆی ترسی لەناوچون لەسایکولۆژیەتی تاکی کوردیدا**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| بەڵێ | 83 | ٪83 |
| نەخێر | 6 | ٪6 |
| تاڕادەیەك | 11 | ٪11 |
| سەرجەم | سەد کەس | ٪ 100 |

ئەم خشتەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە تاوەکو ئیستا لای زۆریك لەخەڵکی بەهۆی ئەنفالەوە ئەو ترسە لەسایکولۆژیەتیاندا ماوە، ئەترسن لەوەی ئەم کارەاتە لەعیرای دوایی بەعسیشدا ڕوویداتەوە لەسەر دەستی لایەن و حیزبی تری نێو دوونیای عەرەبی. دەتوانین ئەم ترسە ناوبنێین فوبیای ئەنفال، چونکە زنجیرەیەك ترسە یەك بەدوای یەکدا دێت. هەموو ئەو گوڕنانەی دوای روخانی بەعس بەعس ڕوویانداوە وای نەکردووە کەئەم ترسە بڕەوێنێتەوە یاخوود کەمی کاتەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە بیروبۆچوونی ئەم هیزانەی کەئێستا لەساحەکەدا ئامادەگییان هەیە ترس لەوەی ئەنفال بکرێینەوە لەسایکوڵوژیەتی تاکدا درووست کردووە.

**پەراوێزەکان:**


١. مەریوان ووریا قانیع ,نەتەوەو ناسیونالیزم ,گوڤاری ڕەهەند ,ناوەندی رەهەند,سلیمانی,ژمارە ١٦_١٧,لا ١٦٤

٢. مەریوان ووریا قانیع ,نەتەوەو ناسیونالیزم ,گوڤاری ڕەهەند ,ناوەندی رەهەند,سلیمانی,ژمارە ١٦_١٧,لا ١٦٤

٣. هەمان سەرچاوە ی پێشوو لاپەرە ١٦٦

٤. ارنست کیلنر,لامم والقومیة, ترجمة :د.مجید الرازی ,دارالمدی ١٩٩٩,ص ١٣٨

٥. منشورات الاعلام المرکزی للحزب الشیوعی العراقی .کوردستان العراق ,١٩٨٩

٦. Mew,genocide in iraq,op,cit,p

٧. بەرنامەی (شؤن الساعة) رادیوی لەندەن ,دووشەمە ١٩٨٨/٩/٥

٨. یوست هیلتەرمان , جینوسایدهاوتاوانی بێدەنگ بوون , گوڤاری رەهەند ژمارە(٧)سلیمانی,١٩٩٩ولا ٢٤١

٩. کنعان مکیة ,القسوة والصمت ,منشورات هیئة الارسال العراقیة ,اربیل ١٩٩٦,ص ٦٤

١٠. هە مان سەرچاوە

١١. د.مارف عومەر گول محمد , ئەنفال قوناغێکە لەپراکتیکردنی جینوساید ,گوڤاری رەهەند ,ناوەندی رەهەند,سلیمانی,ژمارە (٧)لا ٦٢
١٢. مەریوان ووریا قانیع,بەختەوەری و بێدەنگی ,سلیمانی ,٢٠٠٣,لا ١٧
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ,١٩-٢٠
١٤. مەریوان ووریاقانیع ,بەختەوەری و بێدەنگی , بەرگی یەکەم ,سلیمانی ,٢٠٠٤,لا ١٦٨
١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٧٠
١٦. هەمان سەرچاوەیپێشوو لاپەرە ١٦٧
١٧. ارنست گیلنەر ,الامم والقومیه ,ترجمه :د.مجید الرازی ,دارالمدی ,١٩٩٩ص ١٣٠
١٨. 54),(53),) د.علی الوردی ,لمحات الاجتماعیة من تاریخ العراق الحدیس,مقدمة جزئ الاول .مكتبة الصدر,قم,١٩٩٨,
١٩. ئاسو کوکوی . ئەنفال و وەك کارەساتێکی نەتەوەیی ,کوردستانی نوێ, ژ ٤٣٢٦
٢٠. بەهادین ئەمین ,دادگاو تۆلە,گۆڤاری روون ,ژمارە ,هەولیر٣,ساڵی ٢٠٠٥
٢١. هەژار ئەنوەر ,ئەنفال و دادگایی کردنی ئەنەجام دەرانی ,رۆژنامەی ئاسو,ژ (٨٧),سلیمانی ,٢٠٠٥
٢٢. هەمان سەرچاوە
٢٣. بەهادین ئەمین ,ئەنفال و دادگایی عیراق ,روژنامەی کوردستانی نوێ,ژ(٤٦٣٢),سلیمانی ,٢٠٠٥
٢٤. هەمان سەرچاوە پێشوو
٢٥. د.محمد جواد ,ماالعولمة.جزء الاول ,دارالشرق ,بیرووت ,٢٠٠٣ ص ٤٢
٢٦. بەهادین ئەمین , هەڵبجەوجیهانگیری و مەسەلەی کوورد , روژنامەی کووردستانی نوێ ,ژ(٣٩٧٨)
٢٧. مەریوان ووریا قانیع ,شووناس و ئاڵۆزی ,سلیمانی ,2004,لا 68
٢٨. سابیر جەبار ,ئەنفال وەك لەناوبردنی نەتەوەیەك ,روژنامەی خەبات ,ژ(٣١٢٩),هولیر
٢٩. سابیر جەبار ,ئەنفال وەك لەناوبردنی نەتەوەیەك ,روژنامەی خەبات ,ژ(٣١٢٩),هولیر
٣٠. ئاسو کوکوی ,ئەنفال و مەترسی بیرچوونەوە .روژنامەی کوردستانی نوێ ,ژ(4463)
٣١. بەهادین ئەمین ,ئەنفال و دادگایی عیراق ,روژنامەی کوردستانی نوێ,ژ(٤٤٦٣٢)
٣٢. بەهادین ئەمین ,دادگاو تۆلە,گۆڤاری روون ,ژمارە ٣,ساڵی ٢٠٠٥
٣٣. هەڵبجەوجیهانگیری و مەسەلەی کوورد , روژنامەی کووردستانی نوێ ,ژ(٣٩٧٨)
٣٤. ئاسو کوکوی,ئەنفال وجیهانگیری ,رۆژنامەی ووڵات ,ژمارە (٣٤٥)
٣٥. هەمان سەرچاوەی پیشوو
٣٦. ئاسو کوکوی ,ئەنفال و مەترسی بیرچوونەوە .روژنامەی کوردستانی نوێ ,ژ(٤٤٦٣),سلیمانی,٢٠٠٥
٣٧. مەریوان ووریا قانیع ,شووناس و ئاڵۆزی ,سلیمانی ,٢٠٠٤,لا ٦٨

# کاریگەرییەکانی ئەنفال لەسەر خێزانی کورد

نەوشیروان سابیر

کارەساتی ئەنفال یەکێکە لەگەورەترین ئەو تاوانانە گەورانەی کە حکومەتی عێراقی بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بەسەر گەلی کوردا هێنا، وە ئەم پرۆسەیە تێکدانی ژێر خانی ئابوری و گەلێ دەردە سەری و نەخۆشی کۆمەڵایەتی و دەرونی و قەیرانی سیاسی لەدوای خۆیدا بەجێهێشتووە کە تا ئێستاش بەجێماو و کەس وکاری ئەنفالەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن، لەگەڵ ئەمەدا پرۆسەیەك بوو بۆ بۆ هەڵوەشاندنەوەی لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەرونی گەلی کورد ، لێرەوە بۆشمان دەردەکەوێ تەنها ئەنفال ئەوانە نین بێسەرو شوێن کراون، بەڵکو ئەوانەش کە بەجێماوی ئەنفالن و جێماون کاریگەری ئەنفال ماوە لەسەریان و هەر دەمێنێ، بۆیە لێرەدا هەوڵدەدەین بەشێك لەو کاریگەریانە باس بکەین لەسەر ئەو کارەساتەی بەسەر گەلی کوردا هاتووە

**کاریگەری کۆمەڵایەتی:**

ئۆپراسیۆنی ئەنفال هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ شەڵەژان و پەرتەوازە بوونی کۆمەڵگەی کوردەواری و وە تێکدانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان یەکتریدا، هەروەها بووە هۆی نەهێشتن و تێکدانی داب و نەریتی ڕەسەنی کوردەواری کە بنچینەو بنەمای سەرەکین بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەگشتی. زۆرێك لەپسپۆرانی کۆمەڵناسی پێیان وایە کە پرۆسەی ئەنفال کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر بەجێماوەکانی خۆی هەیە لە ڕوی کۆمەڵایەتی یەوە، لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی کوردی وە بەتایبەتی بەجێماوەکانی ئەنفالی گوندەکان لە لایەن باوکیانەوە بژێوی ڕۆژانەیان بۆ دابین دەکرا، بەڵام کە ئەنفال ڕویدا ئەوە بوو بژێوی ڕۆژانە بووە هۆی تێکدانی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی تاك و خێزان، هەروەها لەڕوی پەروەردەکردنی خێزانەوە واتە منداڵەکان هەست بەوە دەکەن کە باوکیان نەماوە وە هەست بەوە دەکەن کە یەکێك بەخێویان دەکات ئەویش دایکێتی لەبەر ئەوە هەست بەکەمێتی دەکات، بۆیە کاریگەرییەکان زۆر ڕاستەوانە بووە لە سەر تاکەکان. [1]

هەر کۆمەڵگەیەکیش شەڵەژاو بەرەو نەمان چوو ئەوا زۆرێك لەبنەما سەرەکییەکانی لەدەست دەدات[2] ئاشکرایە زۆربەی داب‌و نەریتە کۆمەڵایەتی یەکان لە گوندەکان بەرچاو دەکەون کە نمونەی بەرزی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە بە نەمانی گوندەکان زۆربەی داب‌و نەریتەکان دەسڕێتەوە، هەروەها کەرەستەوەو بەجێماوە فۆلکلۆرییەکان لەناو دەچن[3]. لەگەڵ ئەوەی ئەو کارەساتە نامرۆڤایەتییە کەبەسەر گەلی کوردا هاتووە، بەڵام پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەناو تاکەکانی کۆمەڵدا بەردەوامە، ئەو بەرداوامیی‌و گەشەسەندنە ئەوامان نیشان ئەدات کەتاك‌و ئێستا کۆمەڵگای کوردەواری چەسپاوە لە یەکێتی کۆمەڵایەی کە کاریگەری لەسەر یەکێتی نیشتمانی هەیە، کەواتە شاڵاوەکانی ئەنفال نەیتوانیوە پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا بپچرێنێ، وەك ئەو پەندە کوریدییەی دەڵێت (مرۆڤ لەدین دەبێ، بەڵام حەنین نابێ)[4].

ئاستی خوێندەواری هەر کۆمەڵێ، ئاماژەی ڕون‌و ئاشکرایە بۆ پێشکەوتن‌و بەرەو پێشچونی ڕۆشنبیری‌و شارستانی ئەو کۆمەڵە، واتە ئەو کۆمەڵانەی کە ڕێژەی خوێنەواران‌و ئاستی خوێندن تاڕادەیەکی باڵا تیایاندا پەرەی سەندوە لەزۆر ڕووەوە لەو کۆمەڵانەی پێشکەوتووە باشترە کە ئاستی خوێندەواری تییاندا نزمە[5]. پاش ئەنجامدانی کارەساتی ئەنفال لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتی عێراقییەوە، لەساڵی ١٩٨٨ کەس‌و کارو دەربازبوانی کارەساتی ئەنفال لەکۆمەڵگا زۆرە ملێکاندا کۆکرانەوەو نیشتەجێکران لەو دەمەوە تاکو ئێستا سەدان‌و بگرە هەزاران خێزان بەدەست کێشەوی نیشتەجێبونەوە دەناڵێنن[6] هەروەها لەبواری ئەنفالی کلتوریدا کتێبە مێژوییەکان گەواهن هەندێك بەجێماوەی کلتوریشیان ماوە کە بەڵگەی بۆ پێشکەتووی مرۆڤ دۆستی‌و کەلتورەکەمان پێش ئەوەی ئەنفال بکرێت، بۆ نمونە لەکلتوری کورددیدا زیندە بەچاڵکردن‌و زیندانی کردن‌و زەوتکردنی مافەکانی ژنان نەبووە وەك‌و لەکتوری عەرەبیدا هەبووەو هەیە[7]. ڕژێمی بەعسی فاشی جگە لەوەی کەلتورو داب‌و نەریت‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لەنێو خێزانی کورددیدا لەناوبرد لەلایەکی دیکەوە لەفۆمێکی تردا دیسانەوە ئاوات و خوزگەی کچ‌و کوڕی لاوی کوردی زیندە چاڵکرد، لەوبارەیەوە مریم صالح دانیشتوی ناحیەی ڕزگاری ڕوی ڕەشی ڕژێمی بەعسیمان زیاتر نیشان ئەدا، مریم بەرلەوەی کارەساتی ئەنفال ڕوبدات لەگوندی تیلەکۆی سەر بەناحیەی قادرکەرەم ئەژیا، ئەوکات ماڵی مریەم لەگەڵ ماڵی مامیدا ژن بەژن دەکەن‌و مریم دەدرێت بە ئامۆزاکەی،

دوای دوومانگ بەدەسگیرانداریێتی بەرلەوەی هاوسەریێتی پێکەوە بنێن ڕژێم هەڵدەکوتێتە سەر لادێکەیان و زۆربەی کەس وکاری و دەستگیرانەکەی مریەم دەستگیردەکەن، لەوکاتەوە هەتا ئێستا مریەم چاوەڕوانی دەستگیرانەکەی دەکات و شوی نەکردۆتەوە، هەروەها وتیشی ئەو کچەی لەحەقی مندا دراوە ئەیش وەك و من شوی نەکردوەو ئێستا لە ئۆردوگای شۆرش دەژی.[8]

هۆکارێکی دیکە کە ئافرەتانی تیا بونەتە قوربانی کاریگەرترین گرفتی کۆمەڵایەتی دروست کردوە، ئەویش چارەنوسی هەزاران ئافرەتی گەنج و کەم تەمەنن، کە هەیانە دەزگیران دار بونەوە چەند مانگێك لای مێرد بونەو هەشیانە منداڵێك یاخود دوو منداڵیان هەیەو شوویان نەکردووەتەوە،دیارە ئەم ئافرەتانە لەم فەزای کۆمەڵایەتیەدا ناتوانن بڕیار لەسەر شوکردنەوەی خۆیان بدەن، چونکە بڕیاردان لەو بابەتە بەواتای چونە دەرەوەیە لە سنوری بازنەی داب و نەریتی کۆمەڵ، ئەمانەش بونەتە قوربانی نەریتی کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵی کوردەواری، چونکە لە کۆمەڵی کوردەواریدا کۆمەڵە سنورێك هەیە شوێن و مەکانەی ئافرەتان بەگشتی و بەجیاوان دیاری دەکات، دەرچونیش لەو سنورانە نیشانەی عەیب و عاری گەورەی لەسەرە، چونکە عەیب و عار بەهەر کەسێکەوە بەسترایەوە وا بە ئاسانی دەسبەرداری نابێت. بێگومان تاکو ئێستا بەشێوەیەکی گونجاوو ڕێگەچارەیەکی یاسای شەرعیان بۆ نەدۆزراوەتەوە[9].

**کاریگەری ئابوری:**

تێکشکانی ئابوری کوردستان و بنبڕکردنی بەرهەمەکانی گوندەکان و سەرچاوەی بژێوی دانیشتوانەکەی، ئەتوانین بڵێین بەئامانجی سێیەم دێت لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا، لەپاش لەناوبردنی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستان و لەناو بردنی پشت و پەنای بزوتنەوەکە دانیشتوانی گوندەکان بەشێوەیەکی سەرەکی بووە. [10] بۆیە بەپیادەکردنی سیاسەتی جینۆساید، کەچڵەپۆپەکەی شاڵاوەکانی ئەنفالی هەشتاو هەشت بوو هەولێدا خاکی هەرێمی کوردستان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیی و لەکورد چۆڵی بکات، کەواتە بایەخی جیۆپۆلۆتیکی ئەم هەرێمە بەهۆکارێکی گرنگ و سەرەکی دادەنرێت بۆ ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال، چونکە ئەگەر عیراق وهەرێمی کوردستانی لێ جیا بکرێتەوە، دەبێتە وڵاتێکی کەم نەوت و بێ کشتوکاڵ و بێ سەرچاوەی ئاو، کوردستانیش مەرجێکی بەهێزبونی دەوڵەتی بۆ دێتە ئاراوە کەبنەمای ئابورییە، لەپیترۆڵ و کشتوکاڵ و

سەرچاوەی ئاو، کەواتە ئابوری گەورەترین بنەمای ژیانی مرۆڤە، لەهەر هەشت زنجیرەکەی سوپای عیراق بە تەکنەلۆژیای عەسکەری نوێوە لەماوەی حەوت مانگدا جگە لە جینۆسایدکردنی ژن‌و پیاو منداڵ‌و پیری کورد بەپێی بەڵگەنامەکان، ئەوانەی بەرێکەوت لە تۆڕی ئەنفال چییەکان ڕزگار بون ڕوبەڕوی گەورەترین کێشەی ئابوری و زیانی کولە مەرگی بونەوە، لەئۆردوگاکاندا بێکارو کاسبی دەست بەسەرکران [11]، بۆیە ئەتوانین بلێن ئەم بەشە چالاك‌و بەرهەم هێنە بوون بەکۆمەڵێکی بێکار، ئەمەش بۆ خۆی زەرەرو زیانێکی ئابورییە کە یەکەم بەکوردستان‌و دووەم بە کەس‌و کاری قوربانیانی ئەنفال کەوت، ئالێرەدا ئەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە گیروگرفتی ئابوری زیاتر باڵی بەسەر ئافرەتاندا کێشاوە[12]. خێزانی ئەنفال دوای بێسەرو شوێنکردنی مێردەکەیوو هاتنەوەی خۆی‌و منداڵەکانی لە زیندان یان بەرنەکەوتنی لە چوار چێوەی پەلامارەکە، چ کارێك بۆ بوژندنەوەی بنەمای ئابوری سەرجەم ئەو خێزانانە لە سەر بەخێوکردنی ئاژەڵ‌و چاندنی دانەوێڵەو ڕەزو باخ‌و ....هتد. ڕاوەستا بوو، هەموو ئەوانەش لەپرۆسەی پەلاماری ئەنفالدا نەمان بەتاڵان بران. ئەتوانین بڵێین بەر لەپەلاماری ئەنفال هەژارترین خێزان توانای خۆ ژیاندنی هەبووە، بەڵام دوای پەلامارەکە هەژارو دەوڵەمەند چونە یەك ئاستەوە کەوتنە بەردەم هەڕەشەیەکی پڕ مەترسییەکەوە بەتایبەتی ئەو خێزانانەی بەڕێوەبردن‌و بەخێوکردنیان کەوتبووە ئەستۆی ئافرەت[13]. ئەو تراژیدیایەی کە ڕویدا تەنها تراژیدیای مرۆیی نەبوو، بەڵکو کارەساتێکی ئابوری بۆ سەر کوردستان‌و هەموو عێراق ، چونکە ئەو ژمارە زۆرەی کە حکومەتی عیراق لەناوی برد بەشێك بوون لە توانا ئابورییەکانی وڵات، لەبەرئەوەی مرۆڤ خۆی توانای ئابورییە، ئێمە خۆمان دەزانین بەچی کاڵاو خزمەتگوزاری بەرهەم دێت بەچی کارە سەرمایە گوزارییەکان بەئەنجام ئەگەیەنرێت، کە ئەویش دەستی کارە، واتە عنصرێکی کارایە لەوێدا، هەروەها ئەم کارەساتە بووە هۆی ڕاگواستنی گوندنشینەکان لەکاتێکدا سەرچاوەیەکی ئابوری وڵات بوو بەتایبەتی ئەو کەسانەی لەشوێنی خۆیان لەسەر زەوی‌و زارەکانیان کاریان دەکرد. بەرهەمیان هەبوو ئەو بەرهەمانەیان لەناو برد، هەروەها ئەم ڕاگواستنە بووە هۆی قەرەباڵغییەکی زۆر لەشارەکانداو بێکارییەکی زۆری دروست کرد، ئەوانەشی بەر کارەساتەکە نەکەوتبون ڕژێمی عیراق ڕێگەی نەدا بگەڕێنەوە سەر ماڵ‌و موڵکەکانیانی خۆیان ئەمەش خۆی لەخۆیدا گرفتی ئابوری زۆری دروستکرد[14]. ئەم کارەساتە

هێرشێکی سیستماتیك‌و نەخشە بۆکێشراو بوو لەلایەن ڕژێمی عیراقەوە کە چەندین ئامانجی تایبەتی و گشتی خۆی هەبوو تیایدا، کارەساتێك بوو بۆسرینەوەی ناسنامەی نەتەوەی کوردو کاولکردنی لادێ کورد نشینەکان‌و داڕوخانی ژێرخانی ئابوری. خاتوو (نەدیم) خەڵکی گوندی (توکن)ی سەر بەشارۆچکەی کفری، یەکێکە لەبەرکەوتوانی ئەو شاڵاوە و بەهۆی ئەو شاڵاوەوە توشی گرفتی ئابوری بووە، خاتوو نەدیم دەڵێت (پێش ئەنفال ئێمە ژیانمان زۆر خۆش بوو، سەروەت‌و سامانی زۆرمان هەبوو،بەڵام کاتێك بەعس‌و جاشەکان هێرشیان کردە سەر لادێکەمان و هەمووشمانیان دەستگیرکردو بەفێل و تەڵەکەبازی هەموومانیان ڕاپێچی نوگرەسەلمان کردو، لادێ‌و ماڵ‌و سامان‌و کشتوکاڵیان وێران کردین، دوای چەند مانگێك ئازاد کراین، وتیشی لەبەرئەوەی منداڵەکانم وردبون و باوکیان سەرنەگوم کرابوو لەلایەن ئەو کافرانەوە ، نەشماندەزانی چیلێهاتوە.إ تەنها خۆم بووم بەبێ ماڵ‌و خانوو نەمدەزنی چیبکەم، هەروەها وتیشی ئێستا لەبەر نەبونی و هەژاری منداڵەکانم لە قوتابخانە دەرکردوەو، هەردوو کورەکەم لە پێناو بژێویدا بوون بەشوانی خەڵکی[15].

**کاریگەری دەرونی:**

زەبری دەرونی ئەو کاتە ڕوئەدات کەکەسێك ڕووبەروی ڕوداوێکی ناخۆش‌و کوتوپڕ یان چاوەڕوننەکراوی لەناکاو دەبێت‌و لەئاکامدا توانستەکانی تاك بۆ بەرەنگاربونەوەی ئاسایی تێك دەچێت‌و دەشەلاژێ وەك بەگولە بریندار بون ئازار ئەشکەنجەدان، دەستدریژی سێکسی، لەناکاو مردنی کەسێکی ئازیزو نزیك. کاتێك زەبری دەرونی چارەسەر ناکرێت خاوەنەکەی توشی چەندین فشاری دەرونی تر ئەکات بۆ کەمکردنەوەی کاری ئەو زەبرە ڕێگا چارەی کاریگەر نادۆزێتەوە، هەروەها ئەگەر توش بونی ئەو تاکە بە نەخۆشی یە دەرونییەکان زۆر دەبێ وەك‌و خەمۆکی، دڵە ڕەوکێ، نەخۆشی جەستە دەرونییەکان، تێك چون‌و شەڵەژانی کەسایەتی[16].بەجێماوانی ئەنفال‌و هەموو ئەوانەی لەو کارەساتەدا ڕزگاریان بووە، لەئێستادا دنیایە کێشەو گرفتیان بۆ دروست بووە، ئەم گرفتانەش زۆرجار بووە بەهۆی نەخۆشی درێژخایەن، سایکۆلۆژیەت لەناو پاشماوەی ئەنفالەکان دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەی شاڵاوە درندانەکەی ڕژێمی بەعس، کە بۆ هەر خێزانێك دەیان گرفت‌و کێشەی جۆراوجۆری بۆ دروست کردوون، ڕەنگە لەهەر خێزانێکدا ئەو کاریگەرییە جیاوازییەکی تێدابێت، بەڵام

بە مانا گشتییەکەی هەموو لەیەك تەوەری بنەڕەتیدا بەرجەستە دەبێت، کاریگەرترین هۆکار کە هەمیشە لە ناو بەجێماوانی ئەنفالدا وەك بیرێکی بەردەوام لە مێشکیاندا دەوران دەکات کە بیٚ چارەنوسی کەسوکاریانە، ئەم بیرکردنەوەیە وای لێکردوون بەردەوام لە چاوەڕوانییەکی بیٚ ئەنجامدابن، هەروەها لە دەستدانی شوێن‌و جێگیربونیان لە ئۆردوگا زۆرەملێکانداو بیٚ کاری‌و خراپی باری بژێوی‌و شوکردنەوە، کۆمەڵێك هۆکارن پرسیاری جدیان دروستکردووە لە هزری بەجێماوانی ئەو شاڵاوەدا[17]. ئەمانەو گەلێك دیارەو گرفتی تر وەکو دڵتەنگی‌و شێتبون‌و تورەبون‌و زۆر بیرکردنەوە...هتد. کەس‌وکاری ئەنفالەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن. تائێستاش ئەگەر لەدرێژەی توشبوانی کەسوکارەکانیان وەربینەوە دەبینین شاڵاوەکانی ئەنفال کاریگەری زۆر خراپی کردوەتە سەریان بە تایبەتی ژنانی بەجێماوی ئەو مەرگەساتە.

مریم حسن ئەحمەد سەبارەت بەکێشە و گرفتەکانی دەڵێت : سیٚ ساڵ دوای شوکردنم مێردەکەم ئەنفال کرا، دوو منداڵیشم هەبوو لەو کارەساتەدا لەبەر برسێتی و سەرماو سۆڵە مردن، ئیتر لەدوای ئەو کارەساتەوە لەگەڵ دیکمدا دەژیم و نەخۆشییەکی درێژخایەنم لەگەڵدایە و چەند جارێك چومەتە نەخۆشخانەو دەڵێن ئاگاداری خۆتبە و بەس،منیش لەتاو ئازارو دەردە سەری شەوان خەوم لێناکەویٚ، حکومەتی هەرێم و هیچ لایەنێك بەلاماندا نەهاتووە پرسیارمان لێناکەن، وتیشی دکتۆر پێی وتووم لەوڵاتانی دەرەوە چارەسەرت هەیە، بەڵام هیچیان بۆ نەکردوم. مریم دەڵێت " خۆزگە هەر لە دەشت بوینایەو خۆڵی ژێرپێی کورەکانی خۆم بخواردایە و ئەم ڕۆژەم نەبینایە[18]. ئەندامانی خێزانێکی ئەنفالکراو چیتر ناتوانن دەوری پەروەردە کردن ببینن، چونکە ئەمان خۆیان لەڕوی دەرونی‌و کۆمەڵایەتییەوە ئەنفال نەخۆشی کردون. هەرکاتێك ترس لەسنورەکانی خۆی دەرچوو ئەوا مرۆڤ توشی فۆبیا (تۆقین) دەبێت، بێگومان دەرئەنجامی ئەو ستەم و زەبرو زەنگەیە کە ڕژێم بەرامبەر کورد بەکاری هێناوە، چونکە بیٚ بەزیوو درندەیی ئەو ڕژێمە وای کرد بوو کە حاڵەتی تۆقاندنی دروستکردبوو لەناو کۆمەڵگادا بەتایبەتی ئافرەتانی بەجێماوی ئەنفال، ئەمەش لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوزرێتەوە.

**کاریگەری دیمۆگرافی**

ئامانجی سەرەکی هێرشەکانی ئەنفال لەنابردنی هێزی مرۆیی هەرێمی کوردستان بوو. بەتایبەت دانیشتوانی گوندەکان، چونکە پشت‌و پەنای شۆڕشی ڕزگاری خوازی

گەلی کوردستان بون، لە گوندەکاندا چالاکییە پارتیزانیەکانی پێشمەرگە سەرچاوەی دەگرت. بۆیە پەرتەوازەکردنو لەناوبردنی ئەو گوندانەو دانیشتوانەکەی لەڕیزی پێشەوەی حکومەتی بەغدا بوون، بۆ ئەوەی بالآنسی گەشەی دانیشتوانو زیادبونی دانیشتوان لە عێراقدا، زیاترو زۆرتر بەلای زۆرینەی عەرەبدا بشکێتەوە[19] شالآوی قرکردن لە بەشێکی کوردستاندا بۆتە هۆی کەم بونەوەی ڕێژەی کوردو هێنانە خوارەوەی ژمارەی دانیشتوان، ئەمەش تا چەند سالێك پێوەی دیار دەبێت و کاریگەری خۆی دەنوێنێت بە تایبەتیش لە دانیشتوانی دێهاتە ئەنفالکراوەکان[20] هەروەها شێواندنی سروشتی هەرێمی کوردستان لە ڕوی جوگرافیای دانیشتوانی کوردستانو ژمارەی کورد لە عێراق بگۆرێت، چونکە ئەگەر لەبۆچونی دیمۆگرافییەوە سەیری دانیشتوان بکەین لە سەر ژمێرییەکانی عێراق دەبینین ڕێژەی لە دایك بوون لە هەرێمی کوردستان زیاترە، وەك لەناوەڕاستو باشوری عیراق، ڕێژەی مرۆڤیش لەم هەرێمە کەمترە بەهۆی ئاوهەوای پاكو خاوێن و کەمی نەخۆشی، کەواتە دانیشتوان لێرەدا پەرە دەسەنێ و زیاد دەکات، جگە لەوەش ڕێژەی بەپیتی (خصوبة) ژنی کورد، بۆ هەر (١٠٠٠) ژن سالآنە (٩٧٧) مندالی دەبێت لەهەمان کاتدا هەر (١٠٠٠) ژنی ناوەراست و باشوری عیراق (٩٢٢) مندالی دەبێت[21] ئەم هۆکارانە وای کردوە ڕژێمی عیراق حساب بۆ ئە م ڕێژەیە بکات کە ڕۆژ بە ڕۆژ لەزیادبوندایە، چونکە بایەخێکی دیمۆگرافی هەیە بۆ گەلی کورد، بۆیە حکومەتی عێراق لەرووی ئەمنییەوە بیری لێکردۆتەوە و نەخشەی لەناوبردنی ئەم توێژەی گەنجانی داناوەو کە بەئەنجامدانی شالآوەکانی ئەنفال هەزارن پیاو ژنو گەنجیان لەناو برد، ئەمەش بەمەبەستی وەستانی گەشەی زیادبونی دانیشتوانو زەبر وەشاندن لەهێزی بەرهەم هێنی هەرێمی کوردستان، بەبیروبۆچونی (ڕاتزل) گەشەکردنو پەرەسەندنی دەولەتان لە سەر چەند یاسایەك وەستاوە، لەوانە، یەکەم: ڕوپێوی خاکەکەی ، دووم: زیادبونی ژمارەی دانیشتوان کە ژیانی کۆمەلآیەتی و ڕامیاری و ئابوری و فیکری و بەهۆیەوە گەشە دەکات[22]. ڕژێم لە شالآوەکانی ئەنفال دا ئامانجو مەبەستی تایبەتی هەبوو، بۆیەش بە چەند قۆناغێکی دیاری کراو و بەرنامە بۆ ڕێژراو، هەر قۆناغەی بۆ ناوچەیەکی جوگرافیو دیمۆگرافی یان زیاتر بەرێوەدەچوو[23].

هەر بەمەیەستی گۆرینی دیمۆگرافی هەرێمی کوردستان، ئەم ڕژێمە چەندان ڕێگەی گرتە بەر، بەزۆرداری خەلکی ناوچەکانی کەرکوكو مەخمورو شوێنەکانی تری ژێر دەسەلآتی

حکومەتی عێراق بەناوی (تصحیح قومی)  تەعریب کرد، جگە لەم ڕێگایانەش ڕژێم ڕێژەیەکی زۆر خەڵکی کوردستانی بەگرتن‌و لەسێدارەدان لەناوبرد، تاکار گەیشتە ترۆپێکی  تاوان کەشاڵاوەکانی ئەنفال بوو بۆ سەر  گوندنشینەکانی  کوردستان و شوێن بزرکردنی ژمارەیەکی زۆر و لەناوبردنی هەزارانی تریش بەچەکی قورسی کیمیایی[24] .

**کاریگەری سیاسی:**

لەڕوی سیاسییەوە جێبەجێکردنی شێوازە جیاجیاکانی قرکردنی کورد لە ئەنفال‌و کیمیاباران‌و کۆمەڵکوژی کورد لەچەند بەشێکی کوردستانی باشوردا لە ساڵی ١٩٨٨ شۆڕشی کوردی بەرەو شکستێکی گەورە برد، ئەگەر چی مەفرەزەی پارتیزانی پێشمەرگە لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان وەك (گەرمیان‌و قەرەداغ‌و شوان)و هەندێ ناوچەی هەولێر مابونەوەو ئێزگەکانی شۆڕشی کوردستان هەر کاریان دەکرد[25]

ئەنفال کارەساتێك بوو ڕەنگدانەوەی حیزبێکی تۆتالیتاری بەعس بوو، ئەمە سیاسەتی ئەم حیزبە بوو بۆ نمونە لە هەندێ لەوتارەکانی (موشیر ئەفلەق) دامەزرێنەری حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی یە لەساڵی ١٩٦٩ دەڵێ (وڵاتی عەرەبی پێکهاتووە لەو زەوی و بانانەی کەدەست پێدەکات لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە هەتا کە نداوی عەرەبی لەزنجیرە شاخەکانی تۆرۆسەوە ئەو کەمایەتیانەی  کەکەوتۆتە خواروی ئەوە زنجیرە شاخەوە، ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان کێشەیان بۆ یەکێتی عەرەب دروست کرد ئەوا ئەوانە ڕادەگوێزرێن). زۆر ڕونە کە ئەو وتەیە لەساڵی (١٩٦٩) وتراونەتەوە بەگوێرەی دیدی حیزبی بەعس میلەتی کورد کێشەی دروستکردووە بۆ نەتەوەی عەرەب لەبەر ئەوە ڕادەگوێزرێن‌و لەناو دەبرێن[26] ئەوەی ئاشکراو ڕونە لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفال، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ناوچە وێران کراوەکانی کوردستان پەراگەندەو پەرتەوازە بوونە بۆ هەر دوو وڵاتی دراوسێ (ئێران و تورکیا ) کە ژمارەیان زیاتر لە (١٦٠)  هەزار کەس دائەنرێت، بەڵام جێماوێك کە تورکیا بەو پەڕی دڕاندانە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن‌و ڕێگەی بە ڕێکخراوە مرۆییەکان نائەدا کەسەردانی خەڵکە پەنا هەندەکان بکەن، بۆیە بەناچاری ژمارەیەکی زۆریان گەرانەوە ژێر دەسەلاتی حکومەتی عێراق[27] سیاسەتی کۆمەڵکوژی کەبەسەر نەتەوەی کوردا هات لەئەنفالدا بەشێوەیەکی سەرەکی کاریگەرییەی ڕاستەوخۆی لەسەر خێزانی کورد دەرکەوت، چونکە ئەم  شێوە سیاسەتە ڕەگەز پەرستییەی حیزبی بەعس بەرامبەر بەتاك‌و خێزانی کورد ئەمانەی لێکەتەوە...

یەکەم: ئەندامانی خێزنی کورد کە بەشێکیان ئەندامی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردبون و لە پێناو بە ئامانج گەشتنی دۆزی کوردا تێدەکۆشان بەر پەلامارەکەی ئەنفال کەوتن و بێسەروشوێنکران.

دووەم: ئەو خێزانانەی کە یەکێك لەئەندامەکانی بەر پەڵامارەکانی ئەنفال کەوتن بەشێوەیەك لە شێوەکان خۆشیان ئامانجێکی تری ئەو پەلامارە بوون.

بەپێی ئەمە چ ئەو خێزانانەی ئەندامیان بەر پەلاماری ئەنفال کەوتون یان خۆیان ئامانج بوون،کاریگەرییە سیاسییەکان لەسەر ئەو خێزانە دەرکەوتن، چونکە ئەوان لەپێناو دۆزێکدا تێدەکۆشان کە بەدۆزێکی بنچینەی خۆیان دادەنا کەئەویش دۆزی سیاسیو بە ئامانج گەیاندنی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردبوو، خێزان و ئەندامانی خێزان کایگەری و پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ سیاسەتی کوردا دروست کردوە حیزبی بەعسیش بەهان تێروانینەوە تەماشای دەکردن، بەلای حیزبی بەعسەوە چ لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردو چ خێزانی کورد هەمان مەهامی سیاسیانەی بەعس دەپێکێت، هەر ئەمەش خاڵی جەوهەری بوو کە جینۆسایدی نەتەوەی کوردی لێکەوتەوە.

## پەراوێزەکان:

١- ئەمیر خواکەرەم، ئەنفال لە ڕەهەندە سیاسی و مێژوی و کۆمەڵایەتییەکاندا، چاوپێکەوتن، ساڵنامەی عەرعەر، ساڵی یەکەم_٢٠٠٦،ل١٠

٢-عەدالەت عومەر،ئەنفال و ئافرەتی کورد،چاپی یەکەم، هەولێر_٢٠٠٢،ل١١٢

٣-باوکی ناز، ئەنفال کاریگەری لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی گەلی کورد،ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ.٤٢١،سلێمانی_٢٠٠٦،ل٧

٤-یوسف دزەیی،ئەنفال،کارەسات و ئەنجام و ڕەهەندەکانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەلێر_٢٠٠١،ل٢٢٠

٥-ناهیدە تاڵەبانی،جاسم مەحەمەد،ئەنفالی گەرمیان و ڕەهەندە دیمۆگرافی و ئابوری و کۆمەڵایەتییەکانی، چاپی یەکەم، سلێمانی_٢٠٠٣،ل٩١

٦-ناهیدە تاڵەبانی، جاسم مەحەمەد،هەمان سەرچاوە،ل٩٧

٧-کوردەوان محمد سعید، تالانی،گۆڤاری چواردەی چوار، ژ.٣، ٢٠٠٥،ل٣

٨-چاوپێکەوتنی توێژەر

٩-محەمەد ڕەئوف عەزیز، ئەنفال و ڕەهەندە سۆسیۆلۆجییەکانی،ل٢٢٣-٢٢٤

١٠-ناهیدە تاڵەبانی، جاسم محمد، سەرچاوەی پێشوو،ل٦٩

١١-عەبدوڵا کریم، جینۆسایدی ئابوری، گۆڤاری هەشتاوهەشت، ژ.٥_٦،سلێمانی_٢٠٠٧،ت١٧١

١٢-عەدالەت عومەرسالح، شالاوی ئەنفال کاریگەری لەسەر باری ئابوری‌و دەرونی‌و کۆمەلایەتی ئافرەتی بەجێماوی ئەنفال،لێکۆلینەوە

١٣-تەها سلێمان، کاردانەوەی پەلاماری ئەنفال لەسەر ژنان، سەرچاوەی پێشوو،ل٦٩

١٤-پ.ی.د.محمد رەئوف، سالنامەی عەرعەر،سالی دوەم، چاوپێکەتن،ل٦

١٥-چاوپێکەوتنی توێژەر

١٦-د.کریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای ڕێنمایی دەرونی،زنجیرە بلاوکراوەکانی ئاسۆی پەروەردە،چاپی یەکەم،هەلێر_٢٠٠٥،ل٥٧_٥٨

١٧-شێخ صدیق،کاریگەری ئەنفال لەسەر دەرونی کۆمەلایەتی ناو پاشماوەکانی ئەنفالەکان،گۆڤاری سەنتەری برایەتی،ژ.٢٤،هەلێر_٢٠٠٢،ل٢٢١

١٨-چاوپێکەوتنی توێژەر

١٩-پ.ی.ناهیدە تالەبانی، جاسم محمد،ئەنفالی گەرمیان‌و رەوشی دیمۆگرافی،ئابوری‌و کۆمەلایەتی پاشماوەی ئەنفال،گۆڤاری سەنتەری برایەتی،ژ.٢٤،سەرچاوەی پێشو،ل١٨٠

٢٠-پ.ی.د. رەفیق شوانی، زاراوەی ئەنفال‌و ئەنفالی کورد و کاریگەرییەکانی،گۆڤاری هاواری ئەنفال،ژ.٢،٢٠٠٢،ل١٣

٢١-جزا توفیق طالب، سکان اقلیم کردستان،دراسة الجغرافیة السیاسیة، رسالة ماجستر مقدمة الی کلیة الاداب جامعة صلاح الدین، ١٩٩٥،ص٢٤٨

٢٢-د.ئازاد محمود ئەمین نەقشبەندی، جیۆلەتیکس، بۆچون‌و پێوەرەکانی، گ.سەنتەری برایەتی، ژ١، هەولێر _ ١٩٩٧،ل٣٣

٢٣-یوسف دزەیی، ئەنفال‌و کارەسات:ئەنجام‌و ڕەهەندەکانی،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،،چاپی یەکەم،هەولێر_٢٠٠١،ل٧٠

٢٤-یوسف دزەیی، تاوانی ئەنفال بەرامبەر بەکورد، گ.سەنتەری برایەتی، ژ.١٢، هەلێر_٢٠٠١،ل١٣

٢٥-پ.ی.د.رەفیق شوانی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٣

٢٦-یوسف دزەیی، ئەنفال‌و کارەسات: ئەنجام‌و ڕەهەندەکانی، سەرچاوەی پێشوو،ل٢٣٤

٢٧-د.ئەلبێرت عیسا، سەرچاوەی پێشوو،ل١١

# ئەنفالی چوار و کاریگەرییە کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر گەنجی کەسوکاری ئەنفال

هێمن کامیل

**سەرەتایەك دەربارەی گەنج**

وشەی گەنج لای هەر مرۆڤێكو لەکایەی هەر کۆمەڵگەیەکدا وشەیەکی ئاشکرایەو نامۆنیە، هەر کات کەباس لە گەنج ئەکەین لە خەیاڵدانی خۆماندا ئەتوانین ئەو مرۆڤە دەست نیشان بکەین کە گەنجە، ئەگەر وەك دۆخێکی کۆمەڵایەتی و قۆناغێکی سنوردار لەژیانی مرۆڤدا، زۆرتر دەبەسترێتەوە بە زەمەنێکی دیاریکراوەوە لە کۆمەڵگەدا، واتە زۆرتر چەند ساڵێك لەتەمەنی مرۆڤ نیشانەیە بۆئەوەی کە ئەگەر ئەو مرۆڤە لەبەرچاویشمان نەبێت ئەتوانین حوکمی گەنجێتی یان پیربونی بەسەردابدەین[1].

هەرچەندە زۆر هەوڵ هەیە بۆئەوەی کە چیدیکە گەنج تەنها ئەو کائینە نەبێت کەدەستی دەخرێتە سەرو دیاری دەکرێت لە قۆناغێکی تەمەندا، بەڵکو ئەوقۆناغە درێژبکەینەوەو بەگۆڕانی تەمەنیش ڕوحیەتی گەنج درێژە پێبدرێت. لاسیمۆن فریس لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەناونیشانی (سۆسیۆلۆژیای گەنجێتی) ئاماژە بەم خاڵەدەداو تەنانەت دەڵێت لەسەدەی بیستەم بەدواوە مرۆڤی خۆرئاوایی هەوڵدەدات تەمەنی گەنجێتی درێژبکاتەوە. درێژبونەوەی ماوەی قۆناغی وەرچەرخان لەمنداڵیەوە بۆ کامڵبون کارێکی وایکردوە کە قسەکردن لەگەنجێتی و باری کۆمەڵایەتی و دەرونی گەنج ببێتە مەسەلەیەکی گرنگی سەردەم، واتە دوای ئەوەی مرۆڤ بێئومێدبوو لەوەی تەمەنی گەنجێتی لەڕوی بایۆلۆژیەوە درێژبکاتەوە ئێستا خوازیاری ئەوەیە ئەو تەمەنە لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە درێژبکاتەوە[2].

ئەگەرچی کۆمەڵگە بەبێ گەنج نابێت بەڵام ئەمە مانای ئەوەنیە کەپێگەو گرنگی گەنج لەهەموو کۆمەڵگاکاندا وەکو یەکە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێتو لەهەندێ کۆمەڵگەدا گەنج مانای گەنج بونی خۆی لەدەستدەداتو ناتوانێت بەپێی ئەو قۆناغەی کەتیایدایە بژێتو کەسێتی خۆی بنیات بنێت.

لەکۆمەڵگای داخراو و نەریتپارێزدا گەنج خاوەنی کەلتوری خۆی نیە، گەنجەکان دابەشدەبن بەسەر حیزبەکان‌و خێڵەکان‌و ناوچە جیاوازەکاندا. گەنج خاوەنی سیمبول‌و پاڵەوانی خۆی نیە، بەڵکو هەمیشە یادەوەرییەکی لێ باردەکرێ کەهی نەوەی خۆی نیەو لەجەوهەردا نامۆیە بەرامبەری، بەڵام بەڕوکەش شتێکی دیکە دەردەخات.

گەنج لەکۆمەڵگەدا خاوەنی پێگەیەکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی پتەو نیەو خاوەنی فەلسەفەیەکی دیاریکراونیە بۆ بەرگریکردن لە شوناس‌و جیاوازی خۆی، ناچارە پەنابەرێتە بەر کەلتورێکی جیاواز کە ڕەنگە لەڕوی فکری‌و لۆژیکیەوە قوڵ نەبێت، بەڵام لەڕوی سیماو دیکۆرەوە تەواو جیاوازە. واتە گەنج بەرلەوەی دەستکاری سیستمی بەها فیکریەکان بکات هەوڵدەدات بەبێ بونی تیۆرێکی کۆمەڵایەتی پێشوەخت دەستکاری واقیعی کۆمەڵایەتی بکات[3].

بەم پێیەش بێت دەتوانین بڵێین گەنج بونەوەرێکی ناواقیعیە، بەپێچەوانەی پیرەوە بەوردی پەیڕەوی یاساکانی واقیع دەکات، هەڵبەتە کە ناواقیعیبونی گەنج کەلە کۆمەڵگەی پیردا (لەنمونەی کۆمەڵگەی کوردی) وەك نیشانەی ناکامڵی‌و نەزانی گەنج سەیری دەکرێت، یەکێکە لەگرنگترین ئەو بەهایانەی کەپێویستە گەنجان پارێزگاری لێ بکەن وەك خەسڵەتێکی ڕەسەنی گەنجانە بیناسێنن، مرۆڤی واقیعی (پیر) هەمیشە بەو شێوەیە مامەڵەدەکات کەدەشێت ببێت، بەڵام مرۆڤی ناواقیعی (گەنج) بەو شێوەیە ڕەفتاردەکات کەدەبێت بێت. هەربۆیە دەبینین لە ڕاپەڕین‌و شۆڕشەکاندا هەمیشە گەنجان پێشڕەون چونکە ئەوان پەیڕەوی لە یاساکانی واقیع ناکەن، ئەوەیە وادەکات گەنج بە ژمارەیەکی کەمەوە ڕوبەڕوی ئیمپراتۆریەتێك ببێتەوە لەکاتێکدا بە لای پیرەکانەوە کە پەیڕەوکاری یاساکانی واقیعن هەرگیز ناچێتە عەقڵەوە چەند کەسێکی کەم بتوانن کودەتا لە ئیمپراتۆریەتێك بکەن. کەواتە گەنج بونەوەرێکی یاخیەو یاخیبون‌و تەسلیم نەبون بەئەمری واقیع لە خەسڵەتە هەرە گرنگەکانی گەنجن کە کۆمەڵگەی پیر توانای قبوڵکردنی نیەو هەمیشە دەیەوێت وەکو نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی‌و دەرونی بیناسێتەوە[4].

بەشێوەیەکی گشتی گەنج لە کۆمەڵگەی کوردیدا هەمان ئەو خەسڵەت‌و خاسیاتانەی تێدایە کە لە هەر کۆمەڵگەیەکی دیکەی مرۆییدا هەیە بەڵام بەهۆی زیاتر داخراوی کۆمەڵگەی کوردیەوە گەنج نەیتوانیوە گوزارشت لەهەموو ئەو حەزو خەونانەی هەیەتی

بکات. بەڵکو گەنجی کورد پەیوەستەبەداب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتیەکانەوە ، چونکە زۆر بەئاسانیی و بەسانایی گەنجی کورد لەنێو کۆمەڵگەدا دەژیی و ، لەدەرەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکەیدا ژیان ناگوزەرێنێ، ڕاستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ لەباوانیەوەبێ یاخود لەڕێگەی گەڕەك و قوتابخانەو دەزگاکانەوە پەیوەست و وابەستە دەبێت بەهێڵە گشتیەکانی داب و نەریتی کۆمەڵایەتیەوە، پەروەردەکردن لەم کۆمەڵگەیەدا جا ئەگەر یەکەمین وانەکانی لەخێزانەوە پەخش بکرێت و وانەکانی دیکەی لەقوتابخانەو دەزگاکانەوە تەڵقین بکرێت، پەروەردەیەکەو بارگاوییە بەداب و نەریتی تراديسيۆنی کۆن و باو لە ئاین و خێڵ و خورافەو پوچگەراییەو سەرچاوەی گرتوە بۆیە بە ئاشکرایی دیارە. کە هۆکارو کەناڵەکانی گەیاندن و تۆخکردنەوەی ئەو داب و نەریتە لەکوێوە دێن و بۆ کوێ دەچن. ئەگەر گەنجی کورد ببەینە ڕۆژئاواو ئەمریکاو پاش بیست ساڵێك بیگێڕینەوە بۆ ئەم کۆمەڵگەیە دەبینین وبەستەیەکی ئەو گەنجە بەداب و بەها کۆمەڵایەتیەکانەوە زۆر کاڵتربوەتەوە[5].

هەرچەندە بەهۆی ئەو گۆڕانە سیاسی و ئابوری و کلتوری و فەرهەنگیەوە کە بەسەر کۆمەڵگەدا هاتون، چیدی تاکەکانی کۆمەڵگەو گەنجانیش وەك توێژێك دەیانەوێت لە پەراوێزدا نەمێنن و، ئەوەش بەچاو هەستی پێدەکرێت و بەردەوام لەشێوەی ناڕەزایی بووندا خۆیان دەردەخەن و دەیانەوێت بڵێن ڕازیبون بە واقیع بەرەو کۆتایی دەڕوات و دەبێت بیگۆڕین بەشێوەیەك کە لە ئاستی وەڵام و پێداویستیەکانی ئەمڕۆی گەنجاندا بێت.

**باردۆخی گەنج لە ئەنفالی چواردا**

خەڵکی ناوچەکانی زێی بچوك لەپێش هێرشی ئەنفال بۆسەر ناوچەکەیان ژیانێکی ئاساییان دەگوزەراند و هەرگیز بیریان لەوەنەدەکردەوە کە بەدەردی هەمان ناوچەکانی دیکەی ئەنفالی یەك و دوو سێ بچن، ئەوەبو ڕژێم لەڕۆژی (١٩٨٨/٥/٣) هێرشی ئەنفالی بۆ سەر ئەم ناوچەیە دەست پیکردو لە هەموو لایەکەوەپەلاماری ناوچەکەیدا. ژنێکی خەڵکی گوندی کلێسە دەڵێت ماوەیەك بوو دەنگوباسی ئەوەهەبوو کە حکومەت هێرشی بۆ ئەم سنورە هێناوە، بەڵام ئێمە دڵمان نەدەهات گوندەکەمان بەتەواوی چۆڵ بکەین، بۆیە لەدەوروبەری گوندەکەو لە ئەشکەوتەکاندا بە نایلۆن کونێکمان دروستکردبوو تیایدا دەژیان، بەڵام کەهێرشیان هێنا بەرەو کلێسە، دواشەو کەسوپاو جاش

بەبەردەماندا دەڕۆیشتن منداڵێكی چل ڕۆژەمان پێبوو دەگریا، ئێمە بۆئەوەی ئاشكرانەبین دەممان گرت بۆئەوەی نەگرییەت، باشبوو ئاشكرانەبوین. شەو بەپێ ڕۆیشتن بۆبەری گوڵ قامیش و لەژێر زەمینێكداماینەوە، دوای سێ ڕۆژ مانەوەمان لەژێر زەمینەكەدا سێ جاش بەسەرماندا كەوتن.

یەكێكی دیكە دەڵێت ئەم گوندەی ئێمە زۆربەی گەنجەكانی هێزی بەرگری بوون و بیرباوەڕی كوردایەتیان بەهێزبوو یەك جاشمان نەبوو، پێش ماوەیەك لەهاتنی سوپای ڕژێم چوینە دەرەوەی گوندەكەمان لە ئەشكەوت و كوختیەو شاخەكاندا بەكولەمەرگی دەژیاین، چونكە ڕۆژانە تۆپباران دەكراین و دواتر جاشەكان كوڕی ئەمیان گرت و جاشەكان زۆر خراپ بوون[6]. پیرەژنێكی خەڵكی گوڵم كەوەی شوان باس لەوەدەكات دوای ئەوەی لەلایەن جاشەكانەوە دەستگیردەكرێت دەگوازرێتەوە بۆ لیوای چەمچەماڵ كە خەڵكێكی زۆری لە خەڵكی گوندەكان لێ بوو كە دواتر دەیانگواستنەوە بۆ تۆپزاوەی كەركوك و خەڵكەكەیان لەیەكتری جیادەكردەوە، كوڕی گەنج بەجیاو كچی گەنج بەجیا و پیرەمێردو پیرەژن لەلایەك و ژن و منداڵیش لەلایەكی تر[7]. هەروەها شێوازێكی تری ئەنفالیش كەدەكرێت بەچنینەوەی پاشماوەی ئەنفال ناوی بەرین ئەو حاڵەتەیە كە ڕژێمی عێراق بۆ كۆكردنەوەی ئەو گەنجانەی كەلە ئەنفالدا لە گوندەكانی خۆیان ڕزگاریان بووبوو هاتبوونە شارەكانەوە. ئەمەیان لەڕێگەی موستەشارە كوردەكانەوە جێبەجێكراوە، كەپێیانی ڕاگەیاندوە كە داوبكەن ئەوانەی كە سەربازی فیراریان هەیە هەر گەنجێكی تر كەلە گوندە ئەنفالكراوەكانەوە هاتونەتە شارەكان دەتوانن لە فەوجەكانی خەفیفە (افواج الخفیفە)دا خۆیان ناونوس بكەن و وەرەقەیان بۆ دەكرێت كە نەگیرێن، كە زوتر ڕێگە بە موستەشارەكان نەدرابو بەڵكو بگرە هەڕەشەیان لێكرابوو كەنابێ تەنها كەسێك بگرنە خۆتان. بۆیە هەر دوای ئەو بڕیارە دەرگاكردنەوەی فەوجەكان بۆ (نەشر)كردنی ئەو خەڵكانەی كە لە دێهاتەكانەوە ڕزگاریان بوەو ئێستا لە شارو شارۆچكەكان ئۆردوگا خۆیان پەنادابوو. بۆیە دەبینین ژمارەیەكی زۆری گەنجە دەربازبوەكان لە قوتی ئەنفال، ئەمجارە دەچنەوە بەردەم چەقۆی زۆردارو لە ڕیزەكانی بەناو (بەرگری نیشتیمانی)دا خۆیان ناونوسدەكەن و دواتر یەكی چەكێكیان پێدەكرێن بە بیانوی ئەوەی كەدەبێ هەركەس چەكی خۆی پێبێت ئەوسا وەردەگیرێت و وەرەقەی بۆ دەكرێت. دوای چەكداركردنیان ئەوسا هەمویان دەبرێن بۆ كەركوك و لە سەربازگەی

خالیددا کۆدەکرێنەوەو وێنەیان دەگیرێت‌و لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندندا بلاۆوەکرێتەو کردۆتەوە. چەندین شایەتحاڵ هەن کەوێنەی کەسوکاری نزیکی خۆیان بەو شێوەیە بینیوە کە لە تەلەفزیۆنی عێراقیەوە بەو شێوەیە نیشاندراون[8].

خەڵکی ئەو گوندانەی لە ئەنفالی چواردا لە شوێن‌و ئاوایی خۆیانەوە ڕاپێچکران، لەوەوپاش بردنیان بۆ لانیکەم سێ سەنتەری کۆکردنەوەی خەڵکەکە لە دۆڵی زێی بچوکدا. ژمارەیەك لە گیراوەکانی گۆمەشین‌و هەندێ گوندی تر لە دوای گرتنیان ماوەی سێ ڕۆژ لە هەرمۆتە هێشتیانەوە کە سەربازگەیەکی نزیك کۆیسنجەق بوو. کۆمەڵگای تەکێ کەلە ١٩٨٧لە سەر ڕێگای سەرەکی لە ڕۆژهەلاتی چەمچەماڵ دروستکرابوو، یەکەم قۆناغ وەستانی ئەو ئیڤایانەبوو کە دەربازبوانی هێرشە کیمیاوییەکەی گۆپتەپەو دەوروبەریان پێ دەگواستەوە. شارۆچکەی تەقتەق خۆی سەنتەێکی ناوچەی گرنگ بوو بۆ نزیکەی دەهەزار کەسی خەڵکی باکوری زێی بچوك‌و بو بەشوێنێکی سەرەکی مۆڵدانی ئەو خەڵکەی لە ئەنفالی چوارەمدا ڕەشبیگیر کران[9]. زۆربەی ئەوانەی کەخۆیان بەر شالاوی ئەنفال کەوتون‌و دواتر لە سەفەری مەرگ گەڕاونەتەوە باسی ئەوەدەکەن کە لە سەربازگەی (تۆپزاوا) کچە گەنجەکان جیاکراونەتەوەو بەشێك لەوانەی لە سەربازگەی (دوبز) زیندانی بون پێ لەوەدەنێن کە زۆرجار کۆمەڵێ سەربازهاتون‌و هەرکچێ جوان بوایەو بەدڵیانبوایە ئەیانبردو بڕای بڕ کەس نەیبینیەوە.

هەروەها چەندین شایەتحاڵ هەن بەچاوی خۆیان بینیوانە هەر لەگوندەکەیان لەکاتی دەستگیرکردن‌و گواستنەوەیاندا بۆ کەمپەکانی زیندانیکردن، ئەفسەری سەربازی هەر بە بەرچاوی خەڵکەکەوە کچی جوانی خستۆتە سەیارەکەی خۆیەوەو بەجیا بردویەتی. چەندین ئەفسەرو سەربازیش هەرکاتی خۆی ئەوەیان گێڕاوەتەوە کەئازادکراون لەوەی هەرچییەکیان بویێت‌و مەبەست بێ لەبەرامبەر دەستگیرکراوەکان ئازادن لەپیادەکردنیدا. قسیەکیش هەبو لەسەرئەوەی کە ئەو کچە گەنج‌و جوانانەی کورد فرۆشرابێتن بە ولاٚتانی کەنداو. کاتێك خەڵکی لەچەند ساڵی ڕابردودا چونەتە (حەج) ژنی کوردیان لەوێ بینیوەو وتویەتی لەسەردەمی ئەنفالدا کڕاوم‌و دراوم بەم ولاٚتە[10]. هەروەها شایەتحال نەزیرە محەمەد کەخۆی ڕزگاربویەکی ئەنفالەو دەڵێ لە تۆپزاوا لە پەنجەرەی قاعەکەوە سەیری دەرەوەمان دەکرد هەمووی هەر خەڵك‌و سەیارەو قاعەبوو. ئەمانیش چۆن زەلامیان (پیاو) جیادەکردەوەو باریان دەکرد وەجبەی واهەبوو دەست‌و چاویان بە

پشتوێن‌و جامادانەکەی خۆیان ئەبەستەوەو ئەوجا باریانیان دەکرد. ڕۆژێکی دیکە هاتن‌و کەوتنە جیاکردنەوەی خەڵکەکەو هەرچی زەلامیَ کە گەنج بوو گشتیان جیادەکردەوە بەیەك ڕاکێشان لەناو قاعەکە بردنیانە دەرەوەو هەر لەبەردەم قاعەکاندا چاومان لیَ بوو ئەیان خستنە ناو سەیارەی داخراوەوەو ئەیانبردن(11).

**بوارەکانی توێژینەوە:**

١- بواری جوگرافی: شوێنی ئەنجامدانی توێژینەوەکە سنوری ناوچەی ئەنفالی چوارە، کە تیایدا هەردوو ناحیەی ( تەکیەو شۆڕش)هەڵبژێردراوە، هەڵبژادنی ئەم دوو شوێنە بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە:

*چونکە ئەم دوو شوێنە بەشێکی زۆر خەڵکانی ناوچەی ئەنفالی چواری تێدا نیشتەجێیە، ئەنفالی چوار بەدووەم قۆناغی ئەنفال دادەنرێت لەڕووی زۆری زەروزیانە گیانی ومالیەکانەوە.

* سنورە جوگرافیەکەی دیاری کراوە.

٢- بواری مرۆیی :هەموو ئەو گەنجانە دەگرێتەوە کە کەسوکاری ئەنفالن وکەسێك یان زیاتریان لە ئەنفالدا بێسەروشوێنکراون.

٣- بواری کات : ئەو ماوەیە دەگرێتەوە کە توێژینەوەکەی تێدا ئەنجامدراوە لە سەرتاوە تا کۆتایی کارەکە، کەنزیکەی پێنج مانگ ونیوی خایاندووە. (١٠ی کانونی یەکەم تا ٢٥ی ئایاری ٢٠٠٦)

**کەرەستە ئاماریەکان:**

ڕێژەی سەدی : ئەم ئامرازە سودمەندە بۆ دیاریکردنی ڕێژەی هەر بەشێك لە چاوبەشەکانی تردا(١).

بە پێی ئەم یاسایە :

بەش ÷کۆ×١٠٠

**ئاسەنگەکانی توێژینەوە:**

هەموو توێژینەوەیەك گیروگرفت وئاستەنگی دێتەڕێ ئەم توێژینەوەیەش چەند ئاستەنگێکی هاتە پێش کە دەکریَ لەم خالأنەی خوارەوەدا بخرێتەوەڕوو:

١- نەبوونی شوێنێك کە گەنجانی تێداکۆببنەوە وەکو سەنتەرێکی ڕۆشنبیری یاخو کتێبخانەیەك بۆیە توێژەر دەبوو لە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەدا کاتێکی زیاتری بیوێت بۆ وەرگرتنی نموونەکە.

٢- وەرگرتنی كچانیماڵەوە بە تایبەتی نەخوێندوار وەك بەشێك لە نموونەكە كارێكی تاڕادەیەك زەحمەت بوو .

٣-نەبوونی هۆكاری گواستنەوەی تایبەت بۆ چوون بۆ كۆمەڵگەی توێژینەوەكەو هەروەها گەڕانێكی زۆر بە پێ .ئەمە جگە لەوەش نەبوونی پاصی ناوخۆیی لەو شوێنانەدا كارەكەی گران كردبوو چونكە ماندبونێكی زۆری ویست .

بەڵام لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا بە هۆی ئەو هەڵسوكەوتەی توێژەر پیویستە لە مەیداناو لە كۆمەڵگەی توێژینەوەدا جێبە جێی بكاو لە بەرچاوی بگرێت،توانرا وا لە گەنجانی كەسوكار ئەنفال بكرێت كە بە پەرۆشەوە وەڵامی سەرجەم پرسیارەكان بدەنەوە.سەرەڕای بێزاریی وتوڕەییەكی زۆر لە ناخی هەر یەكێكیادا، لە بەرامبەر فەرامۆشكردنی خۆیان وناوچەكەیان لە زۆری لە بوارەكانی ژیاندا.

**خشتەی ژمارە (١)ئەوە دەخاتە ڕوو كە تاوەكو بزانرێت كە ئایا گە نجی كەسوكاری ئەنفال ژیانی منداڵی بە ناسروشتی و دوور لە خۆشیەكانی منداڵی بە سەر بردووە.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٣ | ٨٣ |
| نەخێر | ٩ | ٩ |
| تاڕادەیەك | ٨ | ٨ |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (١) دەردەكەوێت كە ڕێژەی لە ٨٣ ٪ی نموونەكە ژیانی منداڵیان بە ناسروشتی ودوور لە خۆشیەكانی منداڵی بە سەربردووە.ئەمەش كاریگەری ئەنفال دەردەخات لە سەر ژیانی منداڵ.چونكە هەموو قۆناغێكی تەمەن تایبەتمەندیو خۆشی خۆی هەیە.كە دەبێت بۆی دەستە بەربكرێت وتا بتوانێت حەزوئارەزووەكانی ممارسە بكات.بەڵام ئەو ڕێژە بەرزەی نموونەكە ئەوە پیشان دەدات كە منداڵی كەسوكاری ئەنفال نەیاتوانیوە بە سروشتی ئەو قۆناغەی تەمەن بە سەر بەرن وبەڵكو بە پێچەوانەوە ئەو بارودۆخەی دوای ئەنفال تێدا ژیاونیان گوزەراندووە ناخۆش بووە.

**خشتەی ژمارە ( ٢ )ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا نموونەکە لە قۆناغی منداڵیدا هیچ جۆرە کارو کاسبیەکی کردووە.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٦٣ | ٦٣ |
| نەخێر | ٣٧ | ٣٧ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە ( ٢)دەردەکەوێت کە ڕێژەی لە ٦٣٪ی نموونەکە لە قۆناغی منداڵیدا بۆ دابینکردنی بژێوی خێزانەکانیان پەنایان بردۆتە بەر کاروکاسبی .ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤی ئەنفال پیشاندەدات لە سەر کەسوکاری ئەنفالکراوەکان. چونکە منداڵ ئەگەر لەم قۆناغەدا ناچاربووبێت کاری کردبێت ئەوە بە دڵنیاییەوە نەیتوانیوە وەکو منداڵ بژێت. ئەمە جگەلەوەش پەروەردەکردنیان بە شێوەیەکی دروست نابێت، لە بەرئەوەی ئەو منداڵە لەوانەیە ڕۆژانە لە شوێنی کار تێکەڵی لە گەڵ هەموو جۆرە مرۆڤێك کردبێت. هەروەها لەوانەیە ئەو منداڵە جۆری کارەکەی لە گەڵ تەمەنەکەی دا نەگونجابێت وئەمەش دواجار کاریگەری کۆمەڵایەتی ودەروونی دەبێت لە سەر کەسێتی ئەو منداڵە. هەروەها زۆرترین ئەو منداڵانەی کاریان کردووە لە ڕەگەزی نێرن ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە داب ونەریتی کۆمەڵگە بە گونجاووشیاوی نازانێت کە کچان لە تەمەنی منداڵیدا کاروکاسبی بکەن. بەڵکو چوونە دەرەوەی ماڵ بۆ ڕەگەزی نێر ڕێگە پێدراوە ئەگەر چی تەمەنی زۆر کەمتریش بێت لە ئەندامێکی ڕەگەزی مێی خێزانەکەی.

**خشتەی ( ٣ ) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا بارودۆخی قۆناغی منداڵی کاریگەری هەیە لە سەر کەسێتی گە نجی کەسوکاری ئەنفال.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٦ | ٨٦ |
| نەخێر | ١ | ١ |
| تاڕادەیەك | ١٣ | ١٣ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت کە ڕێژەی لە ٨٦٪ی نموونەکە ئەو بارودۆخەی لە ژیانی منداڵیدا تیایدا ژیاوە کاریگەری لە سەر کەسێتی بە جێهێشتووە وەکو گەنجێك. ئەو بارودۆخەش بارێکی نائاسایی بووەو پڕ لە ناخۆشی و کێشە بووە، ئەمەش بە تێوری دەروونناسی ڕاستە کە زۆرێك لە زانایان لە گەڵ ئەوە ن ئەو بارودۆخەی منداڵ لە ساڵەکانی یەکەمی تەمەنیدا تیایدا دەژێت لە قۆناغەکانی دواتری تەمەنیدا ڕەنگ دەداتەوەو شوێنەواری لە سەر کەسێتی ئەو تاکە دەردەکەوێت.تەنها لە ١ ٪ی نموونەکە پێی وایە کە ئەو بارودۆخەی لە قۆناغی منداڵیدا تیایدا ژیاوە کاریگەری نیە لە کەسێتیەکەی وەك گەنجێك، کە بەڕاستی ئەم ڕێژەیە زۆر کەمە و نیشانەی ئەوەیە کە گەنجی کەسوکاری ئەنفال تا هەنوکە لە ژێر باری خراپترین قۆناغەکانی تەمەنیاندا دەناڵێنن، کە تەمەنی منداڵیانە دوای پرۆسەی ئەنفال.

**خشتەی (٤) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا گە نجی کەسوکاری ئەنفال کەسێکی تورەو هەڵچووە**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە ٪ |
|---|---|---|
| بەڵی | ٧٣ | ٧٣ |
| نەخێر | ٢٧ | ٢٧ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٤)دەردەکەوێت کە ڕێژەی لە ٧٣ ٪ی نموونەکە کەسانێکی تورەو هەلچوون, دیارە ئەمە ڕێژەیکی ئاسایی نیەو بە هۆی ئەو کاریکەرییە سایکۆلۆژیانەوەیە کە ئەنفال لە دوای خۆی بە جێی هێشت, چونکە ئەو بارودخە دەروونی وئابووری وکۆمەڵایەتیەی گەنجی کەسوکاری تێدا دەژێت. بێگومان دەرئەنجامێکی وای لێدەکەوێتەوە.

**خشتەی ژمارە (٥) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا گە نجی کەسوکاری ئەنفال بەردەوام هەست بە شەرم وکەموکوڕی دەکات.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٣ | ٨٣ |
| نەخێر | ١٧ | ١٧ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە ٥ دەردەکەوێت کە ڕێژەی ٨٣٪ی نمونەکە بەردەوام هەست بەکەموکوڕیو شەرم دەکەن، ئەمەش دەرئەنجامی ئەو بارودۆخەیە کە نموونەکەی تێدا ژیاوەو بە جۆرێك کاریگەری لە سەر کەسێتی دروست کردووە کە بەردەوام هە ست بە شەرم وکەموکوڕی بکەن. کەواتە ئەنفال تەنها نەبووە بە هۆی لە ناوبردنی هەزاران تاکی کورد بەڵکو ئەوانەشی کە ئێستا لە ژیاندا ماون و زیان لێکەوتووی ئەو کارەساتەن. کە ئەنفال ژینگەیەکی بۆ دروست کردن کە کەسوکاری ئەنفال بە تایبەت گەنجانی کەسوکاری ئەنفال کە زیاد لە هەر قۆناغێکی تەمەن و توێژێك ئەمڕۆ لە بارێکی ئاڵۆزو شێواو و نالەباری دەروونیدا دەژین.

**خشتەی ژمارە ( ٦ )ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا گە نجی کەسوکاری ئەنفال جۆرێك لە بێ ئیرادەیی وڕاڕایی لە ناخدا دروست کردووە.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٧٥ | ٧٥ |
| نەخێر | ٥ | ٥ |
| تاڕادەیەك | ٢٠ | ٢٠ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٦)دا دەردەکەوێت کە ڕێژەی لە ٧٥ ٪ی نموونەکە هەست دەکات کەسێکی بێ ئیرادەو ڕاڕایە. واتە سێ بەشی نموونەکە کەسانێکن خاوەن ئیرادەیەکی بە هێز نین وئەمەش کاریگەری ئەنفالە لە سەر کەسێتیان و ئەو هەلومەرجەی تیایدا پەروەردەبوونە وایکردووە کە نموونەکە گیانی بڕوا بە خۆبوونیان تێدا دروست نەبێت، ئەمە جگە لەوەش نمونەکە کەسانێکن هەمیشە لە دڵەڕاوکێ و ڕاڕایدا بژین. ئەمەش وادەکات کە ئەم جۆرە کەسانە لە بارێکی ناجێگیری دەروونیدا بژین.

**خشتەی ژمارە ( ٧ ) ئەوە دەخاتە ڕوو کە کام لە مانەی خوارەوە هۆکاربووە لە نەچوونە بەر خوێندن یان وازهێنانی نموونەکە لە یەکێك لە قۆناغەکانی خوێندندا.**

| هۆکارەکان | ژمارە | ڕێژە٪ |
|---|---|---|
| ئابوری | ٢٩ | ٦٣ |
| کۆمەڵایەتی | ١١ | ٢٣,٩ |
| سیاسی | ٣ | ٦ |

| | | |
|---|---|---|
| دەرونی | ١ | ٢ |
| هۆکاری دیکە | ٢ | ٤ |
| کۆی گشتی | ٤٦ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٧)ئەوە دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٦٣٪)ی نموونەکە بە هۆی نزمی وخراپی باری ئابووریو بژێو ییەوە نەیان توانیوە بچنە بەر خوێندن یاخود لە یەکێك لە قۆناغەکانی خوێندندا وازیان هێناوەو نەیان توانیوە درێژە بە خوێندن بدەن ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە خراپی باری ئابوری کاریگەری لە سەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیان داناوە لە ناو گەنجی کەسوکاری ئەنفالداو لە سەرووی هەموویانەوە بووە بە هۆکاری سەرەکی زۆرینەی نموونەکە لە وازهێنانیان لە خوێندن.

**خشتەی ژمارە ( ٨ ) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئایا گە نجی کەسوکاری ئەنفال پێی وایە ئەگەر ئەنفال نەبوایە لە ژیانێکی باشتردا دەبوو بە بەراود لەگەڵ ئێستا.**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژە ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٩٠ | ٩٠ |
| نەخێر | ٣ | ٣ |
| تاڕادەیەك | ٧ | ٧ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٨)دا ئەوە دەردەکەوێت کە ڕێژەی لە (٩٠)ی نموونەکە لە گەڵ ئەوەدایە کە ئەگەر ئەنفال نەبوایە ئەوا لە ژیانێکی باشتری لەئێستا دەبوو.ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییە کە گەنجی کەسوکاری ئەنفال ناڕازییە لەو جۆرە ژیانەی ئێستای وناخۆشیەکانی ژیانی لە ڕووی ئابووریو دەروونی وکۆمەڵایەتیەوە.کە بە هۆی ئەنفالەوە بە سەریدا هاتووە کە ئەو برواییەی هەیە کە ئەنفال نەبوایە ئەوە لە ژیانێکی شیاولە باردا دەژیاو گیرۆدەی ئەو ڕەزالەتە نە دەبوو کە ئەنفال بۆ ژیانی دروستی کرد.وەك لە خشتەکەدا دیارە تەنها ڕێژەی ٣٪ی نموونەکە بۆچوونی وانیە کە ئەگەر ئەنفال نەبوایە لە ژیانێکی باشتر لە ئێستا دەژیا.ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر کەمە.

## پەراوێزەکان:


١. د. بەختیار جەبار شاوەیس, گەنج- سیاسەت- معریفە, سلێمانی, ٢٠٠٦,ل: ٣٣.

٢. شاهۆ سەعید, گۆمەڵگای گەنج – گۆمەلگەی پیر, گۆڤاری ڕەهەند, ژمارە ١٦- ١٧, سلێمانی, ٢٠٠٤, ل:١٣.

٣. شاهۆ سەعید،هەمان سەرچاوە،ل:١٥.

٤. هێمن باقر, گۆمەلگەی پیرو گۆمەڵەی گەنج,رۆژنامەی ئاسۆی گەنج, سلێمانی, ژمارە ٥, ٢٠٠٦, ل:٥٦.

٥. حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ, پێگەی گەنج لە گۆمەلگەی کوردیدا, گۆڤاری سۆسیۆلۆجیا, سلێملنی, ژمارە ١, ٢٠٠٥, ل: ١٠٥.

٦. سیروان محەمەد،سەرچاوەی پێشوو،ل:٢٧٨.

٧. عارف قوربانی, شایەتحاڵەکانی ئەنفال, بەرگی سێیەم, چاپی یەکەم, سلێمانی, ٢٠٠٢, ل:١٤٩.

٨. عارف قوربانی, دیوی ناوەوەی ئەنفال لە زمانی ئەنفال دیدەکانەوە, گۆڤاری ئەنفال, ژمارە٣, سلێملنی, ٢٠٠٢, ل:١١٠.,.

٩. میدڵ ئیس وۆچ، سەرچاوەی پێشوو،ل: ٣٣٣.

١٠. عارف قوربانی, شایەتحاڵەکانی ئەنفال, بەرگی دووەم, چاپی یەکەم, سلێمانی, ٢٠٠٢, ل:٨.

١١. عارف قوربانی, دیوی ناوەوەی ئەنفال لە زمانی ئەنفال دیدەکانەوە, گۆڤاری ئەنفال, ژمارە٣, سلێملنی, ٢٠٠٢, ل:١١٠.

# ئەنفالی بناری گل

## لێکۆڵینەوەیەکی دیموگرافی—سیاسیە

توێژەران

( بەختیارمحمد امین ) ( مزفرصالح قادر )

**کورتەیەکی مێژووی و جوگرافی لەسەر بناری گل:**

بناری گل لە (14 تا 17) گوندێك پێکهاتووە کەسەر بە ناحیەی قادرکەرەمە لە قەزای دووزخورماتوو کەسەر بە پارێزگای کەرکوکە دەکەوێتە باشوری رۆژئاوای هەرێمی کوردستان[1]، هەرێمێکی زۆر کۆنە دەکەوێتە نێوان هەردوو رووباری :

یەکەم: ئاوە سپی کە شۆردەبێتەوە بەلای خۆرهەلاتی تا باشوری

دووەم: رووباری رۆخانەیە کە لە باکوریەوە تێدەپەرێ [2].

هەرلەبەر ئەم کۆنیەیەتی لەسەردەمانێکی زوودا ناحیە بووە, کاتێك مەدحت پاشا کە سوڵتانی عوسمانی بووە لە ساڵی (1869—1872ز) عێراقی دابەش کردووە بۆ دوو ویلایەت ئەویش بەغداد و موصلْ بوو کە هەریەکەیان لەچەند سەنجەق وناحیە پێکهاتبوون, ناحیەی گلیش ناحیەکی سەرەکی سەنجەقی کەرکوك بوو[4] . وەلە ساڵی 1875ز گل یەکێك لە ناحیە سەرەکیەکانی لیوای کەرکوك بوو[5]، بەهەمان شێوە لەساڵی 1912ز ناحیەی گل یەکیك بوو لە پێنج ناحیە سەرەکیەکەی سەنجەقی کەرکوك[6]، وە لە ساڵەکانی دواتردا گل کرا بەقەزا لەساڵی (1929–1930ز) قەزای گل بریتی بوو لەدوو ناحیە ئەویش (گل وسەنگاو), وە لەساڵی 1936ز دا قەزای گل بریتی بوو لە ناحیەی قادرکەرەم وناحیەی داقوق[7].

ئەم قەزای گلە لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکوك و ناوچەکەی خۆی چەند جارێك سەنتەری قەزاکەی گۆڕانکاری پێکراوە لە قادرکەرەمەوە بۆ لەیلان وداقوق و پاشان بۆ دوز خورماتوو[8]، دوای ئەوەی سەنتەری قەزای گل برایە دووز خورماتوو, دوز خورماتوو بووە قەزا دوو ناحیەی لەسەر بوو ناحیەی قادرکەرەم و ناحیەی داقوق[9]، بەم

شێوەیە ناوی قەزای گل نەماو بەبڕیارێکی کارگێڕی لەلایەن حکومەتی عێراق لە ڕۆژی 1937\1\27 هەڵوەشێنرایەوە[10]، بەم شێوەیە بناری گل لەسنوری چەند گوندێکدا مایەوە سەر بە ناحیەی قادرکەرەم.

ئەم ناوچەیە لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە ئاوەدان بووە پێش دەسەڵاتی عوسمانیکان, وە بەهاتنی عوسمانیەکانیش لە ساڵی 1550ز ناوچکە خەڵکی تێدا ژیاوە, وەلەساڵ نامەی عوسمانیدا لە ساڵی 1310ك باسی ناوچەی گل کراوە[11]، وەهەر لەسەردەمی عوسمانیدا ناوچەی گل بریتی بووە لەچەند دێیەك کەهەردێیەو دەرەبەگێك دەیبرد بەڕێوە وە دێکانیش بەناو ئەو دەرەبەگانەوە ناونراوە کەلە هۆزی گل بوون[12]، لەکۆتای سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی لەساڵی 1850ز بەرەو سەرەوە دانیشتوان خەریکبوون بە بەخێوکردنی مەڕومالات وکشتوکاڵەوە, ئاستی خوێندەواریان نەبوو, ژیانێکی ئاساییان بەسەر دەبرد و دەرەبەگ رۆڵی جارانی نەمابوو هەرکەس بەکاری کشتوکاڵی و مالاتەوە خەریك بوو, لەم سەردەمەدا شێخ حەمید تاڵەبانی روو لە ناوچەکە دەکات, پیاوێکی خوێندەوارو مەلا دەبێت بۆیە خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆدەبێتەوە ونفوسێکی زۆر لەناوچەکە پەیدا دەکات, هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە هۆزی گل کە دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکەن کۆچ دەکەن بۆ شوێنانی تر[13].

لەسەردەمی دەسەلاتی عوسمانیدا بۆماوەیەك کۆشك و سەرا حکومیەکان لەناوچەکان کشانەوە, ئەوەبوو پاش نەمانی دەسەلاتی عوسمانی و داگیرکردنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە ناحیەی قادرکەرەم دابەشکرا بەسەر خێڵدا بەمەش ناوچەی گل کەوتە دەست شێخ حەمید تاڵەبانی[14]، ئەمەش لەبەر ئەوەی شێخ حەمید تاڵبانی زۆر دژی عوسمانیەکان بوو وە لەساڵی 1918ز کەسێکی پایەبەرز بوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە[15]، بەمەش ئینگلیزەکان رێگەیاندا بە شێخ حمید کە فەرمانڕەوای ناوچەی گل بکات بەبێ دەست تێوەردانی پۆلیس و ناحیە[16]، پاش ئەوەی بناری گل وەك ناوچەیەك مایەوە و ناحیەکە هەڵ وەشێنرابووەوە, ئەدمۆنس دەڵێی: شێخ جلال دەم سپی گوندی فرهاد بگ دووجار چوەتە بغداد بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی ناحیەی گل بەلام داواکاریەکەی سەری نەگرت[17].

دوای ئەوەی تاڵەبانیەکان دەستیان گرت بەسەر زەوی و زاری بناری گلدا بەپاڵپشتی ئینگلیزەکان, هۆزی گلیان لە ناوچەکە دەرکرد جگە لەچەند ماڵێك نەبێت مابوونەوە

تاشەڕی ئاوباریك ساڵی 1930ز لە نێوان شێخ محمودی حەفید و هێزی دەوڵەت و ئەو تیرانەی سەربە دەوڵەت بوون روویدا, دواتر ئەوانیش بەهوی پاڵپشتیان لە شێخ محمود لە ناوچەکە دەرکران[18]، ئەم شەڕەش لەوکاتەدا روویدا کە شێخ محمود لەئێران گەڕابووە عێراق هێزی کۆکردەوە لە خێڵەکانی ناوچەی سلێمانی و ناوچەکانی تر, رووی کردە کەرکوك لەناوچەی بناری گل لە گوندی ئاوباریك رووبەڕوی هێزێکی گەورەی عەرەب بوویەوە بۆ ماوەی 24 کاتژمێر شەڕ بەردەوام بوو[19]، هەروەها لەم شەڕەدا چەند کەسێکی ناودار کوژرا لەوانەش (عومەر صاق ئەفەندی)[20]، ئینجا شێخ محمود گەڕایەوە سلێمانی پاش ئەوەی شەڕکوتایی پیٚ هات[21].

سەبارەت بەلەیکدانەوەی ووشەی بناری گلیش لە چییەوە هاتبیٚ, بێگومان ئەم ووشەیەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی گل کە لەسەردەمێکی زۆر کوندا ناوچەکەی ئاوەدان کردۆتەوە وتیایدا ژیانی بەسەر بردووە[22]، وەهۆزی گلیش یەکێکە لە هۆزە سەرەکیەکانی پارێزگای کەرکوك[23]، ووشەی بنار گلیش لە دوو برگە پێك هاتووە، یەکەم: بنار بەمانای بناری چیادێت ئەم وشەیە لە کوردستاندا بلاٌوە وەك بناری چیای خاڵخالاٌن، دووەم : بۆ ناوی هوزی گل دەگەڕێتەوە کەڕای جیاواز هەیە لەسەری, یەکیٚ لەوڕایانە مامۆستا کمال دەڵیٚ: هۆزی گل پاشماوەی میدیەکانە کە لەسەردەمی میدیەکاندا لێرە نیشتەجیٚ بوونەو بەزمانی ئەوکاتەی ئەوان (گل) مانای بەرزی بەبووە کەبەرزیەکەش زنجیرە تەپۆڵکایەکە, ئەم خێڵەش لە بناری ئەو زنجیرە تەپۆڵکایەدا نشتەجیٚ بووە بەدرێژای مێژوو هۆزەکەش بە ناوی بەرزیەکەوە پییان وتاوە گل[24] . وە ئەو زنجیرە تەپۆڵکایەش پێی دەوترێت (جەوەڵ ناسان)[25]. وە ڕایەکی تریش دەڵیت : ئەم خێڵە لەسەردەمێکی زۆر کۆندا روویان کردووەتە ناوچەکەو رێگایان لیٚ وون بووە و گلیان خواردووە بۆییە پیان وتراوە گل[26] ، هەروەها ناوی گل (عباس عزاوی) وەك ناوچەیکی جوگرافی باسی کرددوە [27]، هەروەها (فواد حەمە خورشید) وەك ناوچەیەکی جوگرافی باسی دەکات [28]، جگە لەبناری گل ناحیەی (گلی) کە ئێستا هەیە سەر بەقەزای زاخۆیە لەپارێزگای دهۆك هۆزی گلی تێدا نیشتەجێیە[29]، بەلاٌم لەکتێبە مێژوویەکاندا روون نەکراوەتەوە کە ئەم دوو ناوە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە یاخودنە.

بناری گل ناوچەیەکەو دەکەوێتە بەشی کوردستانی باشور لە پارێزگای کەرکوك, کەدەکەوێتە باشوری رۆژئاوای ناحیەی قادرکەرەم هاوکات سنورە لە گەڵ ناحیەی

نەوجول لەباشورو خورئاواوە, وە لەباکورو خورهەلاَتیشەوە دێیەکانی ناحیەی قادرکەرەمە[30]، وە سنوری خێڵەکی بناری گل لەخۆرهەلاَتەوە زەنگەنەیە لە باکورەوە جەبارییە لە باشور و رۆژئاواشەوە داودەیە[31].

بناری گل دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی پانی (53° 08-34° 57¯)ی باکوری کەمەرەی زەمین, وە هەردوو هێڵی درێژی (44° 57¯-44° 45¯)ی رۆژهەلاَتی هێڵی گرینیش[32]، لەباکوری خۆرئاواوە بەدێی کۆرومۆری گەورە دەست پێدەکات کە هێڵی قیرتاوی سەرەکی (دووز_قادرکەرەم) پێدا تێدەپەڕێ بەدرێژای زنجیرە تەپۆڵکای جەوەڵ ناساز بەرەو باشەری خۆرهەلاَت دەڕوات تا گوندی کۆشك لەئاوە سپی کۆتایی پێدێت[33].

سەبارەت بە رووبەری بناری گل کەدرێژەوە بووە لە باکوری خۆرئاواوە بۆ باشوری خۆرهەلاَت بە نزیکەی (30کم) وەبە پانتای نزیکەی (12کم)[34] وە رووبەری گشتی هەموو دێکانی بناری گل دەکاتە (342کم2)[35] ، لە کۆی رووبەری هەموو قادرکەرەم کە (1427کم$^2$)[36]، بەلاَم رووبەری پارێزگای کەرکوك (20013کم$^2$)[37]، بەم پێیە رێژەی رووبەری ناحیەی قادرکەرەم دەکاتە (1,7٪)ی رووبەری پارێزگای کەرکوك[38]، بەم شێوەییە رووبەری بناری گل دەکاتە نزیکەی (7,1) لەکۆی گشتی رووبەری پارێزگای کەرکوك.

### باردۆخی دانیشتوانی ناوچەکە پێش ئەنفال

بوونی هەرکۆمەڵە مرۆڤێك لە شوێنێکدا پێویستی بەڕووبەرێك زەوی هەیە کەتیایدا بژی, لێرەوە جوگرافیا دەست پێدەکات بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئەو زەوی‌و ژینگەیەی کە تیایدا دەژی, ئەوەی جوگرافیا جیادەکاتەوە لە لێکۆڵینەوە لەسەر دانیشتوان پەیوەندیەکانە, لەچەند پرسیارێکدا خۆی دەبینێتەوە, بۆچی دانیشتوان لە شوێنێکدا هەیە و لە شوێنێکی تردا نییە هەروەها ژمارەیان لە شۆێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە, بۆ وەلاَم دانەوەی ئەم پرسیارانە جوگرافیای دانیشتوان توێژینەوە دەکات لە سروشت‌و دابەش بوونی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی‌و شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەی یارمەتی دەرن لەو دابەشبوونە[39]. بۆیە هەوڵ دەدەین لەم باسەدا نەخشەی دابەشبوونی دانیشتوانی بناری گل بخەینە روو.

سەبارەت بەبارودوخی دانیشتوانی بناری گل کە نزیك شارۆچکەی قادرکەرەمە، قادرکەرەمیش لەژێر دەسەڵاتی رژێمدا بوو، بۆیە پێش رووودانی پرۆسەی ئەنفال لە ساڵی 1988 ناوچەکە بارودۆخێکی زۆر ئاسای و لەبار نەبوو، ئەم ناوچەیە لە ناوچە نزیکەکان بوو لە دەسەڵات و سوپاو سنورەکانی رژێمەوە، بۆیە بەردەوام لە بەردەم هەڕشەو ئاگر بارانەکانی رژێمدا بووە،

بەپێی ئەو زانیاریانەی هەن لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانیانەی ئێمە لەناوچەکە بە ئەنجامەمان گەیاند لە سەرەتاکانی ساڵی 1980وە پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێی گەلی کورد زۆربەی رۆژەکان فڕۆکەی رژێم بۆردومانی ناوچەکەی دەکرد، بوونە هۆی سەرچاوەی نائارامی و ترس و دڵەڕاوکێ، دەیان خەڵکی ناوچەکەیان شەهید کردووە و چەندین دۆنم دەغڵو دانیان سوتاندوە،

ئەم ناوچەیە بەردەوام لەژێر هەڕەشەو مەترسی رژێمدا بووە چەندین زیانی ماڵی وگیانی بە ناوچەکە گەیەنراوە بۆیە ژمارەی دانیشتوانی لە ئاستی سروشتی زیادبوونی ئاسایدا نەبووە، وەك دەرئەکەوێ لەبەراورد کردنی دانیشتوانی ساڵی 1977 لەگەڵ ئەو ژمارە دانیشتوانەی کە ئێمە بە لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە ناوچەکە وەرمانگرتوە، بڕوانە خشتەی ژمارە (1) کە زیادبوون لە ژمارەی دانیشتواندا بەدی ناکرێت سەرەڕای تێ پەڕبوونی ماوەی (11) ساڵ ئەمەش بۆ بارودۆخی نائاسی ناوچەکە دەگەڕێتەوە.

هەروەها لەم ناوچەیە سەرەڕای ئەوەی کە دانیشتوان هەمیشە بەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداریەوە خەریك بوون، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکەمان ئەتوانین بڵێن کە (85٪)ی دانیشتوان بەکاری کشتوکاڵ وئاژەڵداریەوە خەریك بوون، بەڵام کەمترین دەسکەوتیان هەبووە لەبەر بارودۆخی نائارامی ناوچەکە لەهەر پارچە زەویەکدا بنکەیەك دروست کرابوو بۆ خۆپاراستن لە فڕۆکە جەنگیەکانی رژێمی بەعس، بۆیە دەتوانین بڵێین پێش رودانی پرۆسەی ئەنفال دەڤەرەکە لەبارودۆخێکی نائاسیدا بووە.

ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکەمان لەڕێگەی دراسەی مەیدانیەوە وەرگرتووە، هەوڵمان داوە هەر گوندەو کەسێکی شارەزا و باوەڕپێکراو زانیاری وەرگرین. لەئەنجامدا گەشتینە ئەوەی کە ژمارەی دانیشتوان لەهەموو بناری گل (3128)کەس بووە، لەمانگی ئازاری ساڵی 1988، ئەم ژمارەیەش بەسەر گوندەکاندا دابەش بووە، کە هەندێ گوندیان ژمارەکەیان زیاترە لەبەر بارودۆخی سروشتی و ئابوری بەبەراورد بەگوندەکانی تر،

بڕوانە خشتەی ژمارە(1) وە نەخشەی ژمارە (1) کەدابەشبونی دانیشتوان روون دەکاتەوە لەبناری گڵ, لەبەر هەل و مەرجی نالەباری ناوچەکە زۆر جار دانیشتوان کۆچیان کردووە بۆ شوێنی تر, وەلە بارودۆخێکی زۆرخراپ و نالەباردا ژیاون, لەبەر ئەو هۆکارانەی کەلە پێشەوە خستمانەروو.

پێویستە ئەوەش بگوترێ سەرەڕای ئەوەی ئێمە هەوڵمان داوە وردترین ژمارەی دانیشتوان وەرگرین لەزاری ئەوانەی چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردوون, ئەم ژمارەیە ژمارەیەی راستەقینەی ناوچەکە نییە لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی رەسەنی ناوچەوچەکە بەهۆی نائارامی و نەبوونی ئاسایش و تۆپبارانی رژێم کۆچیان کردووە بۆ باکوری خۆرهەڵات کەتاڕادەیك تۆبۆگرافیەکەی سەخت تر بووە ئەمەش بۆ خۆپاراستن لەبار بووە, هەندێکیشیان کۆچیان کردووە بۆ ژێر دەسەڵاتی رژێم ئەمەش ژمارەیەکی کەم نەبووە. دووەمیان بەهۆی راوەدوونانی لاوانی کورد لە شارەکانی کەرکوك و دوز وقادرکەرەم, وەلەترسی نەبوونیان بەسەرباز رویان کردووەتە گوندەکان, ئەم ژمارەیەش بووتە هۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان.

بەپێی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکانمان لەناوچەکە بۆمان دەرکەوت, کەوا دانیشتوانی پێش ئەنفال لەدەڤەرەکە توانای بەرهەم هێنان و نەوە(وەچە) خستنەوەیان باش بووە وژمارەی ئەندامانی خێزان زۆربووە, هێزێکی مرۆی وئابوری لەبار بونە, ئەگەر سانسۆری رژێم نەبووایە لەسەریان.

**خشتەی ژمارە( 1 )**

**ژمارەی دانیشتوانی بناری گل لەئاماری ( 1977 ) و پێش ئەنفال لەساڵی ( 1988 ).**

| ژ | ناوی گوند | سەرژمێری ئلماری 1977[40] | | ژمارەی دانیشتوان 1988[41] | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان |
| 1 | کۆرومۆری گەورە | 52 | 297 | 28 | 167 |
| 2 | کۆرمۆری بچوك | 26 | 187 | 28 | 180 |
| 3 | فرهاد بگ | 40 | 273 | 41 | 323 |
| 4 | عزیز بگ | 14 | 85 | 15 | 145 |
| 5 | بارام بگ | 73 | 389 | 68 | 392 |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 6 | تەختە مینا | 44 | 215 | 44 | 257 |
| 7 | تازەشار | 37 | 313 | 34 | 188 |
| 8 | کانی قادری سەرو | 57 | 312 | 65 | 406 |
| 9 | کانی قادر کەلاوە | 26 | 129 | – ––– | – –– |
| 10 | کانی قادر خوارو | 41 | 253 | 35 | 219 |
| 11 | صوفی ڕەزا | 26 | 157 | 24 | 157 |
| 12 | ئاوباریك | 54 | 296 | 42 | 245 |
| 13 | دارتوو | – –– | –– –– | 25 | 152 |
| 14 | هەرسێ كۆشك | 40 | 229 | 55 | 297 |
| | كۆ | 530 | 3135 | 504 | |

**نەخشەی ژمارە ( 1 )**

**دابەشبوونی جوگرافی دانیشتوانی بناری گل لە ساڵی 1988دا**

**سەرچاوە /نەخشەکێشانی توێژەران بە پشت بەستن بە لپکۆڵینەوە مەیدانیەکان.**

**هێرش و پەلامارە سەربازییەکان لە ئەنفالی سێ و ناوچەی بناری گل**

ئەنفالی سێ لە 7ی نیسان تا 20ی هەمان مانگی خایاند لە ساڵی 1988, سنورێکی بەربلاوی گرتەوە کەبە گەرمیان ناسراوە, هەردەو دەشتێکی پان و بەرینی هەیە لەبەشی هەرە باشوری کوردستانی عێراقدایە, وەهاوسنوری ناوچەکانی عەرەب نشینی عێراقە, سنوری جوگرافی ئەم ناوچەیە لەباکورەوە رێگای سەرەکی نێوان کەرکوك چەمچەماڵە, وە رۆژئاواوە شارێی نێوان کەرکوك و شارۆچکەی دوزخورماتووە, وە باشوریشی بەرێگای هەرسێ شارۆچکەی کەلار, کفری, باوەنوورە, لەرۆژهەڵاتیشەوە چیاکانی قەرەداغە, ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەم ناوچەییە چەقی جوگرافیەکەی ناحیەی قادرکەرەمە.

بەگشتی هێرش و پەلامارە سەربازییەکان لەئەنفالی گەرمیان دەکرێ بە سێ قۆڵی سەرەکیەوە:

یەکەم/قۆڵی دوزخورماتوو:

لە رۆژی 7ی نیسان سەربازەکانی رژێم و ژمارەیەکی کەم لەجاش لە دوزخورماتوو دەرچوون, دوای دوو رۆژ لە کەرکوك ولەیلان و چەمچەماڵ و سەنگاوە وەهێرشیان کردە سەر ناحیەی قادرکەرەم و هێزەکانی دوزخورماتوو بۆبە سێ بەشەوە :

1- هێزێك لە شارۆچکەی نەوجولەوە دەرچوو بەرە گوێچەمی ئاوەسپی.

2- هێزی دووەمیش هێزێکی گەورەتر بوو لەلیوای 65ی تایبەت پێکهاتبوو, بەئەمبەرو ئەوبەری گوێچەمی ئاوەسپیدا هێرشیان کردەسەر ئەو گوندانە پاش شەرێکی توند 17 گوندیان وێران کردو ماڵ وئاژەڵەکانیان بەتاڵان بردو خەڵکەکەیان راپێچی خۆبەدەستەوەدان کرد.

3- هێزیکی هاوبەش بوو بۆ پەلاماردانی گوندی تازەشار.

دووەم/ قۆڵی قادرکەرەم و باکوری گەرمیان :

1- لە 10ی مانگی نیسانی بەسەرپەرشتی"بارق عبدالله حاجی حنته" هێزێکی تایبەت بوو ئەم هێزەش لە نێوان رێگای سەرەکس کەرکوك-چەمچەماڵ بە ئاراستەی باشور بڵاوبوونەوە, چەندین گوندی ئەم ناوچەیان رووخاند و خەڵکەکەیان راپێچی تۆپزاواکرد.

2- لە 11ی مانگ هێزێکی تر لە قادرکەرەمەوە دەرچوو بۆ روخاندنی گوندی براهیم غولام و گوندەکەیان رووخاندوو خەڵکەکەیان راپێچی خۆ بەدەستەوە دان کرد.

3- هێزیکی گەورەی سوپا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری تانکدا هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی عەشیرەتی زەنگەنە, بۆتێك شکاندنی بارەگای پێشمەرگە لە دۆڵی گۆلباخ, پاش رۆژێك بەرگری گوندەکانی ناوچەکەیان رووخاندو مەڕوماڵاتەکانیان بەتاڵان بردوو خەڵکەکەیان راپێچی خۆبەدەستەوەدان کرد[42].

سێهەم / قۆڵی سەنگاو باشوری گەرمیان :

ئەم هێرشە پلانێکی تۆکمەتری بۆ دانرابوو بۆئەوەی لەماوەیەکی کەمدا هەموو دێکانی ئەو سنورە بڕوخێنن. شاڵاوەکانی ئەنفالی ئەم دەڤەرە دابەش دەکرێت بۆ ئەم هێرشانەی لای خوارەوە :

1- هێرشی یەکەم لە سەنگاوەو دەست پێدەکات بەئاراستەی رۆژئاوا بەرەو شارۆچکەی دەربەندیخان.

2- لەبەرە بەیانی 9ی نیسانی ساڵی 1988 دا هێزێکی گەورەی سوپا لە شارۆچکەی کفری بەئاراستەی باکور هێرشیان کرد, وەهێزێکی بچوك لە سوپا سەرەکیەکە جیاوەبوو بەرەو باکوری رۆژئاوا , پاش بەرگریەکی کەم گوندی ئۆموربل وبیست گوندی ناوچەکەیان وێران کرد.

3- لە 9ی نیسان هێزێکی گەورە لە شارۆشکەی کەلارەوە بەڕێکەوت بەرەو باکور بۆ شارۆچکەی تیلەکۆ, بەهۆی تۆپبارانی زۆرەوە خەڵکێکی زۆر روویان کردە هەردەکان.

4- بەشێکی تری سوپا لەناحیەی باوەنورەوە بەئاراستەی باکور پێشڕەویان کرد دوای بەرگریەکی کەم 14 گوندیان رووخاند, بەڵام هێزەهاوبەشەکەی ترلەباشوری شارۆچکەی دەربەندیخان رووبەرووی بەرگرییەکی کەم وێنە بوونەوە لەگوندی شێخ تەویل, پاش پێنج رۆژبەرگری توانیان گوندی شێخ تەویل داگیربکەن.

ئەنفالی سێ بەئەنفالی گەرمیان ناسراوە زۆرترین ژمارەی خەڵك بێسەرو شوێن کراوە بەتایبەتی لە رۆژی 14\4\1988دا بیست هەزار کەس لەژن و پیاو پیرو منداڵ لەهەردوو گوندی کوڵە جۆو ملەسورە دا کۆکرانەوە بە ئیڤای سەربازی بەرەو سەربازگەی قۆرەتوو براون, هەرلەبەر ئەوەش ئەو رۆژە بەرۆژی یادکردنەوەی ئەنفال دانراوە.

### هێرشی سەربازی بۆ سەر بناری گل

هەروەك لەپێشدا ئاماژەمان پێكرد سنوری بناری گل دەكەوێتە بەشی باشوری رۆژئاوای ئەنفالی سێوە بەدرێژای جەوڵ ناساز لەسەر رێگای سەرەكی كەركوك – قادركەرەم كەنزیكەی 15كم لەشارۆچكەی دوزخورماتووەوە دوورە. بەماوەی پێنج رۆژێك دانیشتوانی بناری گل هەستیان كردبوو كە سەربازێكی زۆر لەشارۆچكەی دوزخورماتوو كۆبوەتەوە و دركیان بەوەكردبوو كەئەم هێزە بۆ پەلاماری ناوچەكە خۆی ئامادەكردووە, بۆیە بۆماوەی سێ بۆ چوار رۆژ پێش هێرشی سەربازی, دانیشتوانی بناری گل روویان كردە هەردەو هەڵەتەكان بەتایبەتی بەشی باكورو رۆژئاوای بناری گل.

دوای چۆڵ بوونی گوندەكان هێزی پێشمەرگە خۆیان ئامادە كردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرشە سوپاییە چاوەروانكراوە دەستەیەكی 24كەس لەهێزی پێشمەرگە لەگوندی تازەشاردا جێگیربوون, سەرئەنجام بەرەبەیانی 9ی نیسان سوپا سەرەكیەكەی دوزخورماتوو هێزێكی لێ جیاوەبوو لەڕێگا سەرەكیەكە بەرەو ڕێگا خۆڵكەی بناری گل, دوای تێپەڕبوون بەهەردوو گوندی كۆرمۆرو فەرهاد بگ سوپا لە نێوان تازەشار و فرهادبگ دا بۆماوەیەكی كەم وەستا, دركیان بەوە كردبوو كە هێزی پێشمەرگە لەگوندی تازەشاردا سەنگەریان هەیە[43].

### شەڕ تازەشار

لێرەدا بەپێویستی دەزانین بەوردی باسی شەڕی تازەشار بكەین لەبەر ئەوەی بەكۆتایی هاتنی شەڕ سەراتاپای بناری گل روخێنرا لەلایەن سوپای داگیركەرەوە, تازەشار یەكێكە لە گوندەكانی بناری گل كە نزیكەی 540م بەرزە لەئاستی رووی دەریاوە, دەكەوێتە باكوری خۆرهەڵاتی بناری گل, شەڕلەم گوندەدا روویدا بۆیە بەناوی تازەشارەوە ناونراوە، سوپا دركی بەوە كردبوو كە هێز لەتازەشارد بۆیە لە شوێنی دوورەوە دێیەكەی تۆپباران دەكرد بەنەمساوی راجمە بۆ ماوەی نزیكەی دووكاتژمێر، بەشێوەیەك زۆربەی شایەتحاڵەكان واهەستیان كردبوو كەس لەناو دێكەدا نەماوە و خانووەكان زور بەیان روخان لەئەنجامی توپبارانەوە, ئینجا هێزی پیادەی سوپا هێرشی كردە سەرگوندەكەو لەلایەن ئەو 24 پێشمەرگەی كەلە ناو گوندەكەدا سەنگەریان دانابوو هێزی پیادەی سوپای داگیركەریان شكاند, لەم شكانەدا چەند كوژراوێك هەبوو, وە دوو

پێشمەرگەش بریندار بوون بەناوی (عوسان وەلی) کە دواتر لە قادرکەرەم ئەنفال کرا, وە(کمالّ صدیق), ئینجا سێ کوپتەر دێیەکەیان بۆردوومان کرد, جارێکی تر سوپای پیادە هێرشی کردەوە دووبارە لەلایەن پێشمەرگەکانەوە پاشەکشەیان پێکرا, دوای ئەم شکانە پێنج کۆپتەر دابەزینە جەوەڵەکە دوای کەمێك هەڵسان بۆرەمی کردنی دێیەکەو تانك و زرێپۆش بڵاوبوویەوە, لەو دیوەوە چواردەوری گوندی تازەشاریاندا. بەقسەی شایەتحاڵێك دەڵێت (52) تانکم ژماردووە لەوکاتەدا[44]، ئاسۆ بیارەیی دەڵی (100) تانك و (15)کۆپتەرو (5) فرۆکەی بیلاتوز ئاگریان بەسەر گوندەکەدا دەباراند، سەنگەری پیشمەرگەکانیش لە شیوو و دۆڵێکدابوو کە بۆشەڕی ئاوەها قورس بەرگری کردن زۆر قورس و دژوار و نالەباربوو, جوگرافیای ناوچکەش بۆ جەنگ یارمەتی دەرنەبوو, وەك ناوچە شاخاوییەبەرزەکانی تری کوردستان, لە ئەنجامی ئەم گەمارۆ دانەی تانك وهێزی پیادەو رەمی کۆپتەرەکان شەڕهەربەردەوابوو تاکاتژمێر سێ ی ئێوارە, جوتیارێك بە میدڵ ئیست ووچی راگەیاندوە کە بەڕادیوی بێتەل گفتوگۆی فرۆکەکانی وەرگرتووە ووتویەتی گازی ژەهراوی تاقە رێگەیە بۆ لەناوبردنی ئەم بەرگریە[45].

بەقسەی شایەت گەلێکی زۆری بناری گل کەلەوکاتە لەهەردەکەوە چاویان لە شەڕەکە بووە و بینیویانە کۆپتەرێك سێبۆمبی کردوەتە خوارەوە بۆناو دێیەکە دووکەڵی زوردو سپی لەم بۆمبانە هەڵساوە دواتر بەرگریەکە نەماوە و ئەو 22 پێشمەرگەی مابوونەوە شەهید بوون.

بەم شێوەیە هاولاّتیانی بناری گل لە هەردەکەدا هیچ چارێکیان نەماو سوپا راپێچی سەنتەرەکانی خۆ بەدەستەوەدانی کردن, هاوکات لەگەڵ هێرش وبڵاوبوونەوەی سوپا بەناوچەکەدا کۆپتەرەکان لەئاسمانەوە رەمیان دەکرد زۆربەی جار هەر لەکاتی ئەم رەمی کردنە خانووی گوندەکان ئەروخا, ئەمە جگە لەوەی سوپا دواتر گوند بەگوندی لەگەڵ زەوی یەکسان دەکرد وتالاّنی دەکرد دوایش دەیسووتاند[46].

### کۆکردنەوەی خەڵك و گواستنەوەیان و زەرەروزیانەکان

بەگشتی لەگەرمیاندا چەند ناوچەیەکی سەرەکی هەبوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵکە مەدەنیەکە, ئەوناوچانەش "ملەسورە و فەقێمستەفاو مەیدان" لەباشوری گەرمیان, وە"ئالیاوا ولەیلان" لە باکور, ئەمانە ئەو سەنتەرانە بوون کەخەڵکیان لێکۆدەکرایەوە

لەلایەن سوپاوە هەندێ جاریش سەیری ناسنامەیان دەکرد بەپەلە, دواتر بەئیڤای سەربازی دەگوێزرانەوە بۆ بەندیخانەکان.

ئەگەر بەووردی باسی کۆکردنەوە وگواستنەوەی هاولاتیە مەدەنیەکانی بناری گل بکەین ئەوا بەپێی شوێنی جوگرافی ناوچەکە دەگۆڕێت, بەگشتی هاولاتیە مەدەنیەکان بۆ سێ شوێنی جیاواز راگوێزراون ئەوانەش :

1- قادرکەرەم و ئالیاوە:

ئەو خەڵکەی باکوری رۆژهەلاتی بناری گل کە لەهەردەکەدا بوون روویان کردە قادرکەرەم ئەمەش بەگوتەی جاش کەلەو ناوەدا بلاو ببونەوە بۆ خەڵکیان باس دەکرد ئەبێ خۆیان بەدەستەوە بدەن, لەم کاتەدا سوپا لەم قۆڵەوە خەڵکی کۆ نەکردەوە بەڵکو بەخەڵکەکەیان دەگوت بەرەو قادرکەرەم بڕۆن بۆخۆبەدەستەوەدان, خۆش بەختانە لەم قۆڵەوە منداڵ و ئافرت رزگاریان بوو, جگە لەپیاوەکان نەبێ کەخۆیان لەقادرکەرەم تەسلیم کرد لەگەڵ گوندەکانی تری ناحیەکەدا, بەرەبەرە هەمویان بارکران بەرەو باشوری عێراق. لەتاریکی شەودا هەموویان خرانە چاڵی گەورەوە لەلایەن چەکدارەکانی رژێمی بەعسەوە دەست رێژیان لێ ئەکراو[47] پۆل پۆل وەك باڵندەی سپی ئەکەوتنە چاڵەکانی بیابانی بانی عەرەبی بێکەڵکەوە و جارێکی ترنەبینرانەوە.

2- نەوجول:

چەند دێیەك لە رۆژئاواو باشوری بناری گلدا روویان کردە باشوری رۆژئاوا بەرەو شارۆچکەی نەوجول بۆخۆبەدەستەوەدان بەلام سوپا لەم قۆڵەوە خۆی خەڵکی کۆدەکردەوە, دەرباز بوون لێرەدا زۆر زەحمەت بوو, بەتایبەتی گوندی عزیز بگ کەبەرەو نەوجول رۆیشتن بۆ خۆبەدەستەوە دان بۆی زۆربەی هەرزۆری گوندە کە ئەنفالکران بەمنداڵوئافرەتەوە, بەقسەی شایتحاڵێك کەداواکاری فەرمی کردووە بۆ چارەنوسی منداڵەکانی کە(12) سەرخێزان بووە, لەبەڵگەنامەکانیشدا ئەم داواکاریە هاتووە.

حسێن علی دەڵێت : لەپاش نەوجول بەرەو دوزخورماتوو براون دواتر بۆتکریت, حسێن علی خۆی ئەم شوێنانە گەڕاوە بۆ سۆراغی خێزانەکەی وە لەتکریتیشەوە براون بۆ سەماوە لە سەماوەشەوە بۆ عەرعەر, لەوێ چارەنوسیان بەنادیاری ماوەتەوە, مام حسێن دەڵێ : لەمە زیاتر سۆراغ کردنیان رووبەرووی مەرگ دەبویەوە بۆیە وازی لە گەڕان هێنا بەدوای منداڵکانیدا[48].

3- ملەسورە :

بەشێکی هاولاتی باشوری بناری گل روویان کردە ملە سورە بۆخۆبەدەستەوەدان ئەمەش لە ژێرچاودێری سوپادا, دواتر گوێزرانەوە بۆ دوز خورماتوو.

بەگشتی ئەم سەنتەرانە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکیان تێدا کۆکرابونەوە لەهەموو ناوچەکانی گەرمیان, بۆیە دەربازبوون لەژمارەیەکی ئاوا زۆردا مەحاڵ نەبوو بەتایبەتی لە ئالیاوەو ملەسورە, ژمارەیەکی زۆر لە منداڵو ئافرەتی بناری گل رزگاریان بوو لەم سەنتەری کۆکردنەوانە, بەتایبەتی لە"مرکز شباب"ەکەی توزخورماتوو. ژمارەیەکی زۆر کەنزیکەی (600) نەفەر رزگاریان بوو, بۆیە ژمارەیەکی کەم لە منداڵو ئافرەت لە بناری گل ئەنفال کراوە بەبەراورد بەناوچەکانی داودەو شوێنەکانی تری گەرمیان.

زەرەروزیانەکان

ئەنفال هێرشێکی راستەوخۆی هەمەلایەنە بوو بۆسەر کۆی ژیانی کۆمەڵگایەك, بۆکوشتن و بێسەرو شوێنکردنیان و ێران کردنی گوندەکانیان و سوتاندنیان, وەتالانکردنی هەزارەها ئاژەڵ و پەلەوەر و وێرانکردنی هەموو بنەماکانی ژیان[49].

ئەم هێرشە سەربازییەش بۆسەر بناری گل زەرەرو زیانێکی گیانی ومالی زۆری لێکەوتەوە, وەك لە خشتەی ژمارە (2)دا دەردەکەوێت (582) کەس ئەنفال کراون (444)خانوو و(12) مزگەوت و(8) خۆیندنگە روخێنراون, وە (36045) سەرمەڕوبزن و(21056) پەلەوەرو (1334) مانگا بەتلان براون, ئەمە جگە لەچەندین ئۆتومبیل ومەکینەو ماتۆڕی ئاو بەتالان براون و فەوتاون, وە بەهەمان شیوە لەخشتەی ئاماژە پێکراودا ژمارەی زەرەروزیانەکان بەژمارە بۆ شتە جیاوازەکان لە سەر ئاستی گوندەکان خراوەتە روو وەجگە لەو ژمارانەش کە لەخشتەکەدا هاتوو , ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵی تر لەناوچووەو بەتلان براوە وەك کەروێشك, هەروەها زەرەرو زیان بەسروشتی ناوچەکە کەوتووە, جگە لەچەندین باخ و بێستان و کێڵگەی کشتوکاڵی لەبەروبومی گەنم و جۆو برنج و بامیێ و تەماتە و پاقلە لەناوچووە.

خشتەی ژمارە (٢)

زەرەروزیانە گیانی و ماڵیەکانی بناری گل لە لە ئەنجامی هێرشی سەربازی ئەنفال (٣*)

| ناوی گوند | ژمارەی ئەنفال | ژمارەی خانوو | ژمارەی مزگەوت | ژمارەی خوێندنگە | ژمارەی مەڕوبزن | پەلەوەر | مانگا | مەکینە | ئۆتۆمبیل | ماتۆڕی ئاو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کۆرمۆڕیگەورە | ٢٣ | ٢٥ | ١ | -- | ٣١١٥ | ٦١٠ | ١٠٢ | ٦ | ٢ | -- |
| کۆرمۆڕ بچوک | ٤٢ | ١٩ | ١ | ١ | ٨١٥ | ١١٨٥ | ٨٠ | ٤ | ٢ | -- |
| فرهاد بگ | ٢٩ | ٢٧ | ٢ | -- | ٤٠٨٦ | ١٦٢٩ | ١١٥ | ٩ | ٦ | -- |
| تازەشار | ٢١ | ٣١ | ١ | -- | ٢٠٤٥ | ١٤٦٨ | ١٠٧ | ٢٢ | ٥ | ٣ |
| عزیز بگ | ١١٠ | ١٤ | ١ | ١ | ١٥٧٦ | ١٤١٠ | ٥٠ | ٣ | -- | ١١ |
| تەختە مینا | ٤٤ | ٤٢ | ١ | ١ | ٢٩٢٢ | ١٧٦٣ | ١٦٢ | ٤ | ٣ | ٢ |
| بارام بگ | ٣٩ | ٦١ | ١ | -- | ٣٧٣٩ | ٢٤٣١ | ٨٠ | ١١ | -- | ٥ |
| کانی قادرسەرو | ٧٧ | ٦٠ | ١ | ١ | ٥٤٢٠ | ٢٤٨٥ | ٩٠ | ١٤ | -- | ٨ |
| کانیقادرخوارو | ٤٦ | ٣١ | ١ | ١ | ١٧٦٤ | ١٤٨٨ | ٩٩ | ٧ | -- | ٥ |
| صوفی رەزا | ٢١ | ٢١ | – | ١ | ١٩٥٥ | ١٠٢٢ | ٥٠ | ٤ | -- | ١ |
| ئاوباریک | ٣٢ | ٤٠ | ١ | ١ | ٥٢٩٩ | ٢١٧٦ | ٤٠ | ١٢ | -- | ٦ |
| دارتوو | ٢٢ | ٢١ | – | -- | ١٠٠٥ | ٩٢٨ | ٢٠ | ٤ | -- | ١ |
| هەرسێ کۆشك | ٧٦ | ٥٢ | ١ | ١ | ٢٣٠٤ | ٢٤٧١ | ٣٢٩ | ٧ | ٢ | ١ |
| کۆ | ٥٨٢ | ٤٤٤ | ١٢ | ٨ | ٣٦٠٤٥ | ٢١٠٥٦ | ١٣٣٤ | ١٠٧ | ٢٠ | ٤٣ |

## خشتەی ژمارە( 3 )

### دابەشبوونی دانیشتوانی بناری گل بە پێی ڕەگەزو تەمەن لە پێش ئەنفالدا لەساڵی 1988دا

| تەمەن | نێر | | مێ ی | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە% | ژمارە | ریژە% |
| 0---4 | 240 | 3,50 | 237 | 7,49 | 477 | 24,15 |
| 5---9 | 201 | 9,54 | 195 | 1,45 | 396 | 65,12 |
| 10--14– | 228 | 2,52 | 208 | 8,47 | 436 | 93,13 |
| 15--19 | 194 | 4,54 | 162 | 6,45 | 356 | 40,11 |
| 20--24 | 145 | 9,47 | 158 | 1,52 | 303 | 70,9 |
| 25--29 | 128 | 4,49 | 131 | 6,50 | 259 | 30,8 |
| 30--34 | 111 | 8,52 | 99 | 2,47 | 210 | 71,6 |
| 35--39 | 96 | 1,58 | 69 | 9,41 | 165 | 27,5 |
| 40--44 | 51 | 51 | 49 | 49 | 100 | 20,3 |
| 45--49 | 50 | 4,43 | 65 | 6,56 | 115 | 67,3 |
| 50--54 | 55 | 8,56 | 42 | 2,43 | 97 | 10,3 |
| 55--59 | 41 | 4,55 | 33 | 6,44 | 74 | 36,2 |
| 60--64 | 29 | 1,50 | 28 | 9,49 | 57 | 82,1 |
| 65--70 | 23 | 6,67 | 11 | 4,32 | 34 | 08,1 |
| +70 | 32 | 3,65 | 17 | 7,34 | 49 | 56,1 |
| کۆی گشتی | 1624 | 9,51 | 1504 | 1,48 | 3128 | %100 |

## خشتەی ژمارە ( 4 )

## دابەشبوونی دانیشتوانی بناری گل بە پێی ڕەگەز بۆ ئەوانەی ئەنفالکراون و ئەوانەی ئەنفال نەکراون لە ساڵی 1988دا

| | ئەنفال کراوەکان | | | | ئەنفال نەکراوەکان | | | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | | مێ ی | | نێر | | مێ ی | | |
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | |
| | 449 | 1,77 | 133 | 9,22 | 1172 | 46 | 1374 | 54 | |
| کۆ | 582 | | | | 2546 | | | | 3128 |
| ٪ | 6,18 | | | | 4,81 | | | | ٪100 |

## خشتەی ژمارە ( 5 )

## دابەشبوونی ئەنفالکراوەکان بە پێی ڕەگەزوتەمەن لەساڵی 1988 دا

| تەمەن | نێر | | مێ ی | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 4---0 | 14 | 6,46 | 16 | 4,53 | 30 | 15,5 |
| 9---5 | 14 | 6,46 | 16 | 4,53 | 30 | 15,5 |
| 14---10 | 33 | 9,58 | 23 | 1,41 | 56 | 62,9 |
| 19--15 | 50 | 5,67 | 24 | 5,32 | 74 | 71,12 |
| 24--20 | 80 | 4,83 | 16 | 6,16 | 96 | 50,16 |
| 29--25 | 80 | 8,89 | 9 | 2,10 | 89 | 30,15 |
| 34--30 | 71 | 8,89 | 8 | 2,10 | 79 | 62,13 |
| 39--35 | 58 | 5,86 | 9 | 5,13 | 67 | 51,11 |
| 44--40 | 21 | 4,95 | 1 | 6,4 | 22 | 78,3 |
| 49--45 | 17 | 9,73 | 6 | 1,26 | 23 | 95,3 |
| 54--50 | 8 | 80 | 2 | 20 | 10 | 71,1 |
| 59--55 | 1 | 3,33 | 2 | 7,66 | 3 | 51,0 |
| 64--60 | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 70--65 | 1 | 100 | --- | --- | 1 | 17,0 |
| +70 | 1 | 50 | 1 | 50 | 2 | 34,0 |
| کۆی گشتی | 449 | ٪1,77 | 133 | ٪9,22 | 582 | ٪100 |

## خشتەی ژمارە ( 6 )

## دابەشبوونی پێکهاتەی ڕەگەزوتەمەنی دانیشتوان پاش جێبەجێ کردنی پرۆسەی ئەنفال لەساڵی( 1988 )دا

| تەمەن | نێر | | مێ ی | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ریژە٪ |
| 4---0 | 226 | 9,50 | 218 | 1,49 | 444 | 5,17 |
| 9---5 | 187 | 51 | 178 | 49 | 366 | 3,14 |
| 14---10 | 195 | 4,51 | 184 | 6,48 | 379 | 9,14 |
| 19--15 | 144 | 4,51 | 136 | 6,48 | 280 | 9,10 |
| 24--20 | 64 | 4,27 | 169 | 6,72 | 233 | 2,9 |
| 29--25 | 48 | 6,28 | 120 | 4,71 | 168 | 5,6 |
| 34--30 | 39 | 33 | 79 | 67 | 118 | 6,4 |
| 39--35 | 37 | 1,38 | 60 | 9,61 | 97 | 8,3 |
| 44--40 | 30 | 4,38 | 48 | 6,61 | 78 | 2,3 |
| 49--45 | 33 | 9,35 | 59 | 1,64 | 92 | 6,3 |
| 54--50 | 47 | 54 | 40 | 46 | 87 | 5,3 |
| 59--55 | 40 | 1,57 | 30 | 9,42 | 70 | 7,2 |
| 64--60 | 29 | 9,50 | 28 | 1,49 | 57 | 3,2 |
| 70--65 | 22 | 8,68 | 10 | 2,31 | 32 | 2,1 |
| +70 | 31 | 3,67 | 15 | 7,32 | 46 | 8,1 |
| کۆی گشتی | 1172 | ٪46 | 1374 | ٪54 | 2546 | ٪100 |

## خشتەی ژمارە( 7 )

## بەراوردی ژمارەی دانیشتوان لەساڵی ( 1988--2006 ) لە بناری گل

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی دانیشتوانی ساڵی1988 | | ژمارەی دانیشتوانی ساڵی2006[51] | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان |
| 1 | كۆرومۆری گەورە | 28 | 167 | 15 | 76 |
| 2 | كۆرمۆری بچوك | 28 | 180 | 2 | 14 |
| 3 | فرهاد بگ | 41 | 323 | 3 | 23 |
| 4 | عزیز بگ | 15 | 145 | --- | --- |
| 5 | بارام بگ | 68 | 392 | 25 | 131 |
| 6 | تەختە مینا | 44 | 257 | 3 | 19 |
| 7 | تازەشار | 34 | 188 | 4 | 32 |
| 8 | كانی قادری سەرو | 65 | 406 | 15 | 75 |
| 9 | كانی قادر كەلاوە | ---- | ---- | 2 | 12 |
| 10 | كانی قادر خوارو | 35 | 219 | 2 | 15 |
| 11 | صوفی ڕەزا | 24 | 157 | 5 | 30 |
| 12 | ئاوباریك | 42 | 245 | 13 | 69 |
| 13 | دارتوو | 25 | 152 | 14 | 63 |
| 14 | هەرسێ كۆشك | 55 | 297 | 22 | 77 |
| كۆ | | 504 | 3128 | 125 | 636 |

## پەراوێزەکان:


١- احمد رشيد احمد بيباني, كركوك الجريحة, مطبعة وزارة الثقافة, الطبعة الاول, السليمانية, 2004, ص114.

٢- ئەژی، ئارابخای وولاتی کوردەواری لە مێژوودا, بەرگی یەکەم, چاپخانەی ئەزمەر, چاپی یەکەم, سلێمانی, 2004, ل120.

٣- عباس عزاوي, عشائرالعراق الكردية, مطبعة المعارف, بغداد,1947, ص88.

٤- د.كمال مظهر, كركوك وتوابعها حكم التاريخ و الضمير, دراسة وسائقيةعن القضية الكردية في العراق, مطبعة رينون, ص39.

٥- ئەذي, ميَذووي سەردەمة كارطيَرِي و بەرِيوبەرايەتيەكاني ثاريَزطاي كەركوك, ضاثخانەي شەهيد ئازاد هەورامي, ضاثي يەكەم, كەركوك, 2005 , ل22.

٦- د.فؤاد حمة خورشيد, كركوك قلب كردستان, من مطبوعات المديرية العامة الطباعة ونشرفي وزارة الثقافة, السليمانية, 2005, ص56.

٧- ئەژی, مێژووی سەردەمە کارگێڕی و بەڕێوبەرایەتیەکانی پارێزگای کەرکوك, سەرچاوەی پێشوو, ل256.

٨- عبدالطيف عبدالمجيد طلي, مێژووی هوزی گل, گۆڤاری رۆشنبیری نوێ, ژمارە(111), ساڵی 1986, ل119.

٩- د.فؤاد حمة خورشيد , المصدر السابق , ص28.

١٠- ئەژی, مێژوی سەردەمە کارگێڕی و بەڕیوەبەراییەتیەکانی پارێزگای کەرکوك, سەرچاوەی پێشوو, ل256.

١١- عبدالطيف عبدالمجيد, سەرچاوەی پێشوو, ل118.

١٢- چاوپێکەوتنی توێژەرانە لەگەڵ رشید غیدان روستەم, 13\2\2006.

١٣- چاوپێکەوتنی توێژەرانە لەگەڵ ماموستا کماڵ مجید رشید, 20\6\2006 کەرکوك, وە فرهاد غوسمان ببلان, 17\12\2005.

١٤- ئەژی, سەرچاوەی پێشوو, ل25.

١٥- ئي, جي, ئار, عشائر الكردية, ترجمة وعلقة عليه, فؤاد حمة خورشي, مطبعة حوادث, بغداد, 1979,ص31.

١٦- ادمونس, كرد ترك عرب, ترجمة, جرجيس فتح الله, مطبعة التايمس, بغداد, 1971, ص246.

١٧- المصدر نفسه, ص239.

١٨- عبدالطيف عبدالمجيد طلي, سەرچاوەی پێشوو, ل119.

١٩- میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی, حقائق و بەسەر هاتی شێخ محمود لە پەنای استقلالی کوردا, چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری, سلێمانی, 2003, ل, 25.

٢٠- رفیق حلمی, یادداشت, چاپی سێهەم, سلێمانی, 2003, ل306 .

٢١- میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی, سەرچاوەی پێشوو, ل53 .

٢٢- عبدالطيف عدبدالمجيد طلي, سەرچاوەی پێشوو, ل120.

٢٣- وليد شركة, كركوك دراسة جيو-تأيخية, مؤتمر علمي حول كركوك, طبعة الثانية, مطبعة اراس, اربيل, 2001, ص171.

٢٤- چاوپێکەوتنی توێژەرانە اەگەڵ مامۆستا کماڵ مجید رشید , 2006\1\20 , کەرکوک

٢٥- ئەژی، مێژووی سەردەمە کارگێڕی وبەڕیوبەرایەتیەکانی کەرکوک، سەرچاوەی پێشوو، ل117.

٢٦- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ محمد احمد علی , 2006\2\12 ,کۆمەڵگای شۆڕش.

٢٧- عباس عزاوی، المصد السابق، ص93.

٢٨- ئي،جي،ئار، عشائر الكردية، المصدر السابق، ص130.

٢٩- جمال بابان، أصول أسماء المدن والمواقع العراقية، جزء الاول ،بغداد، 1989، ص307.

٣٠- عەدالەت تاڵبانی، ئەنفال و نێنیەکانی، چاپخانەی منارە، هەولێر، 1999، ل13 .

٣١- ئي،جي،ئار، عشائر الكردية، المصدر السابق، ص131 .

٣٢- بڕوانـــــە ســـــایتی www.fallingrain.com\word\iraq\muhafazay salahadin .

٣٣- گەشتی توێژەران بۆ ناوچەکە لە 2006\1\5.

٣٤- گەشتی توێژەران بۆ ناوچەکە لە 2006\1\5 , وە لە ڕێگای پێوەری نەخشەوە .

٣٥- بەڕیوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی چەمچەماڵ .

٣٦- محمد هادي دفتر و عبدالله حسن و العراق الشمالي، جزء الاول. مطبعة شفيق، بغداد، 1958، ص283.

٣٧- فاتح عبداللە شوانی، پارێزگای کەرکوک لەساڵی 1957-1977، چاپخانەی رامان، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2005 , ل59.

٣٨- پشتیوان حسێن کریم و کارزان ابراهیم، بایەخی جیۆپۆلتیکی پارێزگای کەرکوک، گۆڤاری کەرکوک، ژمارو (1)ی ساڵی 2004 , ل17.

٣٩- د.خليل اسماعيل , قضاء خانقين , دراسة جغرافية سكان , طبعة ثانية , سليمانية , 2002، ص21.

٤٠- عباللە کریم محمود , رەشەبای ژهرو ئەنفال , بەرگی دووەم , چاپی یەکەم , 2004 , ل554-555.

٤١- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ خەڵکی گوندەکان.

٤٢- جاسم محمد محمد علی، ئەنفالی گەرمیان، چاپخانەی زانست، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2002 , ل25

٤٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ، مجید رشید سلیم , 2006\2\14

٤٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ، مجید رشید سلیم، 2006\2\14

٤٥- میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، ل195

٤٦- چاوپێکەوتن لەگەل , محمد فرج نادر , 2006\2\7

٤٧- یوست هێڵتـەرمان، جینۆسـاید هاوتـاوانی بێـدەنگ بـوون – عێـراق وکوردەکـان، وەرگێڕانـی : کـاوە صـالح، گۆڤاری رەهەند، ژمارە(7) ,1999 , ل15

٤٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ، حسێن علی احمد، 2006\2\15

٤٩- مەریوان وریا قانع، ئەنفال و مۆدێرنە – ڕووداوێك لـە دوامانـەوە یـان ئەگـەرێك لـە پێـشمانەوە، گۆڤـاری رەهەند، ژمارە (7)ی ساڵی 1999 , ل32

٥٠- چاوپێکەوتنەکانی توێژەران لەگەڵ دانیشتوانی گوندەکان

٥١- بەڕیوەبەرایەتی ناحیەی قادرکەرەم

# جینۆسایدی کورد
# لەپرۆسەی ئەنفالدا

بەشدار قاسم

کورد گەلێکی بێ دەوڵەتە لەنیوان تورکیا ،سوریا، ئێران و عێراقدا پەراگەندەبوون. زیاتر لەبیست و پێنج ملیۆن کورد لەناوچەیەکی (٢٠٠) هەزار میلی چوارگۆشەدا نیشتەجێن. کورد لەنێوان دوو فۆرمی ئیسلام، پێنج سنوور و سێ زاراوە و ڕێنوسدا دابەشبوون .زلهێزەکان بەڵێنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان پێدان لەساڵی (١٩٢٢) ، بەڵام کاتێك تورکیا رازی نەبوو پەیمانی سیڤەر مۆر بکات ئەو بیرۆکەیە لەیاد کرا. پەیمانی سیڤەر هەمان ئەو بەیاننامەیەی کەتێیدا جیهان دەستەوسانانە داوای دادگایکردنی ئەو تورکانەی دەکرد کەلە ڕەشە کوژی ئەرمەندا بەشدار بوون. کوردەکانی عێراق بەدرێژایی سەدەی بیستەم لەسەرهەڵدانی بەردەوامدا بوون بەو ئومێدەی مافی خودفەرمانرەوای بەدەست بهێنن ، لەکاتێکدا دانیشتوانی نیگەرانی شیعە لە نیوە زیاتری دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن ، سەدام حوسەین بەتایبەتی لێبراو بوو بۆ ئەوەی داوای کورەکان بۆ ئۆتۆنۆمی نەهێڵێت[1].

بەدرێژایی مێژوو کورد لەهەر چوار پارچەکەی کوردستان توند و تیژی کراوەتە سەریان و جینۆساید کراون . توند و تیژتریمیان شالاوی عێراق لەدژی کوردی گوند نشین، کەلەساڵی ١٩٨٧دا دەستی پێکرد و بەئەنفال کۆتایی پێ هات لەساڵی ١٩٨٨ دا لەپانتایی و وردبینیدا شتێکی نوێ بوو، هاوکات توندو تیژترین بەرجەستەکردنەوەی هەوڵە لەمێژوویەکانی دەوڵەتی عێراق بوو بۆ سەرکوتکردنی کورد [٢].

هەر لەدروستبونی دەوڵەتی عێراقەوە لەساڵی ١٩٢١، پاش لکاندنی خوارووی کوردستان پێوەی ، کێشەی کورد بەردەوام کێشەی سەرەکی عێراق بووە، رژێمە یەك

لەدوای یەکەکانی عێراق نکووڵیان لەمافی گەلی کورد لە دیاریکردنی چارەنوسدا کردووەو سیاسەتی دژ بەمەسەلەی نەتەوایەتی گەلی کورد بەرنامە ڕێژ کراوە، هەر بۆ جێ بەجێکردنی ئەو سیاسەتەش ئەندازەی تاوانی ئەو ڕژێمانە گەیشتبووە پلەیەکی بەرزو لەهیچ ڕوویەکیشەوە سڵ نەکراوەتەوە، بۆیە کەبەوری سەیری جۆری ئەو تاوانانە دەکەین، پێکهاتەی تاوانی جینۆساید بەتەواوی دیارە(٣).

پرۆسەی ئەنفالکردنی خەڵکی کوردستان و کیمیابارانی هەڵەبجەی شەهید و دەوروبەری و دڕندانەترین جۆری تاوانی جینۆسایدن کە ڕژێمی ڕەفتار فاشستی بەعسی روخاو بەبەرنامە و پلان و بەقەدەغەترین لەیاسای نێو دەوڵەتاندا دەیویست گەلی کورد قڕ بکات و مۆرکی نەتەوایەتی بسڕێتەوە، کەسەرەتای پیلانەکانی لەهەردوو گەورە تاوانی جینۆسایدی ئەنفال و کیمیابارانی هەلەبجەوە لەساڵی ١٩٨٨ دا بەدەر دەکەوێت کەبەزەقی جینۆسایدی لەکوردستانا پراکتیزەکرد، لەو نێوەندەدا نزیکەی (١٨٧٠٠٠) کوردی بێ تاوانی تێدا بوبەقوربانی سیاسەتەکانی رژێمی بەعسی روخاو، لەگەڵیدا جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆریش تێدا بریندار کرا، بەهەمان شێوە سنورێکی بەرینی خاکی کوردی تێدا وێرانکرا خەڵکەکەی ڕەوانەی ئۆردوگا زۆرە ملێکان کرا، دارو دارستان و زەوی و زاری خەڵکی تێدا بەتالاّن برا(٤) .

جگە لەمانەش دامودەزگاکانی نهێنی عیراق خوێنیان لەگەنجەکوردەکان دەردەهێنا بۆ بریندارەکانی شەڕی (عێراق ئێران) بەپێی دیکۆمێنتی ژمارە (١٦٠) لە ١٩٨٩/٢/١٠ لەبەڕێوەبەری مخابەراتی پارێزگای تەئمیم ، ناوی سیانی ١٨ کچ تۆمار کراوە کەنێردراون بۆ بەڕێوەبەرایەتی مخابەراتی گشتی، تەمەنی کچەکانیش لە ١٤-٢٩ ساڵەو بۆ ئەوەی بەپێی فەرمانەکانیان بنێردرێن بۆ نادیە شەوانەکانی کۆماری میصری عەرەبی، چەندان لێپرسراوی بەعس لەدام و دەزگاکانی ئەمن و ئیتخبارات و سوپا، چەندان کچی کوردیان لەزیندانەکانی تۆپزاوە، بس،تکریت، نوگرەسەلمان ، هەڵبژاردووە وەك کۆیلە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردون هەم خزمەتی کۆشکەکانیان پێکردون و هەم مەرامەکانی خۆیان پێ تێر کردوون، پیاوەپیرەکانیان لەزیندانی نوگرەسەلمان بەند کرد چەندان کەسیان بونە خۆراکی سەگ و جانەوەرەکانی بیابان، سەدان هەزار لەژن و منداڵ و گەنج گوللە باران کران و لەحەزەرو بیابانەکانی ناوەراست و خواروی عێراق بەشۆفڵ کران بەژێر گڵەوە(٥). هەر لەو بارەیەوە (قەدریە محمد) کەشەش مانگ لەگرتوخانەی دبس

بەخۆی و منداڵەکانیەوە گیرابوون، باسی لە مەرگەساتی ئەو ماوەیەی کرد کە لە(دبس) مابونەوە، ئەوەشی ووت کاتێك لادێکەی خۆیان راگوێزران هەموویان لەقایمقامیەتی چەمچەماڵ کۆکردنەوە کە سێ شەو لەوێ مابونەوە، دەڵێت لەماوەی ئەو سێ شەوەدا دڕندەکانی بەعس هەرکچێکی جوانیان بەدڵ بوایە لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردو لەئێمەیان جیا دەکردەوە. هەروەها لەبارەی کەس و کارەکەیەوە ووتی پیاوەکەم و برایەکم و برازایەکم و چەندین کەس و کارم ئەنفال کراوە ، ئەمە جگە لەماڵ و سامان [٦].

ئەم پرۆسەیەش ئەو کاتە گەیشتە لوتکە کە ڕژێمی بەعس بێ سڵەمینەوە دەستی بۆ جینۆسایدکردنی کۆمەڵگای عێراقی برد پێدەچێ بەلایەنی کەمەوە رژێمی بەعسی هەڵوەشاوە لەسەرەتای ساڵەکانی هەفتاوە ئیتر پلانی بەدەستەوە بوبێت بۆ مەبەستی پاکسازی کردن، بەتایبەتی کاتێك خودی صدام دەسەلاّتی گرتە دەست لە نێو ئۆرگانە بەهێزەکانی حزبدا . ئیتر بەیەکجاری ستراتیژی سیاسی بەعس و رەهەندە گشتی یەکانی ئەو پلانەی کە ئاماژەیان بۆ کرد بەباشی بەدیار کەوتوو بووە پلانی پلەیەك [٧] .

زنجیرە هێرشی ئەنفالەکان، پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابوو واتە لە چوارچێوەی سیاسەتێکی دیاریکراودا بەشێوەیەکی سیتماتیك تاوانەکان ئەنجام دران ، ئەوەش جینۆساید لە تاوانی دیکە جیا دەکاتەوە , مەبەستی فەوتاندنی سەراپاگیری هەبووە، ئەو فەوتاندنە بەچەند جۆرێك ئەنجامدرا .

١- بەشێوەی نەهێشتنی فیزیکی، واتە سەپاندنی مەرگ بەهەر جۆرێك بێت .

٢- بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و فسفۆری جگە لەوەی دەبێتە هۆی کۆمەڵکوژی مرۆڤ، دەبیتە هۆی قڕ کردنی ئاژەڵ و باڵندەو ژەهراوی کردنی ئاووهەواو کەرەستەکانی ژیان.

٣- وێرانکردنی ناوچەکانی کوردستان، دێهات و شارۆچکەو، وێرانکردنی باغ و بێستان و سەرجەم سەرچاوەکانی ژیان .

٤- راگواستن لەدوای دیل کردن ودەەست بەسەراگرتنی خەڵکەکەو پاشتر بەکۆمەڵ کوشتنیان.

٥- ویرانکردن و راگواستن ەبنە هۆی هەڵتەکاندنی ستراکتوری ئاسایشی ژیانی خەڵکی کوردستان . بنەمای ئابوری وێران دەبێت و پێوەندیە کۆمەلاّیەتیەکان تێکدەچن.

٦- لەئەنجامی ئەو کارانەوە بارو زروفێکی نائاسایی دروست دەبێت کەئەنجامی گەلێك خراپ و درێوی لەسەر مرۆڤ دەبێت و بەتایبەتیش هۆی شێواندنی باری سایکۆلۆژی خەڵك و تێکدانی بیرو هۆش [٨].

دەرکردنی بەزۆر، بۆیە پێی دەڵێن دەرکردنی بەزۆر، لەبەر ئەوەی بەردەوام ڕژێم ئەو خەڵکانە لەبەردەم دوو ئەگەردا ڕادەگرێت.

ئەگەری یەکەم: ئەوە دەرکرنی بیٚ کۆت و مەرج و دەستگیرکرن بوو بەسەر سەروەت و سامان و خانوو زەویدا .

ئەگەری دووەم: هەڵگرتنی ناسنامەی عەرەبی بوو یاخۆکردنە عەرەب. ئەگەر ملکەچی یەکێك لەم دوو ئەگەرانە نەبویتایە کەهەر دەبوو ببیت ئەوا توشی لێدان و سزاو زیندانی کردن و سوکایەتی دەبیتەوە ، زۆربەی ئەوانەی کەدەرکران بەتایبەتی لەساڵی (١٩٨٨) بەدواوە، سەرەتا توشی گرتن و سزادان دەبونەوە، محمد کریم ئەمین: لەدایك بووی ساڵی ١٩٤٣ دا دەڵێت : ئێستاش سەرم شوێن قۆناغە تفەنگی ئەمنەکانی پێوە دیارە .[٩]

لەلایەکی ترەوە، مەودای مەبەستەکان ڕژێمی عێراق ، بەدڕندەیەکی ئاشکراوە لە سیٚ ئامۆژگاریدا کە بیرۆی المجید لە جونی ١٩٨٧ دا، دەری کردووە، بەڕێژەی ئاشکراوە قەدەغەکردنیان لەسەر هەموو ژیانی مرۆڤ لەناوچە دەست نیشانکراوەکانی دێهاتی کوردستان کەزیاتر لە هەزار گوند دەگرێتەوە داناوە، بەپێی فەرمانی (تەقە بکە بۆ ئەوەی بکوژیت) وە جیٚ بەجیٚ دەکرێت ، و بۆئەوەش ئاگادارکردنی هیچ دەسەڵاتێکی سەرو تر پێویست ناکات .

یەکەمیان ، ئامۆژگاری شخصی یە، ژمارەکەی ٣٦٥٠/٢٨، علی حسن المجید خۆی لە بەرواری ٣ی جونی ١٩٨٧ دا ئیمزای کردووە ، ئەم ئامۆژگاریە بۆ دەزگا سیڤیل و عەسکەریەکانی نێردراوە ، دەقەکەش ئەم خاڵانەی خوارەوە یە .

١- بەتەواوی قەدەغەیە کە هەموو خواردەمەنیەك، یان خەڵك یان ئامێر بگەنە ئەو گوندانەی کەلەبەر هۆی ئەمنی قەدەغەکراون، کە لەقۆناغی دووەمی گوند کۆکراوەکاندان. هەر کەسێکیش بیەوێت بێتەوە، ڕێگەی پیٚ ئەدریٚ بگەڕێتەوە ڕیزی نیشتمانی، بە هیچ

**شێوەیەك ڕێگە نارێت بەکەس وکاریان پەیوەندیان پێوە بکەن، تەنها بە ئاگاداری دەزگا ئەمنیەکان نەبێت .**

**٢- بوونی ئەو خەڵکانەی لە قۆناغی یەکەمدا ڕاگوێزرابوون لەناو ئەو ناوچانەی کەلەبەر هۆی ئەمنی قەدەغە کراون ، بەتەواوی قەدەغەیە .**

**٣- ئەوەی پەیوەندی بەدروێنەوە هەیە! پاش کۆتایی زستان کە پێویستە پێش جولاّی تەواو بێت، کشتوکاڵکردن (لەناوچەکەدا) لەزستانی داهاتوو وەرزەکانی هاویندا ڕێگەی پیّ نادرێت، ئەمەیش لەم ساڵەوە دەست پیّ دەکات .**

**٤- مێگەل بردن بۆ لەوەڕگا لەم ناوچانەدا قەدەغەیە .**

**٥- پێویستە هێزە چەکدارەکان بەپێی ئەو دەسەلاّتەی هەیانە، هەر مرۆڤێك یان ئاژەڵێك لەم ناوچانەدا هەن، بکوژن . ئەم ناوچانە بەتەواوی قەدەغەن .**

**٦- بەم بڕیارە ئەو کەسانەی کە ڕاگواستن بۆ ئۆردوگاکان دەیانگرێتەوە، ئاگادار دەکرێنەوە و گەر هەر سەرپێچیەکیش بکەن، واخۆیان تەحەمولی هەموو بەرپرسیارێتیەك دەکەن[١٠] ، بەلاّم گرنگترینی هەموو دۆکۆمینتەکان ، ئەوە بوو کە لە ٢٠ی جونی ١٩٨٧دا دەرکرا ئەم بڕیارە، فەرماندەیی بیرۆکەی باکور بە ئیمزای (علی حسن المجید) دەریکردووە و سەرەرای ئەوەش، مۆری کۆمیتەی کارو بارەکانی باکوری ئەنجومەنی سەکرایەتی شۆڕشی لێد راوە، لە ژێر کۆدی س.ف /٤٠٠٨ دا بریارەکانی ٣ی جونی لەزۆر رووی گرنگەوە و فراوان کردووە .لەوانە هاندانێکی راستەوخۆ بۆ تالاّنکردن، بەپێشلکرنی ئاشکرای یاساکانی جەنگو، پیادەکردنی ئاشکرای سیاسەتی کۆمەڵکوژی، کەلەبەرزترین ئاستەکانی ڕژێمی عیراقەوە فەرمان دراون، لەناو ئەو دۆکۆمێنتەی رەسمیانەی کەبە درێژایی ساڵی ١٩٨٨ هەمیشە ئاماژەیان بۆ کردووە، شتێکی ئاشکرایە کەبریاری ٤٠٠٨ وەك فەرمانێکی نەگۆڕ هەر لەکارا بووە بۆ هێزە چەکدارەکانی عێراق و دەزگا جاسوسیەکانیش، لەماوەی کامپەینی ئەنفال و پاش ئەنفالیشدا. بۆنموونە نامەیەکی ئەمنی سلێمانی لەبەرواری ٢٩ ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا ، ئاماژە بۆ بریارەکە ئەکات وەك بنچینەیەك بۆ (( گوللەبارانکرنی ١٩ تاوانبار، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیەکەوە گوللەباران کران بەهۆی بونیان لەگوندە قەدەغەکراوەکاندا [11]..**

دەقی بەڵگەنامەی دووەم

نەتەوەی عەرەب یەکێکە خاوەنی پەیامێکی نەمرە.

حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالست .

سەرکردایەتی نوسینگەی ڕێکخستنی باکور

نوسینگەی سکرتاریەت

ژمارە / ٥٠٨٣ بەروار:١٩٨٧/٧/١٢

نهێنی و تایبەت

بابەت / ئیعدامکردنی تاوانبارێك

سلاّوێکی هەڤالاّنە :

نوسراوێکی نهێنی و تایبەتتان ٣٥٢ لە ١٩٨٧/٧/٨ ڕەفیق علی حسن ئەلمەجید — بەرپرسی نوسینگەی باکور بەم جۆری وەلاّمی نوسراوە کەتانی دایەوە (هیچ لاریمان نییە لەسەر بڕینی خیانەتکاران، بەلاّم باشتر وابوو بتانناراية بۆ ئەمن ، تاکو ئەوانیش لێکۆڵینەوە یان لەگەڵدا بکردایە لەوانەیە هەندێ بابەتیان پێش لە سێدارەدانیان لێوەر بگیرایا [١٢]

تکایە بۆ ئاگاداریتان ....

لەگەڵ ڕێزماندا ....

وێنەیەك بۆ

– سەرکردایەتی لقی ڕەشیدی سەربازی

– بەڕێوەبەرایەتی ئیستخباراتی گشتی

تاهیر تۆفیق

سکرتێری لیژنەی

کاروباری باکور

دەقی بەڵگەنامەی سێهەم کە ڕوی دزێوی عەلی کیمیایی زیاتر ئاشکرا دەکات ئەمە دەقەکەیەتی وێنەیەکی نوسراوی سەرکردایەتی نوسینگەی ریکخستنی باکوور .

ژمارە ٢٧١٤/١ لە ١٩٨٧/٤/١٠

بەپشت بەستن بەو سەلاّحیەتەی کەدراوە بە ڕەفیق عەلی حسن المجید ئەندامی قیادەی قوتری و راگری نهێنی سەرکردایەتی نوسینگەی ڕێکخستنی باکوور، بەڕێزتان بریارتاندا گوێ لەو شتانە نەگیرێ کەلەلایەن خەڵکی گوندی قەدەغەکراوەکان و ئەو

شکاتانەی کەتایبەتن بەتێکدەران یا جۆرەکەشی هەر چیەك بێت و ئەو شکاتەشی کەپێشتر بەرز کراونەتەوە رابگیرێت .تکایە ئاگاداربن و کاری پێویستی بۆ بکەن ... هەربژین بۆ خەبات.

الرفيق/ راضي حسن سلمان
جێگری راگری نهێنی
سەرکردایەتی نوسینگەی باکوور

بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی

ژمارە /ش ٣ /٣١٣١ بەروار / ١٩٨٧/٥/١٠

بۆ هەموو بەڕێوەبەرایەتیەکانی ئەمن و ئەمنی چەمچەماڵ

ب/ گوێنەگرتن لەشکات .

لەسەرەوە وینەیەکی نوسراوی نوسینگەی ریکخستنی باکوور کەزۆر نهێنییەو تایبەتە و ژمارەی ٢٧١٣/١ لە ١٩٨٧/٤/١٠ و بەنوسراوی پارێزگای سلێمانی (حوکمی محلی) نوسینگەی تایبەت ١٣٥٢/٤/٤/٢ لە ١٩٨٧/٤/٣٠ بۆتان دەنێرین .تکایە ئاگادابن و ناوەڕۆکەکەی جێ بەجێ بکەن .

بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگای سلێمانی.[١٣]

بەخوێندنەوەی ئەم بەڵگەنامانە دەردەکەوێت کەئەم فەرمانانە وەك مانیفێستی ئەنجامدانی ئەنفالەکان بووە وە دیسانەوە ڕەشەکوژیو جینۆسایدی کورد (ئەسەلمێنی).

بەتێڕوانین لەو شیکردنەوانەی خستمانە روو، کە ڕژێمی عێراق لەدژی گەلی کورد پیادەی کرد، پێشێلکردنی تەواوی یاسای نێوەولەتانە. کەواتە سەرجەم تاوانەکانی ڕژێمی عێراق دەچێتە خانەی جینۆسایدەوە. لەبەر گرنگی و پەیماننامەی قەدەغەو سزادانی جینۆسایدی ساڵی ١٩٤٨ چەند مادەیەك دەخەینە روو .

بەندی یەکەم لەپەیماننامەی ساڵی ١٩٤٨ مەبەستی سەرەکی جینۆساید ڕوون دەکاتەوە (دەوڵەتانی ئەندام جەخت دەکەنەوە کە جینۆسا چ لەکاتی ئاشتی و چ لەکاتی جەنگدا بەتاوانێکی نێودەوڵەتی دەژمێردرێت. هەروەها ئەوان بەڵێن دەدەن کەبەر

بەجینۆساید بگرن و ئەنجامدەرانی سزا بدەن[١٤]. بەندی دووەم لە پەیماننامەی ١٩٤٨ جینۆساید ڕوون دەکاتەوە کە (ئەنجامدەرانی تاوانکارییە بەمەبەستی قڕکردنی بەشێك یان سەرجەمی هەر کۆمەڵێکی نەتەوەیی، تەکنیکی، ڕەگەزی یان ئاینی) جا ئەو قڕکردنە یان ئەو فەوتاندنە هەر وەکو لەبەندی دووەمدا دیاری کراوە، بەهەر جۆرێك لەم شێوانەی خوارەوە ئەنجام ئەدرێت .

١- کوشتنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵە .

٢- زیان گەیاندن بەلەش و شێواندنی بیری ئەندامانی ئەو کۆمەڵە

٣- بەئەنقەست دانانی ئەو کۆمەڵە لەژێر بارودۆخێکی سەخت دا کە ببێتە هۆی فەوتاندنی هەموویان یان بەشێکیان .

٤- ئەگەر خستنە بەر منداڵ بوون لەو کۆمەڵەدا .

٥- بەزۆر ڕاگواستنی منداڵ لەو کۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵێکی تر .[١٥]

بەندی سێیەم ئەم کارانە شیاوی سزادانن .

١- جینۆساید .

٢- پیلان دانان بۆ جینۆساید

٣- بزواندنی ڕاستەوخۆو ئاشکرایانە بۆ ئەنجامدانی کوشتن .

٤- هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٥- بەشداری لەکاری جینۆساید [١٦].

**تاوانی ئەنفال لە ڕوانگەی یاسای گشتی نێودەوڵەتیەوە ..**

ئەو تاوانانەی کە لە پرۆسەکانی ئەنفالدا ئەنجامدران دەچنە چوارچێوەی ئەو تاوانانەی کەلەبازنەی تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، ئەوەی کە فاتیکان بە (تاوانەکانی دژ بەخوا) ناوزەندی کردووە، چونکە هەڕەشەی مانەوەی مرۆڤ و مافەکانی دەکەن لە ژیان و گەران و ئاسایش، و تاوانی کوشتن و روخاندنی سەرچاوەکانی ژیانی مرۆڤ تێك دەدات و نابێت ئەو تاوانانە بەهیچ شێوەیەك بکرێت لەبەر یاساغبونی لەڕێکەوتننامە نێو دەولەتیەکان و جاری گەردونی مافەکانی مرۆڤ و ڕێساکانی قانونی نێو دەوڵەتی مرۆییوو پرانسیپە گشتی یەکانی قانون لەوانەش ڕێکەوتننامەی زنێڤ و لاهایی و بریارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان[١٧]

لێرەدا پێویستە باسی تاوانی نیودەوڵەتی بکەین پاشان تاوانی جینۆساید بەتاوانێکی نێودەوڵەتی دیاری بکەین و لەبەر ڕۆشنایی ئەمانەدا تاوانی ئەنفال لە روانگەی یاسای گشتی نێو دەوڵەتیەوە رون بکەینەوە .

تاوانی نێو دەوڵەتی – ناساندنی گشتی :

تیۆری گشتی (لێپرسراوێتی نێو دەوڵەتی تاوان) بەحوکمی ئەوەی هێشتا لەقۆناغی گەلاڵە بوندایە. تارادەیەك زۆرێك لەلایەنەکانی تەم و مژاوین چ لەرووی ئەو لایەنانەوە کە بەپێی ڕێسا نێو دەوڵەتیەکان لێپرسراوێتی تاوان دیاری دەکەن، یاخود لەڕووی ئەو کۆڵەکانەی کە دەبێت لەتاوانە نێو دەوڵەتیە جۆراو جۆرەکان دا هەبن، یان لەرووی تایبەتمەندێتی سەبارەت بە دادگاییی کردنی تاوانکارەکان یاخوود لەرووی دەستپێکردنی ئەو سزایانەی بەسەر ئەو کەسانەدا دەبڕێتەوە، بەلأم لەم ماوەیەی دوایدا کۆمەڵی نێو دەوڵەتی چەندین هەنگاوی لێبراوانەی لەبواری لێپرسراوێتی نێو دەوڵەتی تاواندا ناوە، چ لەسە ئاستی ڕیساکان یاخوود لەسەر ئاستی ڕێکخستنندا [١٨].

**کۆڵەکەکانی تاوانی نێو دەوڵەتی:**

بەپێی شیکردنەوەی دکتۆر محمود نەجیب دوسنی، ئەوە هەڵدەهەنجێنین کە تاوانی نێودەوڵەتی چوارکۆڵەکەی هەیە بریتی یە لەمانە .

١– کۆڵەکەی مادی تاوانی نێو دەوڵەتی.

تاوانی نێودەوڵەتی وادەخوازێت کردەوەیەك کرابێت، ئەم کردەوەیەو ئاسەوارەکانیشی کۆڵەکەی مادی تاوانی نێودەوڵەتی پێك دەهێنن .

ئەم کۆڵەکەیەش لە سیٚ توخم پێك دێت .

کردەوە: ئەو ڕەفتارەیە کەتاوانکار دەیکات لەپێناوی هێنانە دی مەبەستێکی تاوانکارانەدا.

ئەنجام: ئەو دەست درێژییەیە کەدەکرێتە سەر مافێك لەمافەکان، وەك ئاسەوارێکی ئەو کرەوەیەی کەتاوانکار کردوێتی .

پەیوەندی هۆکارانە: ئەو رایەڵەیە لەنێوان کردەوەکەو ئەنجامەکەدایە بەیەك پارچەیی کۆڵەکەی مادی بەدی دێت .

کردەوەکەش مانایەکی فراوان دەگرێتەوە .

٢- کۆڵەکەی مەعنەوی تاوانی نیو دەوڵەتی .

تاوانەکە وادەخوازێت کردنەوەیەك بەو ئاراستەیە کرابێت لەلایەن کەسێکی خاوەن ویست بەپێی یاساکە بەئامێرێکدا ڕۆیشتبێت یاسا پەسەنی ناکات .

٣- کۆڵەکەی شەرعی تاوانی نێو دەوڵەتی .

تاوانی نێودەوڵەتی وادەخوازێت ئەو کردەوەیەی تاوانەکەی لیَ کەوتۆتەوە سیفاتی نارەزایی هەبێت کە خۆی لەدەست درێژی بۆ سەر ڕێساکانی یاسای نێو دەولەتیدا دەبینێتەوە .

٤- کۆڵەکەی نێو دەوڵەتی تاوانی نیو دەولەتی .

ئەم کۆڵەکەیە ئەگەر تاوانی نێو دەوڵەتی ئەنجام درا ئەو کاتە دەست بەردار ئەبێت کە دەست درێژی بکرێت لەسەر بەرژەوەندی یاخود مافێك کەیاسای نێو دەوڵەتی پارێزگاری لیَ دەکات .

بەم پێیەش ئەم کۆڵەکەیە بوونی خۆی لەجۆری ئەو بەرژەوەندی یاخوود مافانەدا دەبینێتەوە کەدەستدرێژیان دەکرێتەسەر[١٩].

لەتاوانەکانی لەناو بردن یاخود لەهەر ڕووداوێك دا کۆڵەکەکانی تاوانی نێودەوڵەتی بەدی بێنن ئەوا کۆمەڵێك ئامانجی لێدەکەوێتەوە .

١) تاوانەکانی لەناو بردن تاوانی ناسیاسین و هەر وولاَتێك لەسەریەتی تۆمەتباران تەسلیم بکات بەمەبەستی دادگایی کردن (واتا بنەمای نەکردنەوەی تۆمەتبارانی سیاسی ناکرێتەوە)

٢) تاوانەکانی لەناو بردن ( ئەنفال) لەکوردستان لە جۆری تاوانی نێودەوڵەتین واتە لەجۆری تایبەتمەندی گشتگیرن و بۆ هەر وولاَتێك هەیە کەتۆمەتبارانی ئەو تاوانە دادگایی بکات کاتێك لەسەر خاکەکەی بوو، ئەمە جگە لەتایبەتمەندی ناوخۆیی بۆ لێپرسینەوەی تۆمەتبارانی ئەو تاوانە [٢٠].

٣) هەرگیز نابێت ئەنجام دەری تاوانەکە ببوردرێت تەنانەت ئەگەر لەپۆستی سەرۆك دەوڵەتیش بێت. ئەویش بەپێی ڕێکەوتننامەی ساڵی ١٩٧٠ ، بەڵکو دەبێت لەبەردەم دادگای تاوانی نێو دەوڵەتی تایبەت بەتاوانە نێو دەوڵەتیەکان دادگایی بکرێت، هیچ ئەمنیەت (حەسانە) یەکی یاسایی یان دیبلۆماسی یان دادوەریش بۆ تاوانباری نێو دەوڵەتی نیە .

٤)  یاسای نێو دەوڵەتی لەبەرامبەر یاسای نیشتیمانیدا سەردارە، گەر بێتو وێکنەچون لەنێوان  هەردوو یاساکەدا هەبێت ئەوا دەبێت ئەو حومانە زاڵ بکرێت کەیاسایی نێودەوڵەتی بریاریان لەسەر دەدات.

٥)  نابێت ئەنجامدەری تاوانی نیو دەولەتی مافی پەنا هەندەیی سیاسی پێبدرێت،چونکە کەسێکی سیاسی نیەو تاوانەکەی بەکردەوەیەکی سیاسی دانانرێت و مافی پەنا هەندەی و مرۆییش نایگرێتەوە لەبەر ئەوەی تاوانبارێکی ئاسایی داواکراوەو پێویستە لەبەر دەم یاسادا دادگایی بکرێت لەپای ئەو تاوانەی ئەنجامی داون و دەبێت ئەو سزا عادیلانە وەربگرێت کە بەپێی یاسا شایستەیەتی .[٢١]

٦)  یاسای نێو دەوڵەتی لەبەرامبەر فەرمانی سەرۆك سەردارا ، چونکە دەرچونی فەرمانێکی سەرۆك کەبەپێی رێساکانی یاسای ناوخۆ دەبێت گوێرایەڵی بکرێت نابێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ڕەوایی بەتاوانی نێو دەوڵەتی بدات، لەبەر ئەوەی لەحاڵەتی سەرپێچیکردنی یاسادا گوێرایەڵی بۆ هیچ کەسێك ناکرێت [٢٢]

٧)  ئەم تاوانە بەتەقادم ناسڕێتەوە واتە بەتێپەربوونی کات کۆتایی پێ نایەت، ئەوەش بەگوێرەی ( عدم التقادم ) (بڕیاری ژمارە ٢٣٩١ لە ٢٦/تشرینی دووەمی/١٩٦٨ و لە ١١/تشرینی دووەم خراوەتە بواری جێ بەجێکردنەوە[٢٣].

لەبەر ڕۆشنایی هەردوو نموونەی نۆرن بێرگ و تۆکیۆدا، تارادەیەك زۆر تێگەیشتنی (فقە) و لێك دانەوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە چوار تاوانی گەورە هەن تەنها یاسای نێودەوڵەتی گشتی سزای بۆ داناون بگرە ئەنجامدەرانیان ملکەچی تایبەتمەندێتی دادوەری نێو دەوڵەتی دەبن، بریتین لەمانە:

١- تاوان لەدژی ئاشتی

بریتین لەم کارانە: نەخشەکێشان، دابین کردنی کەرەسەی شەڕو خۆ ئامادەکردن یان دەستپێکردنی شەڕ یان هەر شەڕێك کەپەیماننامەو ڕێکەوتننامەو ڕاگەیاندنەکانی نێوان دەوڵەتان بشکێنێت یان بەشداربون لەو نەخشەو پلانانەی کەبەمەبەستی ئەنجامدەرانی ئەو کارانەن.

٢- تاوان لەدژی مرۆڤایەتی

بریتین لە:- کوشتن، کۆیلە کردن، ئازاردان، ڕاگواستن، دوورخستنەوەی کۆیلە کردن، تیرۆرو تۆقاندن، گرتنو چەوساندنەوە لەبەر هۆی سیاسی یان ئاینی یان رەگەز جا بەشێوەی کۆمەڵ بێت یان تاك بێت [٢٤].

**تـاوانی جەنگ :**

تاوانەکانی جەنگ بەوە دەناسرێت کە (ئەو کردەوانەن تۆمەتبارەکان ئەنجامیان داوە وەك پێشێلکردنی یاساو نەریتەکانی جەنگو ڕێکەوتننامە نێو دەوڵەتیەکانو یاسا جینائی یە ناوخۆییەکان و بنەما گشتی یەکانی یاسای تاوان کەلەگشت دەوڵەتە شارستانەکان دا دانیان پیادا نراوە) ئەو کردەوانەش لەچوارچێوەی پلان یاخود سیاسەتێکی گشتی دا ئەنجام دەدرێت، ئەم تاوانە لەرووی دەرکەوتنیەوە بەلەپێشترین تاوانی نێودەوڵەتی دادەنرێت، بۆیە ڕەگو ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێساو نەریت (عورف) یانەی کەلەسەدەی نۆزدەیەمدا باوبوو. ئینجا ژمارەیەك ڕێکەوتننامە هەر لەڕێکەوتننامەکانی لاهای ساڵی ١٨٩٩و ١٩٠٧ەوە تا دەگاتە پەیرەوی بنچینەیی دادگای نێودەوڵەتی تاوانی ١٩٩٨ کەتیایدا ڕێساکانی یاسای جەنگ لەگەڵ ڕێساکانی یاسای نێودەولەتی مرۆییدا یەکتر گیربوون لەسیستەمی یاسایی پێکەوە گرێ دراودا[٢٥].

هەروەها بەندی سێ ی هاوبەشی هەر چوار ڕێکەوتننامەی جنێف ١٩٤٩ تایبەت کراوە بەو شەڕانەی کەخەسڵەتی نێو دەولەتیان نییە، واتە لایەنەکانی شەڕ هەر دەولەتان نین، بەڵکو دەوڵەتان لەلایەكو بزوتنەوەی چەکداری ڕزگاریخوازی لەلایەکی ترەوە لەچوارچێوەی ئەو دەولەتەدا کە شەڕی لەگەڵدایە .ئەم بەندەش دانپێدانانی یاسای نێو دەوڵەتانە بە بزوتنەوەی ئەو گەلانەی لەقۆناغی رزگاری نیشتمان دان، کەئەو بزوتنەوانە لایەنن (subiect) لەیاسای نێو دەولەتاندا ، بەتایبەتیش پرۆتۆکۆڵی یەکەمی (١٩٧٧) پاش بەندی ڕێکەوتننامەکانی ژنێف، یەکەم پەیماننامەی نێو دەوڵەتیە کەبەو جۆرە حوکم دەدات دەربارەی کەسایەتی یاسای نێو نەتەوەیی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلان لەپێناو ئازادیدا [٢٥].

هەروەها (ئەنفال) پێچەوانەی بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتوەکان و ئامانجەکانی ئەو ڕێکخراوە دەبێتەوە بەتایبەتی مادەی (١)ی بروانامەکە کەتیایدا هاتووە ،(هاندانی گیانی برایەتی و پێکەوە ژیان لەنیوان نەتەوەکان لەسەر بنەمای یەکسانی و جیاوازی نەکردن لەنێوان یاندا بەجۆرێك کەهەموو گەلێك ماف بڕیاردان و چارەنووسی هەیە [٢٧]

لەم سۆنگەیەوە (ئەنفال) بەتاونێکی نێو دەولەتی دادەنرێت ، بکەرانی ئەو کارەساتە لەرووی یاساییەوە دەبێت روبەروی سزای یاسا بکرێنەوە. بە پشت بەستن بە ماددەکانی

**(٦،٧) ی پەیماننامەی نەهێشتنی کۆمەڵکوژی کەتیایدا هاتووە (بەشداران لەکۆمەڵکوژی تایبەتمەندی نیشتمانی یان نێو دەولەتی و کۆمەڵکوژی بەتاوانی سیاسی دادەنرێت [٢٨].**

**ئەوەی راستی و بەڵگەنامەی جیهانی بۆ مرۆڤایەتی رەوا بینیوە ، لەدژی تاوانی نێو نەتەوەیی ، ئێمە هەوڵمان داوە لایەنە ڕونەکانی بخەینە روو بۆ ئەوەی حوکمی یاسای نێو دەولەتان لەو بارەیەوە لەئاستی میللەتێکی ژێرپێ خراوی وەکو کوردا روون بکەینەوە، بەلأم میکانیزمە جێ بەجێکردنی ئەو حوکمانە ، زۆر جار لەپێناوی بەرژەوەندی و سیاسەتی جیهاندا پێچەوانە دەکرێتەوە، ئالێرەوە ، بەپلەی یەکەم ئەرکی گەورە دەکەوێتە سەر گەلی کورد لە ئیسپاتکردنی واقیعی ژیانی خۆی .**

## پەراوێزەکان:

١) سەمانا پاوەر .ئەمریکا و ئەنفال، و/ بەختیار کریم/ چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٨،ل ١٩

٢) سەمانا پاوەر ، هەمان سەرچاوە ، ل٢٠

٣)د.مارف عومەر گوول،جینۆسایدی گەلی کوردستان لەبەر ڕۆشنایی یاسای نێودەوڵەتاندا، دەزگای ئاراس، چاپی چوارەم ، هەولێر -٢٠٠٧،ل٢٩

٤) فازل فایەق، هەشتاو هەشت زەمەنی پراکتیزەکردنی جینۆساید لەکوردستاندا ،گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژمارە (١) ،٢٠٠٤ ،ل ٩١-٩٢ .

٥)عەبدووڵلا کریم محمود ،ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە ، سێیەمین تاوانی جینۆسایدە لەجیهاندا ، گۆڤاری هەشتاو هەشت ، ژمارە (٧-٨) ،٢٠٠٧ ل ٤٤.

٦) چاوپێکەوتنی توێژەر .

٧) هۆشیار عبدالعزیز ئەنفال لەبەعسدا قسەیەك لەرابردوو، گۆڤاری ئەنفال ژمارە (٢٤)٢٠٠٣ ،ل ١٧٧.

٨) د. مارف عمر گول ، ئەنفال قۆناغێکە لەپراکتیك کردنی جینۆساید ، بلأوکراوەکانی بەشی روناکبیری ، سلێمانی - ٢٠٠٠ ، ل ٨-٩ .

٩) لەتیف فاتیح فرج، مجید صالح، کورت قڕان، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٣،ل٣٧.

١٠) ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ / خۆرهەلأتی ناوەراست ، عێراق و تاوانی جینۆساید شالأوی ئەنفال دژی کورد ، و/ جمال میرزا عزیز ،چاپی یەکەم ، بەرلین ٢٠٠٠ ،ل ٧٨

١١) ڕێکخراوی چاودێری کافی مرۆڤ / خۆرهەلأتی ناوەراست ، هەمان سەرچاوە ، ل ٧٩.

١٢) لەتیف فاتیح فرج ،مجید صالح ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٧.

١٣) لەتیف فاتیح فرج ،مجید صالح ،هەمان سەرچاوە ، ل ٥٤.

١٤) ئاکۆ حمە کریم ، جینۆساید و ئەنفال وەك تاوانێکی دژە مرۆڤایەتی صدام و ارو دەستەکەی راپێچی دادگا کرد ، گۆڤاری سەروەری ژ.١٧ ، سلێمانی -٢٠٠٦ ، ل ٥٩ .

١٥) د.مارف عمر گول، ئەنفال قۆناغێکە لەپراکتیك کردنی جینۆساید، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٩-٤٠ .

١٦) ئاکۆ حمە کریم، جینۆساید و ئەنفال وەك تاوانێکی دژە مرۆڤایەتی صدام و ارو دەستەکەی راپێچی دادگا کرد، سەرچاوەی پێشوو ل ٦١ .

١٧) د. مونزر الغەزەل، بەرپرسیارێتی قانونی لەتاوانەکانی ئەنفالدا، و/ ایسماعیل نجم الدین، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژ.٧-٨، سەرچاوەی پێشوو .

١٨) باوکی عمر، تاوانی ئەنفال لەروانگەی یاسای گشتی نێودەولەتیەوە، و/ دلاوەر عوسمان ،گۆڤاری سەروەری، ژ.١٧ ،٢٠٠٦ ،ل ٤٠ .

١٩) باوکی عمر، هەمان سەرچاوە ، ل ٤١-٤٢ .

٢٠) د. مونزر الغەزەل، بەرپرسیارێتی قانونی لەتاوانەکانی ئەنفالدا، و/ ایسماعیل نجم الدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣ .

٢١) باوکی عمر، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٢-٤٣ .

٢٢) باوکی عمر، هەمان سەرچاوە ، ل ٤٣ .

٢٣) د. مونزر الغەزەل، بەرپرسیارێتی قانونی لەتاوانەکانی ئەنفالدا، و/ ایسماعیل نجم الدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٤.

٢٤) د. مارف عمر گول ، ئەنفال قۆناغێکە لەپراکتیك کردنی جینۆساید ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٤.

٢٥) باوکی عمر، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٣ -٤٤ .

٢٦) د. مارف عمر گول، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٥-٣٦.

٢٧) چێنەر علی جۆلاً، زەمینە یاساییەکانی دادگایکردنی ئەنجامدەرانی تاوانی ئەنفال، گۆڤاری هەشتاو هەشت ، ژ.١ ،٢٠٠٤، ل ٩٦ .

٢٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٩٦ .

# ڕۆڵی هاوكاره كوردەكان
# لەجێبەجێكردنی پرۆسەكانی ئەنفال دا

صلاح ڕەنجدەر

ئـەو زنجـیره هێرشـانەی سـوپای عێـراق لـە شـوباتی (1988)دا لـەدژی خـەڵكی كوردسـتان بـەناوی پرۆسـەكانی ئەنفالـەوه بـە چـەند قۆناغێـك ئـەنجامی دان جێیـەجیٚ كردنـی ئەڵقەیـەكی ترسناكی ستراتیژیی درێژخایـەنی بـەعس بـوو بـۆ جینۆسـاید كردنـی كـوردو سـڕینەوەی سـیمای دیمـوگرافی باشـووری كوردسـتانو تواندنـەوەی گەلەكەشـی لەبۆتـەی گـەلی عـەرەبی دەسـەڵاتداری عێـراق دا. ئەمـەش دەقـاو دەق نوێنـەرەوەی بـیری ڕەگـەز پەرسـتانەی ناسـیونالیزمی عەرەبیـە كـە لـە قۆناغـە مێژووییـە جیاجیاكانـدا بـە چـەندین ڕێگـاو شـێواز (بـە هاوكـاری سەربازیـشەوه) هەماهـەنگیان لەگـەڵ ڕژێمـەكانی عێراقدا كردووه بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو مەبەستانەی لەسەرەوه باسكران، لە دەورانـی یەكـەمی فـەرمانڕەوایی بەعسیەكاندا لـە عێـراق شـەڕی لـەناو بردنـی كـورد زۆر بەخەسـتی بەڕێوه دەبرا، ئەو تاوانانەی لەدژی شـارو گونـدەكانی كوردسـتان ئەنجام دەدران هیچیان لـە تاوانـەكانی ئـەنفال كـەمتر نـەبوو، كوشـتنی خـەڵك بـەتاكو بـە كۆمـەڵو ڕوخانـدنی گەڕەكەكانی شارو سوتاندنی گوندەكان و تالاٌن كردنو بیٚ سەروشوێن كردنـی خـەڵك لـەو تاوانانەی ڕژێمی بەعسی عارفین كە بیٚ قەیدو شەرت لە ڕیزی تاوانی جینۆسایددا پۆلێن دەكرێن[1]

لـە سـاڵی (1963)دا كۆمـاری سـوریای عـەرەبی هاوكاریـەكی زۆری ڕژێمـی عێراقـی دەكـرد بـۆ جێبـەجیٚ كردنـی ئـەم تاوانانـە لـەم ڕووەوه سـوریا لیوایـەكی سـەربازی لـە سوپاكەی خۆی بە فەرماندەیی (عقید فهد شاكر) بۆ یارمـەتی دانـی سـوپای عێـراق نـاردە شەڕی كوردستانی عێراقو بەشداری شەڕی لەناوبردنی كوردیان كرد.[2]

سوپای سوریا لەچەند ناوچەیەكی كوردستاندا جێگیر بوو كە تیایانـدا زۆر دڵڕەقانـە مامەڵەی لەگەڵ خەڵكی دا دەكردو لـە بۆردومـان كردنـی ناوچـەكەو گرتنو كوشـتنیش دا

وەك دوژمنی سەرسەخت ڕەفتاری ئەكرد، هزری عەرەبچێتی لە قۆناغەكانی دواتریش دا ڕەنگدانەوەی لەسەر شێوازەكانی هەڵس و كەوتی ڕژێمە یەك لەدوای یەكەكان بەجێ هێشتبوو، زیاتر لەوەش هەندێ جار بزوێنەری سەرەكی سیاسەتی ئەم ڕژێمانە بوو دەرهەق بە گەلی كوردستان و هەر لەم ڕوانگەیەشەوە مانەوە و گەشەكردنی كۆمەڵی كوردەواری بەهەڕەشە بۆ سەر ئەمنی ستراتیژی عەرەب لە قەڵەم ئەدرا. بۆیە هیچ ڕژێمكی عێراقی نەبووە شەڕی لەناوبردنی خەڵكی كوردستانی نەكردبێ و ئەگەر جیاوازیەكیش لە نێوانیان هەبووبێت ئەوا تەنیا لە شێوازی بەڕێوەبردنی جەنگەكەدا بووە نەك لە عەقڵیەتی سیاسی و شێوازی بیركردنەوە لەچارەسەر كردنی كێشەكان لێرەوە، دەتوانین بڵێین ئەو سیاسەتە شۆڤێنیەی لەسەرەتای پێكهاتنی دەوڵەتی عێراقەوە تادەگاتە هەردوو قۆناغی فەرمانڕەوایی بەعسیەكان و ئەو هاوكاری و دەست لەپشت دانەی عەرەب لەسەر ئاستی میللی و حكومی بۆ شەڕی لەناوبردنی كورد دەستەبەریان دەكرد زادەی هزری ناسیونالیستی كۆنەپەرستی عەرەب بوون، كە لە سالآنی كۆتایی هەشتاكانی سەدەی ڕابووردودا گەیشتە قۆناغێكی ترسناك و تیایدا جینۆساید بەتەواوی مانای زاراوەكەوە لەدژی ڕەگەزی كورد پەیڕەوكرا كە پرۆسەی ئەنفال گوزارشتێكی ئەو تاوانە بەرفراوانانە بوو كە ئەم سیاسەتە لەخۆی دەگرتن.

ئەوەی ڕژێمی عێراق لە ئەنفال دا بەرامبەر بە دانیشتوانی گوندەكانی كوردستان و هەندێك لەشارو شارۆچكەكانی كرد ((ئەكرێت لەگەڵ هۆلوكوست دا بەراورد بكرێت كە نازیەكانی ئەڵمانیا بەرامبەر بە جولەكەكان لە دووەم جەنگی جیهانیدا بەرپایان كرد بەرەچاوكردنی جیاوازی لە ژمارەی قوربانیانی ئەو ڕووداوەدا.[3]– ئەو ژمارانەی لە خوارەوە ئەیخەینە بەر دیدەی خوێنەر بەڕوونی دەری دەخات كە پرۆسەكانی ئەنفال لەجینۆسایدو شەڕی لەناوبردنی كورد بەولاوە شتێكی تر نەبوون، ئەگەر هەموو ئەم دڕندەییەی بەرامبەر بەگەلی كورد لە چوارچێوەی عێراقدا ئەنجام دران ڕەنگدانەوەی بیری تاریكی ناسیونالیستی بێ بەپێی هەل و مەرج و قۆناغە لەبارەكانی گەشەكردنی بزاڤی ناسیونالیزمی عەرەبی، ئەی دەبێ ڕۆڵی كورد لە ئەنجام دانی جینۆسایدی كوردا لە كوێدا خۆی ببینێتەوە و ئەوەی هاوكارانی كورد لەم پرۆسانەدا كردیان كاریگەری لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی پرۆسەكان دا چۆن ڕەنگ بداتەوە؟ ڕژێمی دیكتاتۆری سەدام هەروەكو ڕژێمەكانی پێشوو كەڵكی زۆری لەو كوردە ناهۆشیارانە وەردەگرت كە بەهۆی

جیاجیاوه لەژێر ناوی جیاجیادا جاشەیەتیان بۆ دەكرد و هەمیشە وەكو چەكوشێك بۆ سەر كوتانەوەی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی كوردیان بەكاردەهێنان. لەڕاستیشدا جاشایەتی زەمینە خۆشكەری سەرەكی بوو بۆ سەرخستنی لەناوبردنی كورد لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، ئەو شەڕەی لە ئەنفال دا گەیشتە ئەوپەڕی دڕندەیی. هەموو ئەوانە هەریەكە بەشێوەیەك تیایدا بەشدار بوون كە جاشایەتی وەكو خاڵی هاوبەش پێكەوەی گرێ دەدان و بریتی بوون لە:

١-كاربەدەستە كوردەكانی ناو دەستە بالاّكانی حیزبی بەعس و ئەوانەی پۆستی بالاّیان لە حكومەت دا بەهۆی هەڵوێستی سیاسیەوە پێ درابوو.

٢- هەموو ئەندامانی ئەنجومەنە كارتۆنیەكانی (تەشریعی و تەنفیزی) .

٣- ئەو كوردانەی پلەی ڕەفیق و بەرزتریان لە حزبی بەعس دا هەبوو.

٤-ئەو كوردانەی باوەڕپێكراوی دەزگاكانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات بوون و كاریان بۆ دەكردن.

٥- هەموو فەرماندەو چەكدارەكانی مەفرەزە تایبەتەكان كە ڕاستەوخۆ لەژێر فەرمانی هەردوو مەنزومەی هەواڵگری شەرقیەو شمالیەدا كاریان دەكرد یان لەژێر فەرماندەیی بەڕێوبەرایەتیەكانی ئەمن دا كاریان دەكرد.

٦- هەموو موستەشارو فەرماندەی سریەو جێگرەكانیان و بەشێك لە شوێن كەوتوانیان.

٧- بەشێك لەپیاوانی ئاینی ئیسلام و ژمارەیەكی زۆر لە جاش قەڵەم و ڕۆژنامەنوسان هەموو ئەمانە پێكەوە كاریگەری كارایان هەبوو بۆ ڕاهێنانی زەینی مرۆڤی كورد بۆ پەسەندكردنی دیفاكتۆی جینۆسایدو شەڕی لەناوبردنی كورد و ئەو پاسەوانەی بەعس بۆ ڕەوایی ئەم شەڕە تەلقینی لەسەر دا دابوون.

دیاردەی جاشایەتی بەشێوە چەكداریەكەی بەشێوەیەك فراوان بوو بووەوە كە بە هەزاران جاشی مەفرەزە تایبەتەكان و دەیان هەزار جاشی فەوجەكانی بەناو بەرگری نیشتمانی دەگرتەوە كە لە ڕووەكانی سەربازی، سیاسی و ئابووری و دەروونیەوە فشارێكی زۆر گەورەیان لە سەر شۆڕش و كوردایەتی دا نابوو. هەروەها گیانی بەرگری و بەگژدا چونەوەیان لە ناخی مرۆڤی كوردا تووشی هەرەس دەكردو زوڵم و زۆریان.

**خشتەیەکی تایبەتی مەفرەزەکانی جاشی سەر بە مەنزومەی ئیستخباراتی شەرقی**

| | ناوەندی ئیستخبارات | ژمارەی مەفرەزە | هێزی مەفرەزە پیش زیادکردنی چەکدارە تازەکان | هێزی مەفرەزە پاش زیادبونی چەکدارە نویٚ کان |
|---|---|---|---|---|
| 1 | هەولێر | 5 | 177 | 250 |
| 2 | دهۆك | 4 | 109 | 180 |
| 3 | زاخۆ | 4 | 75 | 139 |
| 4 | دیانا | 2 | 91 | 150 |
| 5 | پێنجوێن | 2 | 61 | 120 |
| 6 | هەڵەبجە | 2 | 76 | 169 |
| 7 | قەلادزیٚ | 8 | 266 | 459 |
| 8 | سلێمانی | 8 | 172 | 328 |
| 9 | چۆمان | 1 | 11 | 31 |
| 10 | بارەگای مەنزوومە | 6 | 145 | 300 |
| | | 45 | 1192 | 2126 کۆی گشتی |

لەخەڵکی خاوەن هەڵوێستی شارەکانو دانیشتوانی گوندەکان دەکرد لە ڕەش بگیری ناو شارەکانو کێو ماڵی شاخو ئەشکەوتەکان لە دوای ئەنفالدا بەتایبەتی چەکدارانی (مەفرەزەی تایبەتی) کە باوەڕپێکراوی ڕژێم بوونو لەخەڵکە نەفس نزموبەد ڕەوشتەکانی کۆمەڵی کوردەواری پێك هاتبوونوزۆر بەیان لەوانە بوون کە تاوانی کۆمەلایەتیان بەدواوە بوو. ئەنفالیش ئەو تاوانە گەورەیە بوو کە جاشەکان تیایدا گەیشتنە لوتکەی لادان لە بنەماکانی نیشتمانپەروەر کە هاوکارو بەشداربوون لەو تاوانەی ئەم زیانا نەی خوارەوەی لیٚ کەوتەوە:

١- 78 گوند سووتێنرانو تەخت کران.

٢- شەش مەرکەزی ناحیە سوتانو وێران کران.

٣- 39178 سی و نۆ هەزارو سەدو حەفتاو هەشت خانوو سوتا.

٤- 45777 خێران ئاوارەو بێ سەرو شوێن کران.

٥- 381 سێ سەدو یەك خوێندنگا، 657 شەش سەدو پەنجاو حەوت مزگەوت، 69 شەستو نۆ نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی سوتێنران.

٦- 52 عەماری ماتۆڕی ئاو، 47 مەکینەی ئاش، 135 کارێزو ئەستێڵ تەقێنرانەوە.

٧- 1435 هەزارو چوار سەدو سی و پێنج باخ سوتێنران.

٨- 17220 حەڤدە هەزارو دووسەدو بیست تراکتۆرو مەکینەی جۆراو جۆر سوتێنران.

٩- 472770 چوار سەدو حەفتا دوو هەزارو حەوت سەدو حەفتا سەر مەڕ تالاَن کران.

١٠- 15000 پانزە هەزار ڕەشە وولاَخ تالاَن کران.

١١- 570000 پێن سەدو حەفتا تەن گەنمو جۆ سوتێنران[4].

* یەکێك لە موستەشارەکان لەچاوپێکەوتنێکدا ووتبوی: ((کاری ئەنفالی دووەم خۆی کاری ئەنفالی یەکەم تەواو دەکاتو ئەمەش بۆتە مایەی سەربەرزی جەنگاوەرانی کورد (مەبەستی جاشەکانی خۆیانە) چونکە هاوبەشیەکی کاریگەرو لەجێبەجێکردنی ناوەڕۆکیدا کردووە)) بەندێکی یاسایی هەیە دەڵێت (داننان بەتاواندا شای بەڵگەکانە) تاوانبارانی کوردی ئەنفالیش لەچاو پێکەوتنەکانی ئەو کاتەی ڕۆژنامەکانی ڕژێمو لە کەناڵەکانو لە بروسکەکانیاندا بۆ سەدامو دیکۆمێنتەکانی تردا کەزۆر بەیان ماوونو نەفەوتاون دانیان بەتاوانەکانیاندا ناوەو ئەم دان پێدانانەی ئەمانەش زۆر لەوانە زیاترن کە عەلی کیمیاویو هاوڕێکانی پێ ئیدانە کراون(5) کە دیارە ساز کردنی ئامادەکاریەکانو سازدانی ئەوانەی کە تاوانبارن بۆ دادگای بالاَی تاوانەکان تەمووژی گومان لەسەر نەزاهەتی داد پەروەری لە عێراقی دوای سەدام دا ئەڕەوێنێتەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- جینۆساید لەعێراق/ میدڵ ئیست ووچ لاپەڕە (14).

٢- بەعسیزمو کورد – لاپەڕە 211 سۆزان کریم مستەفا).

٣- تونی مەرگ – زیاد عبدالرحمن – 1995.

٤- هەمان سەرچاوە.

٥- جاشو جینۆساید – محمود سەنگاو 2007.

# ئاستی خوێندن و باری تەندروستی خانەوادەی ئەنفالکراوانی چەمچەماڵ

شوان رەحیم کەریم

**پێشەکی:**

گومانی تێدانیە کە مەبەست لە پرۆسەی بەدناوی ئەنفال سڕینەوەی کورد و جینۆسایدی کورد بوون بە هەموو مانایەك. سەندنەوەی سەرجەم مافەکانی تاکی کورد بوون وەك مافە سیاسی و ئابووری و مافی ژیان و ئازادی و تێکدانی کۆمەڵگەی کوردی لە بواری ئابووری رۆشنبیری و کلتووری و سەرجەم بوارەکانی تری ژیان.

لە ماوەی دوو ساڵی کارکردنم لە ئەنفال لە (بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارە و ئەنفال لە چەمچەماڵ)، ئەوەی تێبینیم کرد نزمی ئاستی خوێندەواری و خراپی باری تەندروستی ئەندامانی خانەوادەی ئەنفالکراوان بوو. هەر بۆیە بۆ کەسێك کە لەو بوارەدا کار دەکات دەبێت بە پێی ئەو واقیعە کار بکات کە ئەوکەسانەی تیادا کۆ بووەتەوە، چونکە نزمی و نەبوونی خوێندەواری لای کەسەکان زۆرجار وادەکات کە بۆماوەیەکی درەنگ کارەکانیان راپەرێندرێت، بۆنمونە لە راپەراندنی مامەڵەکانیان و ئاڵۆزی و کەموکورتی لە مامەڵە یاساییەکانیاندا تەنانەت لە دۆزینەوەی ئەو دەزگایەشدا کە کاریان پێیەتی زۆر ئاستەمە، هەروەها ئەوەی تێبینیم کرد زۆری نەخۆش و پیرو پەککەوتە و وارسی کەم ئەندام بوو لە خانەوادەی ئەنفالکراواندا.

هەر ئەمەش وای لێکردم لە رێگەی ئەو زانیاریانەی لەو بەڕێوەبەرایەتیانەدا تۆمار کرابوون، توێژینەوەیەکی زانستی ئەنجام بدەم، ئەمەش بۆ گەیشتن بەراستی و سەلماندنی ئەو گریمانیانەی کە هەم بوو .

بۆیە بەباشی دەزانم کە تەنها دوو لایەنی ئەم توێژینەوەیە بخەمەروو ،

١- ئاستی خویندن.

٢- باری تەندروستی ئەندامانی بەجێماوی پرۆسەی ئەنفال.

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکرد، زانیارییەکانی ئەم توێژینەوەیە پشتی بەستووە بە ئامارێك كە لەلایەن ( بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی چەمچەماڵ- ئیدارەی پێشوو) تۆمار کراوە. تایبەت بە زانیاری دەربارەی (٢٠٧٥) خانەوادەی ئەنفال کراو لە سنووری قەزای چەمچەماڵ، کە ژمارەی ئەندامەکانیان (٧٦٧٥) کەسە.

هەر لەم ئامارەدا دەرکەوت کە ( ٦٧٪) خانەوادەی ئەنفالکراوان لە سنووری قەزای چەمچەماڵ ئێستا لە کۆمەڵگای شۆرش نیشتەجێن،

### یەکەم: باری تەندروستی ئەندامانی خانەوادەی ئەنفالکراوان:

واتا زانیاری دەربارەی کەسی پیرو پەککەوتەو کەمئەندام و نەخۆشی درێژخایەن کە لە خانەوادەی ئەنفالکراواندا هەیە بە پێی توێژینەوەکە دەردەکەوێت کە(٨٥٩) خانەوادە کەسانی (پیرو پەککەوتەو نەخۆش وکەمئەندام) تیایاندا هەیە . وەك لە خشتەی ژمارە یەکدا خراوەتە ڕوو:-

| جۆری ناتەندروستی | ژمارەی خیزانەکان | ریژەی سەدی |
|---|---|---|
| پەککەوتە | ٢٣٤ | ٢٤، ٢٧٪ |
| کەمئەندام | ١٩٨ | ٠٥، ٢٣٪ |
| نەخۆشی دریژخایەن | ٤٢٧ | ٧١، ٤٩٪ |
| کۆی گشتی | ٨٥٩ | ١٠٠٪ |

لە خشتەی ژمارە(١) وە دەردەکەوێت کە لە کۆی (٢٠٧٥) خانەوادە (٨٥٩) خانەوادەی ئەنفالکراوان کەسانی (پیرو پەککەوتە کەمئەندام و نەخۆشی دریژخایەن) یان هەیە. کە دەکاتە( ٤١٪) ی کۆی خێزانەکانی توێژینەوەکە. بە شێوەیەك کە ( ٢٣٤ خیزان کەدەکاتە ٢٤، ٢٧٪ی خیزانەکان کە کەسی پەکەوتەی تیادایە) و ( ١٩٨ خیزان کە دەکاتە ٠٥، ٢٣٪ ی کەسی کەمئەندامی تێدایە) و (٤٢٧) خێزان کە دەکاتە ٧١، ٤٩٪ ی خیزانەکان کەسی نەخۆشی دریژخایەنی تێدایە.

### دووەم: ئاستی خویندەواری ئەندامانی خانەوادەی ئەنفالکراوان

وەك لە پێشەکیدا ئاماژەمان بۆ کرد، مەبەست لە پرۆسەی ئەنفال جینۆسایدی گەلی کورد بوو، بۆ ئەمەش رژێم چەندەها رێگەی گرتە بەر، لە روخانی ژێرخانی ئابووری

کوردستان و بە تالانبردنی سەروەت و سامانی کوردستان و خەرجکردنی لە ئامرازی چەك و سەرفکردنی بۆ سوپاو دیسانەوە بەکارهێنانی دژی گەلانی عێراق لە پێشیانەوە گەلی کورد، هەروەها تێکدانی بواری کۆمەڵایەتی ئەمەش بە چۆڵکردنی گوندەکانی ڕاگواستنیان بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکان و کە هیچ هۆیەکی ژیانی تێدا نەبووە. ئەمەش وای کرد پەشێوی و نالەبارییەکی زۆر ڕوو بکاتە گوندەکان لەسەرووی هەموویانەوە بواری خوێندن و پەروەردەکردن.

لە کاریگەرییە خراپەکانی ڕاگواستن یەکێکیان وازهێنان و دابڕانی خەڵکی گوندەکان بوو لە خوێندن.

وەکو ئاماژەمان پێ کرد ژمارەی ئەندامانی خانەوادەی پاشماوەی ئەنفال لە تویژینەوەکەدا ( ٧٦٧٥) کەسە. کە (٦٧٪) ی خانەوادەکانی ئەنفال لە سنووری قەزای چەمچەماڵ ئێستا نیشتەجێی کۆمەڵگای شۆڕشە. بۆ زیاتر زانیاری لە خشتەی ژمارە(٢) دا خوێندنی ئەندامانی خانەوادەی ئەنفالکراوان دەخەینە ڕوو:

| ئاستی خوێندن | ژمارەی ئەندام | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ٣٦٣٦ | ٣٧، ٤٧٪ |
| سەرەتایی | ١٦٣٥ | ٣٠، ٢١٪ |
| ناوەندی | ٢٠٠١ | ٠٧، ٢٦٪ |
| دواناوەندی | ٣١٣ | ٠٨، ٤٪ |
| پەیمانگا | ٥٦ | ٧٣، ٠٪ |
| زانکۆ | ٣٤ | ٤٥، ٠٪ |
| کۆی گشتی | ٧٦٧٥ | ١٠٠٪ |

لە خشتەی ژمارە (٢) وە دەردەکەوێت کە بەڕێژەی (٣٧، ٤٧٪) ی ئەندامانی خانەوادەی ئەنفال نەخوێندەوارن و، بەریژەی ( ٣٠، ٢١٪) یان تەنها خوێندنی سەرەتاییان تەواو کرد ، ٠٧، ٢٦٪) یان خوێندنی ناوەندییان تەواو کردووە ( ٠٨، ٤٪) یان لە ئاستی خوێندنی ناوەندیدان (٧٣، ٠٪) لە ئاستی خوێندنی پەیمانگادان، (٤٥،٠٪) لە ئاستی خوێندنی زانکۆدان.

لەو خشتەیەوە دەردەکەوێت نزیکەی نیوەی ئەندامانی خانەوادەی پاشماوەی ئەنفالکراوان نەخوێندەوارن. هەروەها دەرکەوت کە بەرێژەی کەمتر لە سەدا یەکێ

ئەندامانی لە ئاستی خوێندنی پەیمانگاو زانکۆدان. هەر ئەمەشە کە وای کردووە کە پرسی ( ئەنفال لە ئاستی دەرەوەو لە ئاستی ناوخۆی عێراقیشدا نەتواندراوە بە ئەندازەی گەورەیی و ترسناکی کارەساتەکە بناسرێت.

**سێهەم: راسپاردە**

لە دەرئەنجامی هەردوو خشتەی ژمارە(١، ٢) وە دەرکەوت کە ژمارەیەکی زۆری کەسوکاری ئەنفالکراوان کە زۆربەیان لە کۆمەڵگەی شۆرش نیشتەجێن، بە دەست نەخۆشی و کەمئەندامی و پەککەوتەییەوە دەناڵێنن و نزیکەی نیوەیان نەخوێندەوارن. هەربۆیە پێوستە حکومەتی هەرێم زۆربەی خزمەتگوزارییەکانی خۆی لەم ناوچەیەدا بخاتە کار. بە تایبەتی خزمەتگوزاری تەندروستی و خانەی بە ساڵاچووان و دروستکردنی قوتابخانەو بەتایبەتی کردنەوەی خولی خوێندەواری بۆ نەخوێندەواران و ئەو کەسانەی بە هۆی ئەو پرۆسەیەوە دابڕاون لە خوێندن، چیتر حکومەتی هەرێم بیر لەروخاندنی ئەو کۆمەڵگە زۆرە ملێیانە نەکاتەوە، باشترە بیر لە خزمەتگوزارییەکان بکاتەوە لەو شوێنانەدا و پیلانێکی تۆکمەو پەلەو گشتگیری هەبێت.

هەروەها پێویستە هەموو دەزگاو فەرمانگە حکومییەکان رێز لە کەسوکاری ئەنفالکراوان بگرن چ لە زوو جێبەجێکردنی کارەکانیان و چ بە ئاسانکاری لە کارەکانیاندا.

وە پێویستە حکومەت ئاسانکاری بکات لە دامەزراندنی کوڕو کچ و خوشك و برا ئەنفالکراوان لە دەزگاکانی حکومەتدا. ئاسانکاری بکات بە گەرانەوەی دابڕاوان لە خوێندن بۆ قوتابخانە

# د. مارف عومەر گوڵ:
# ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەنفال بەدۆکۆمێنت بکەین ئەوا بەرپرسیار دەبین بەرامبەر بە مێژوو

**چاوپێکەوتن: عەرعەر**

لەدوو دادگایی باوەڕپێکراودا ئەنفال و هەڵەبجە وەکو جینۆساید دانی یاسایی پێدا نراوەو لەگەڵ ئەوەشدا چەندین کۆمپانیاو دەوڵەوتی بیانی ناویان لەو دادگایانەدا هێنراوە، بۆ زانینی گرنگی ئەم سەلماندنەو ئەرکی کورد خۆی لە بەجیهان ناساندنی دۆزی جینۆسایدی و کارکردن بۆ ئەوەی دۆسیەکانی تری لەناوبردن و سرینەوەی کورد بچێتە دادگاو بەزانستیکردنی جینۆسایدی کورد لەناوەندە زانستیەکاندا ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ دکتۆر مارف عومەر گوڵ سازکرد کرد.

**عەرعەر: لە کتێبەکاندا ئەوەت سەلماندووە ئەنفال و هەڵەبجە بەشێکە لە جینۆسایدی گەلی کورد، لەگەڵ ئەوەشدا داگای باڵای تاوانەکان لە عیراق ئەنفالی وەکو جینۆساید سەلماند، ئایا کورد گرنگی بەم باسە داوە هێندەی قورسایی کارەساتەکان و گرنگی سەلماندنەکان؟**

د.مارف عومەر گوڵ: بەڵی من رام وایە لە پێش ئەنفالیشدا ئەو تاوانانەی دەکران ئەو تاوانانەی کەلە کورد دەکران جینۆساید بوون بەلام شێوازی ئەنجامدانی هێرشەکانی ئەنفال و قەبارەی تاوانەکان هێندە گەورەو ترسناك بوون هێندە بەربڵاو و گشتی بوون دەتوانین پێی بڵێن لوتکەی تاوانەکانی رژێمی بەعس لە دژی کورد، بۆیە من وای ناو دەنێم سیاسەتی جینۆساید لە عێراقدا دژی کورد کە تاوانی جینۆسایدی لێکەوتەوە، دەربارەی ئەوەی کە دادگاری باڵای تاوانەکان لە عێراق ئەنفالی وەکو جینۆساید ناساند ئەمە بۆ خۆی سەرکەوتن بوو بۆ کوردو بڕیارێکی گرنگیش بوو لە مێژووی عێراق بە گشتی و مێژووی کورد بە تایبەتی، هەروەها بۆ دنیاش گرینگ بوو چونکە بە یاسای ناوخۆیی هەر ئەو وڵاتەی کە تاوانەکەی تێدا ئەنجامدراوە سەلمێندرا، بەلام بۆ ئەوەی کە ئەو دادگایە تەنها باسی لە ئەنفال کردووە ئەوە لەبەر ئەوەیە تەنها کەیسی ئەنفال

لەبەر دەستدا بووە هیچ کەیسێکی پێشووتری نەخراوەتە بەردەست چونکە شێوازی بەرنامە رێژکراوی تاوانەکانی ئەنفالەکان هێندە ریزبەندو بەیەکەوە گرێدراوە سەلماندی لەرووی یاساییەوە لەبارتر و گونجاوترە، گرنگ ئەوە بوو ئەو بڕیارە دەرچوو لەراستیدا بۆ ئەوەی کە ئایا کورد هێندەی قەبارەی کارەساتەکان گرنگی بەو مەسەلەیەداوە دەتوانین بڵێن نەخێر بەڵام هۆکاری خۆی هەیە لە سەر ئاستی ناوخۆی وڵات و لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و هەروەها لەسەر ئاستی کورد خۆی.

**عەرعەر: پاش تێپەڕبوونی ٢٠ ساڵ و لەسەر ئاستی جیهانی و بەشێوەیەکی بەربڵاو جینۆسایدی گەلی کورد نەناسێنراوە، پێویستە چی بکرێت بۆ بە جیهانی کردنی جینۆسایدی گەلی کورد، گرنگی بە جیهانی ناساندنی جینۆساید چیە؟**

د.مارف عومەر گوڵ: دەتواندرێت گەلێك کاری گرنگ ئەنجام بدرێت لە دونیادا بۆ ناساندنی جینۆسایدی کورد، تاکو ئێستا چەند هەوڵێك لەناوخۆو دەرەوەی وڵات دراوە، بەڵام ئەو هەوڵانە سەرەتای کارەکەن، بۆیە ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە لەسەر ئاستی جیهانی و لەوڵاتانو لەپەرلەمانەکانی وڵاتانو لەمیدیای وڵاتانداو لەرێکخراوە گرنگ و بایەخدارەکاندا کاربکرێت تاکو بەحکومەتەکانی وڵاتانو بەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بسەلمیندرێت کەتاوانی جینۆساید لەعێراقدا بەرامبەر بەکورد ئەنجام دراوە، بەتایبەتی دوو بڕیاری دادگا پاڵپشتی یاسایی ئەو هەوڵەن، یەکەمیان بریاری دادگای شاری لاهای کە حکومی زیندانی کردنی (فرانس ڤان ئانرات)ی دەرکرد کە ئەو کەسەی کمیایی و کەرەستاکانی کیمیاوی بەعێراق و لەکمیابارانکردنی کورد بەکار هاتوون، دووەم بڕیاریش بریار دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراقدا بوو، ئەم دوو بڕیارە گرنگی زۆریان هەیە لەگەڵ سەرجەم ئەو بەڵگە نامانەدا کە لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوەکانی تری مافی مرۆڤ لە جیهان دا بڵاو کراونەتەوە، بەشێکی دیارن لەبەڵگەی جینۆساید دژی کورد.

زۆر گرنگە لەجیهاندا بڕیار لەسەر ئەوە بدرێت کە کورد جینۆساید کراوە چونکە مەسەلەی کورد لەسەر ئاستێکی جیهانی سەیر دەکرێت و وەکو یەکێك لە میللەتە غەدرلێکراوەکانی مێژووش تۆمار دەکرێ، کەئەمەش دەبێتە زەمینەی یاسایی و سیاسی و دیبلۆماسی لەچارەسەری داهاتووی مەسەلەی کورددا، نەك تەنها لەئێراقدا بەڵکو لە بەشەکانی تری کوردستانیشدا. دیارە ئەو چارەسەرکردنە هەمەلایەنەیە، چ وەك

قەرەبووکردنەوە یان وەك بەرنامەی پێشخستن و پەرەپێدان یان وەك دیاری کردنی چارەنووسی کورد و بەدەستهێنانی پشتگیریەکی نێو دەوڵەتی بۆ ئێستا و داهاتوش.

**عەرعەر: سیاسەت و سیاسەتمەدارانی کوردستان تاچەند درکیان بە گەورەیی و گرنگی کارەساتەکە کردووە؟ ئایە توانراوە جینۆسایدی گەلی کورد بۆ ئاسایشی نیشتمانی کوردستان بە کار بهێندرێت بەڕای ئێوە چی بکرێت لەو بارەیەوە؟**

د.مارف عومەر گوڵ: بەراستی زۆر گرنگە ئێمە خۆمان وەکو کورد مەترسی تاوانی جینۆساید بە هەند وەربگرن، چونکە ئەو پێزانینە ئەرکێکی ترمان بۆ دروست دەکات، ئەویش بۆ ئاسایشی نیشتمانی کوردستانو بۆ سەر جەم داهاتوومان بایەخی زۆری هەیە هەم بۆ پشتگیری نێودەوڵەتیو هەم بۆ نەوەکانی داهاتووی خۆمانو مرۆڤایەتی، کە ئێمە دەبینە یەکێك لەدەرسەکانی مێژوو. دەشتوانرێت زۆر کاری گرنگ بکرێت بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە هەلومەرجی لەبار بۆ کورد دروست بووە لە ناوخۆ و لە دەرەوەش لەسەر ئاستێکی جیهانی.

**عەرعەر: ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورد هێشتا نەبوەتە بابەتێکی زانستی لە ناوەندە زانستیەکاندا، پێویستە چی بکرێت بۆ ئەوەی جینۆسایدی گەلی کورد لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا ببێت بە بابەتێکی زانستی و کادری ئەکادیمی لەو بوارەدا دروست ببێت؟**

د.مارف عومەر گوڵ: پێویستە مێژووی جینۆساید بە گشتی بخوێنرێت، لە جیهاندا ئەو شێوازانەی جینۆساید چی بوونە کە ئەنجام دراون لە دژی مرۆڤایەتی، ئەو شوێن و وڵاتانە کوێن؟ بەراورد لە نێوان تاوانەکاندا، شێوازی ئەنجامدانی تاوانەکان لە دژی کورد و لە دژی گروپ و لایەنەکانی تری دنیا چۆن بوونە؟ خاڵی لەیەکچوون و جیاوازیان چی بووە؟ هەروەها پەرەپێدانی چەمك و جۆر و شێوازەکانی جینۆساید لە دنیادا بۆ ئەوەی بە حوکمی ئەو تاوانانەی کە ئەنجامدراون لێکۆڵینەوە و مانا و شیکردنەوەی تازە پەیدا بن بۆ بابەتەکە.

بە راستی ئەمە کارێکی گرنگ و گەورەیە کە ئیشکردنێکی بەردەوامی دەوێت لەسەر چەند ئاستێکی جیاواز و جیاجیادا.

**عەرعەر: بۆچی هێشتا کورد نەیتوانیوە ناوەندێکی زانیاری تۆکمە لەدۆکۆمێنتکردنی بەسەرهاتی ئەنفالکراوەکان و رزگاربووەکانی ئەو پەلامارە دروست بکات، کە بۆ رەوایەتیدانی جینۆسایدی کورد لە داهاتوودا پێویستە؟ پێویستە چی بکرێت بۆ ئەم کارە و گرنگیەکەی لە چیدایە؟**

د.مارف عومەر گول: کورد نەیتوانیوە، بەڵام ئەگەر کار بکات لەمەودوا دەتوانێت، ئێستا کاتێکی زۆر لەبارو گونجاوەو دەرگاکراوەیە بۆ ئەو کارە، ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەنفال بە دۆکۆمێنت بکەین ئەوا بەرپرسیار دەبین بەرامبەر بە مێژوو.

**عەرعەر: بەشێك لە دەوڵەت و کۆمپانیا بیانییەکان هاوکاری بەعس و دەوڵەتی عێراق بوون لە جینوسایدکردنی گەلی کورددا، ئایا کورد چۆن ئەتوانێت بیانداتە دادگاو سودی مادیو مەعنەوییان بۆ گەلی کورد هەبێت؟**

د.مارف عومەر گول: ڕاستە ژمارەیەك کۆمپانیا بەشدارن لەتاوانەکانی بەعسدا دژی گەلی کورد، هەروەها دەوڵەتیش هەن بەجۆرێك لەجۆرەکان بەشدارن، بەڵام بۆ ریسواکردنو دادگایی کردنیان کاری زۆر و هەڵی بەردەوامی ئەوێت، ڕەنگە ئاسانتر بێت کۆمپانیاکان ریسوابکرێنو بدرێنە دادگا، خۆش بەختانە ئێستا قسە لەسەر ئەم لایەنەدەکرێت، پێویستە کورد خۆی فشار بخاتە سەر عێراق بۆ ئەوەی عێراق بتوانێت وەکو دەوڵەتێك لەسەر ئاستێکی جیهانیو نێودەوڵەتی کار بکات، بەتایبەتیش ئێستا کورد بەشێکی گرنگە لە دەسەڵاتی ڕەسمی و یاسایی دەوڵەتی عێراق.

**عەرعەر: هەندێك دۆسیەی وەكو هەڵەبجە و تەعریبو ڕاگواستنو ڕەشەکوژی لە ڕاپەریندا سەرانی حیزبی بەعسی لە سەر نەدراوەتە دادگاو دادگا وەکو جینۆساید نەیسەلماندوە، بەڕای ئێوە ئەو ڕێگایانە چین بۆ گرتنە بەری ئەم کارە؟**

د.مارف عومەر گول: لەدوای پرۆسەی ئەنفال چەند دۆسیەیەکی تر ماون کە کاریان لەسەر کراوە بۆ دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراقدا، وەکو دۆسیەی بەرزانیەکان و دۆسیەی کیمابارانی هەڵەبجە، لە داهاتووشدا ئەو دادگایی کردنانەش ئەنجام دەدرێن. ئەتوانرێت کار بکرێت بۆ دۆسیەکانی تر و ڕێگا بۆ ئەمانەش زۆرە.

# ئـەنـفال و راگـەیاندن

چاوپێکەوتن: عەرعەر





**عەرعەر: لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بەعس چی بوو لەپڕۆسەی ئەنفالدا؟**

عارف قوربانی: لەپێش پرۆسەی ئەنفال و سەرجەم ئەو شەڕ و شۆڕانەی عێراق کردوونی لەدژی کورد و ئێران و لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفال و دواتریشدا لە داگیرکردنی کوێت و جەنگی عیراق و هاوپەیمانان تا روخانی بەعس، راگەیاندنی بەعس وەك کۆی دام ودەزگا دەوڵەتییەکانی تری عێراق لە خزمەتی سیاسەتەکانی بەعسدابوون، بێگومان لەکاتی شەڕە ناڕەواکانیدا زیاتر پێویستی بە راگەیاندن هەبووە بۆ چەواشەکردنی رای گشتیو ناوخۆی عیراقیش.! بەتایبەتیش لەکاتی پەلامارە وەحشیگەرییەکانیدا لەپرۆسەی ئەنفال دەزگاکانی راگەیاندنی بەعس و کەناڵەکانی راگەیاندنی حکومەت و رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن هەمویان خرابوونە خزمەتی ئەو پرۆسە ترسناکەوە، بە دوو شێوە رۆڵی دیاریان بینیووە، یەکەمیان بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکانی خۆیان بەگەورەکردنەوە و بایەخ پێدانیان لە سەرکەوتنەکانیاندا، لە هەمانکاتدا ناشرین و کەمبایەخ و بچوك نیشاندانی ئەو خەڵك و ناوچە دیاریکراوانەی ئامانجی پەلامارەکان بوون، ناوبردنیان بە دوژمن وکرێ گرتەی ئێران و خاك و خۆفرۆش و سەدان ناوو ناتۆرەی تر، بۆ ئەوەی لە رووی نەفسیەوە سوپا دڕندەکەیان ئامادەی پەلامارین و هیچ

سۆز و بەزەییەکیان نەبێ لەبەرانبەر بەرکەوتووانی پەلامارەکان، بۆیە دەبینی لە کاتی پرۆسەی ئەنفالدا دەیان هەزار ژن ومناڵ و پیرو پەکەوتە و خەڵکی بێگوناهیان کردە ئامانج و بەو پەڕی دڵ ڕەقییەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردوون، بێ ئەوەی هیچ سەربازێك سۆز و بەزەیی بە ژن و مناڵدا بێتەوە. لەکاتێکدا دیمەنی سەرنج ڕاکێش و هەست بزوێنی وا لەپرۆسەی ئەنفالدا ڕویانداوە تەنها لە گێڕانەوەیاندا مرۆڤ ناتوانێ سەرسام نەبێ، ئەی چ جای ئەوەی بەبەرچاوتەوە ڕووبدەن.! بەڵام دەبینی دڕندەی و دڵ ڕەقی ئەوان لەئاستێکدا بووە ئەنجام دانی ئەو تاوانانەیان بە پێویست و کاری گرنگ زانیووە، ئەم ئامادەگی دڕندایەتییە ڕاگەیاندنی بەعس ڕۆڵی گەورەی لەبەرهەم هێنانیدا هەبووە.

لایەنی دووەمی ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بەعس لەئەنفالدا بە دیوێکدا کاریان لەسەر ڕوخاندنی ورەی پێشمەرگەو هاوڵاتیانی کوردستان دەکرد بۆ ئەوەی بێ هیچ بەرگرییەك خۆیان بەدەستەوە بدەن و زوو تێکبشکێن. دەبینی بە ئاشکرا پەلامارە سەربازییەکان و گوندروخان و دەستگیرکردنەکانیان لە تەلەفزیۆنەکانەوە بڵاودەکردەوە بۆ ئەوەی خەڵکی زیاتر بترسێنن و ئاسانتر سەرکەون لە ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفالدا.!

**عەرعەر: ڕۆڵی ڕاگەیاندنی حیزبە کوردییەکان لە شاخدا چی بوو لە پیشاندانی ڕووە ڕاستەقینەکەی ئەنفال؟**

عارف قوربانی: بەداخەوە کە لەو کاتانەدا کورد خاوەنی ڕاگەیاندنێکی وانەبوو کە بتوانێ ئەو مەینەتیانەی بەسەریدا هاتن هەم تۆماریان بکات و هەم بیانگەیەنێتە ڕای گشتی جیهان، ئەوەی هەبوو ڕاگەیاندنی حیزبەکان بوو لەشاخ کە خۆیان ئامانجی پەلامارەکان بوون و پرۆسەکەش ئەوەندە بەچڕی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە هیچ ئامرازێکی ڕاگەیاندن نەیتوانی ڕۆڵ لە گواستنەوەیدا ببینێ، تەنها کارەساتی هەڵەبجە لەلایەن وێنەگرانی ئێرانی و ڕۆژنامەنوسێکی تورکەوە چەند دیمەنێکی تۆمارکران و چ لەکاتی خۆیدا و بۆ ئێستا و ئایندەیش کاریگەریان دەبێت. ڕاگەیاندنی حیزبەکان ڕادیۆ و ڕۆژنامە هەبوون بەڵام وەك پێویست نەیانتوانی دونیا لەو پەلامارانە ئاگاداربکەنەوە، کە ئەوەش بەشێکی بەهۆی ئەوەوەبوو کە زۆربەی وڵاتە دەسەڵاتدارەکان و زلهێزەکان بەرگریان لەعێراق دەکرد لە جەنگی دژی ئێران دا و ئەوەش هۆکارێك بوو کە چاوپۆشییەکی زۆر لە عێراق دەکرا، هۆکارێکیتریش کە میدیای جیهانی نەیانتوانی ئەو مەینەتییانە ببینن ئەوەبوو کە وڵاتانی ئیقلیم ڕێگربوون لەوەی دەرگای سنورەکانیان

والآبکەن بۆ ئەوەی راگەیاندنەکان بگەنە ناو جەرگەی روداوەکان و ئەوەی رویدا بیگویزنەوە بۆ جیهان.

**عەرعەر: لەدوای ڕاپەڕین کورد توانی زۆر لە دەزگاکانی دەوڵەت خۆماڵی بکات یەکێ لەوانە ڕاگەیاندن بوو،ئایا ڕاگەیاندنی کوردی لەدوای ڕاپەڕین چ ڕۆڵێکی هەبوو لەچارەسەرکردن و پیشاندانی ڕەهەندە ئابوری و کلتوری و کۆمەلأیەتی و سایکۆلۆژیەکانی ئەنفالدا؟**

عارف قوربانی: دوای راپەڕین و کرانەوەی جیهان بەڕووی کورددا بواری ئەوەی رەخساند کورد گەشەکردنێکی خێرا بەخۆیەوە ببینێ، لەناو ئەو گەشەکردن و پێشکەوتنانەدا راگەیاندن لایەنێکی دیار و بەرچاوە. سەرباری ئابلۆقەی ئابوری و ململانێی ولأتانی دراوسێ و شەڕی ناوخۆ و گرفتەکانیتر، بەلأم دەبینی کورد خاوەن چەندین دامەزراوەی ئیعلامییە لەکوردستاندا جا چی حیزبی بن یان ئەهلی. بەلأم بەشێوەیەکی گشتی ئێستا کورد خاوەنی میدیای خۆیەتی. لە سەرجەم ئەو راگەیاندنانەشدا بەشێوەیەکی تەقلیدی کار کراوە، بەلأم بەشێوەیەکی گشتی کورد لە ئاستی خوێندنەوەی ئەنفال و رەهەندەکانیدا سست بووە. چی لەسەر ئاستی ناوخۆ و چی لە دونیای دەرەوەی خۆیدا، ئەوەی تائێستا کراوە لەئاستی گەورەی کارەساتەکەو لێکەوتەکانی بۆ ئێستاو ئایندەدا نەبووە و نەمانتوانیووە لەنیشاندانداندا وێنەیەکی واقیعی بکێشین و لەچارەسەرکردنی رەهەندە ئابوری و کۆمەلأیەتی و دەروونی و سایکۆلۆژییەکانیدا هیچ هەنگاوێکمان نەناوە، نە راگەیاندن توانیویێتی ئەو رۆڵە لەسەر قوربانیانی کارەساتەکە بگێڕێت و نە توانیویشێتی لە سەر ئیدارەو دەسەلأتی کوردی فشارێکی وا دروستبکات کە بەپلان و هەنگاوی ورد کار لەسەر ئەو لایەنانە بکرێت، نەتوانراوە لە رووی پەروەردەییەوە پلانێکمان هەبێ. کە کاریگەرییەکانیان بۆ ئێستاو داهاتوو هیچی وای لە خودی کارەساتەکە کەمتر نابێ.!

**عەرعەر: ڕاگەیاندنی ئازاد چ ڕۆڵێکی هەبووە لەو بەشانەدا؟**

عارف قوربانی: لەوەلأمی پرسیاری پێشومدا بەشێوەیەکی گشتی قسەم لەسەر راگەیاندنکرد ئازاد و نا ئازاد، کە باوەڕم وایە میدیای حیزبی کاری باشتری کردبێ لەو رووەوە وەك لە میدیای ئازاد.

**عەرعەر: پێت وایە ولأتانی جیهان و ولأتە دراوسێکانیش دەرئە نجامەکانی ئەنفالیان وەك خۆی کە هەیە لە ڕاگەیاندنەکانیانەوە پیشان داوە؟**

عارف قوربانی: بێگومان نەخێر، کاتی خۆی ئێران وەك چەكێك لەدژی عێراق و بۆ ئەوەی قەناعەت بە کۆمەڵی نێودەوڵەتی بهێنێ هەندێك لە دیمەنەکانی هەڵەبجەی گواستەوە بۆ نێو میدیا، کە باوەڕم وایە ئێران زۆر دیمەنی تۆمارکراوی زیاتری لایە لەوەی نیشانیداوە تائێستا و بەدڵنیایشەوە کاتی خۆی لە سەردەمی ئەنفالدا ئەمریکا لە ڕێگەی وێنەی سەتەلایتەوە ئاگاداری ورد و درشتی ئەنفال بووە. کاتی خۆی و ئێستاش وێنەی ڕووداوەکان وەك پێویست ناخەنە بەردەست، ئیتر چ جای ئەوەی بێن دەرئەنجامەکانی ئەنفال بگوێزنەوە بۆ جهان، کە ئەمەیان من پێم وایە ئەرکی کورد خۆیەتی ئەوەبکات، ئێستا خاوەنی چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنین و ڕۆژنامەو ورادیۆ و سەتەلایت و سایتی ئەلیکترۆنییە، سینەماو شانۆ و دارو بەردمان هەیە، بۆیە پێویستە کورد خۆی بەزمانە زیندووەکانی جیهان کار لەسەر ئەنفال بکات، کە جێگەی داخە تائێستا وەك پێویست نەکراوە. بەشێوەیەکی ئەوەندە ترسناك فەرامۆشکراوە ڕەنگە هێشتا زۆربەی جیهانی ئەنفالی هەر نەبیستبێ، لەم ڕۆژانەی ڕابردوو سەرۆکی پەرلەمانی تونس لە کاتی کۆنگرەی وڵاتانی عەرەب لەهەولێر ئەڵێ بۆ یەکەمجارە وشەی ئەنفال دەبیستم. عەرەب نەیبیستبێ ئەی خەڵکیتر و جیهان هەمووی چۆن دەیزانێ، ئەمەیان کورد کەمتەرخەمە لەئاستیدا.

**عەرعەر: لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بەعس چی بوو لەپرۆسەی ئەنفالدا؟**

هەڤاڵ ئەبوبەکر: ڕاگەیاندنی بەعس، لە هەوڵی بەسەرکەوتن باسکردنی ئەو کارەساتە گەورانەدابوو، بەڵام بابەتەکانی ناو میدیای ئەو سەردەمەو بەتایبەتیش بواری نووسراوو چاپکراوەکانی بوونە بەڵگەنامەی زیندوو بۆ ئەمڕۆ، لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا ناوو کەس‌و پلەو پایەو پۆست‌و شوێن‌و کات‌و فەرماندەو هێزو سەرۆکجاش‌و مەفرەزەی تایبەت‌و وێنەیان تۆمارکراون، کە دەشێت بۆ نەتەوەیەك کە مێژوو بخوێنێتەوە سودی یاسایی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی گەورەیان هەبێت.

**عەرعەر: ڕۆڵی ڕاگەیاندنی حیزبە کوردییەکان لە شاخدا چی بوو لە پیشاندانی ڕووە ڕاستەقینەکەی ئەنفال؟**

هەڤاڵ ئەبوبەکر: حیزبە کوردییەکان خۆیان بەشێکی گەورەی قوربانییەکان بوون، نەك ڕاگەیاندنی حیزبەکان لەناوەوەو لەناو ڕوداوەکانەوە کزو نەبووبوون،

بەڵکو لەدەرەوەیش هەر کزبوون، چونکە نە تەکنیکی میدیا تەکنیکی ئەمڕۆ بوو، نە بیری بەڵگەنامەیی و زانیاریی کۆکردنەوەی کورد وەك پێویست بوو، نە وڵاتانیش دانیان بە قوربانییەکانماندا دەنا، میدیای بەعس سەرچاوەی زاڵی ڕووداوەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەند پێشمەرگەیەکی بەئەزموون توانیان بەشێك لەو ڕووداوانە تۆماربکەن و ببنە سامانی میدیایی روداوەکان بۆ ئەمڕۆمان، بەڵام ژمارەی ئەوانە لەپەنجەکانی دەستێك تێنەدەپەڕین و سەختی ڕۆژگارەکەیش بواری نەدەدا بچنە هەموو جێگایەك.

**عەرعەر: لەدوای ڕاپەڕین کورد توانی زۆر لە دەزگاکانی دەوڵەت خۆماڵی بکات یەکێ لەوانە ڕاگەیاندن بوو،ئایا ڕاگەیاندنی کوردی لەدوای ڕاپەڕین چ ڕۆڵێکی هەبوو لە چارەسەرکردن و پیشاندانی ڕەهەندە ئابوری و کلتوری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیەکانی ئەنفالدا؟**

هەڤاڵ ئەبوبەکر: راگەیاندنی کوردیی راگەیاندنی تەشریفات و موناسەباتە، نەیتوانیوە بەکارکردنێکی کەڵەکەکردن کەدواجار کاریگەریی کەڵەکەبووانە بەرهەم دەهێنێت کاربکات، ئەو کارەساتانە ئەوەندەی وەك بۆنەیەکیان لێکراوە کەمتر وەك قۆناغێکی سیاسیی و خەباتگێڕیی لەلایەك و وەك جینۆسایدێکی گەورەی جنسی بەشەریی لە دنیادا وێنا بکرێن، ساڵ هەبووە لە ساڵانی پاش راپەڕیندا بە بڕیاری سیاسیی کورد خۆی یادکردنەوەکەش قەدەغەکراوە و لە میدیای ئەو رۆژگارانەدا هیچی لەسەر نەوتراوە.

**عەرعەر: ڕاگەیاندنی ئازاد چ ڕۆڵێکی هەبووە لەو بەشانەدا؟**

هەڤاڵ ئەبوبەکر: راگەیاندنی ئەهلی، هەوڵی داوە ئیش بکات، بەڵام کەمتر بە بەرنامەو بە هەڵمەتی درێژخایەن ئیشی کردووە، موعاناتی کەس و کاری ئەنفالکراوەکانیان تا ڕادەیەك دەرخستووە، فایلی هەندێکیان بڵاوکردۆتەوەو چاویشیان لە زۆریان پۆشیووە، دەبوو ئەنفال ئامادەیی رۆژانەی لە میدیاکانی کوردستاندا هەبووایە نەك ساڵانە، دەبوو کەیسەکان بۆ خزمەتی ئەنفال بوونایە نەك بۆ ئەو گیانی تەکەتولبازیی و پەرتبوونە سیاسییانەی کە میدیای ئەهلیشیان تا ماوەیەکی زۆر بە فایلی ئەنفالچییەکانیشەوە کردبووە ئامرازێك بۆ خۆیان.

**عەرعەر: پێت وایە وڵاتانی جیهان و وڵاتە دراوسێکانیش دەرئەنجامەکانی ئەنفالیان وەك خۆی کە هەیە لە ڕاگەیاندنەکانیانەوە پیشان داوە؟**

هەڤاڵ ئەبوبەکر: کە کورد خۆی ئەمەی نەکردبێت، خەڵك بۆ بیکات؟ ئەوەی کراوە رێکخراوە مرۆییەکانی وەك میدڵ ئێست وۆچ و هەندێك ناوەندو کەسایەتیی مرۆڤدۆست کردوویانە، نەك وڵاتان، بەڵام دواجار توانرا دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق ڕژێمی بەعسی پێ تاوانباربکرێت و دادگا لەگەڵ ئەوەی بەقەد قورسایی تاوانەکانی ئەنفال حسابی بۆ تاوانباران نەکردو بەو لە سێدارەدانەی سەدام حسێنی تاوانبار، ئەنفالی خستە پەراوێزەوەو ئێستایش موساوەمەیش لە سەر تاوانبارانی تر دەکرێت، کورد بۆ خۆیشی لە سوککردنی تاوانی کۆڵی تاوانباری ئەنفالدا بەجۆرێك لە جۆرەکان بەشدارە.

# گۆران بابا عەلی:
## نازانم بەخشینی تەنها پارچە زەویەك بە تەنها یەك كەسی بەجێماوی قوربانیەكی كوژراوی ئەنفال چی لە ژیانی ئەنفالكراوان دەگۆڕێت



**چاوپێكەوتن: عەرعەر**

پەلاماری ئەنفال سەرەرایی لەناوبردنی خوودی مرۆڤی كورد چەندان كەناڵی تری سەرچاوەی ژیانی لەگەڵ خۆیدا تەفروتوناكرد و كێشەگەلێكی كۆمەلأیەتی و ئابووری و دەروونی و سیاسی لەدوای خۆیی جێهێلأ، بۆ قسەكردن لەسەر ئەمە و ناسینی گەورەیی كارەساتی ئەنفال لای كورد خۆی و سوود وەرگرتنی سیاسیانەی كورد بۆ دۆزە جینۆسایدیەكەیی ئەم چاوپێكەوتنەمان لەگەڵ گۆران بابا عەلی سازكرد.

**عەرعەر: ئەمساڵ بیستەمین ساڵیادی پەلامارەكانی ئەنفالە، لەو ماوەیەدا توانراوە ئەنفال وەكوو خۆی كە هەیە بناسرێت و كاری بۆ كرابێت؟**

گۆران بابا عەلی: نەخێر. بۆئەوەی وێنەیەكی تەواومان دەربارەی ئەنفال دەستبكەوێت، هێشتا زۆر شت ماوە بكرێت. پێوویستیەكی ئەوتۆ هەیە بۆ لێكۆڵینەوەی قوڵ لە لایەنە جیاوازەكانی ئەنفال وەك حاڵەتێكی جێنۆساید. راستە زۆر شت دەربارەی ئەنفال نوسراوە و بلأوكراوەتەوە. چەند لێكۆڵینەوەیەكی باشیش لەبەردەستدان. بەلأم پێوویستیەكی زۆر بە لێكۆڵینەوەی هەمەلایەنە و بەتایبەتی لێكۆڵینەوەی مەیدانی و ئەحسائی هەیە تا بكرێت ئەنفال وەك حاڵەتێكی جێنۆساید دۆكیومێنت بكرێت، بەشێوەیەك بكرێت لەلایەنی لێكۆڵەراوانی ترو كەسانو لایەنانێك كە گرنگی بەم مەسەلەیە دەدەن پشتی پێببەسترێت.

**عەرعەر: ئەنفال بە تەنها سرینەوە و لەناوبردنی مرۆڤ نەبوو بەڵکو بووە هۆی گۆرانێکی گەورەی کلتووری و ئابووری و کێشەگەلێکی کۆمەڵایەتی زۆری دروستکرد، ئەو ڕێگاچارەو میکانیزمانەی کوردو دەسەڵاتی کوردی گرتوویەتیە بەر، ئەتوانێت چارەسەری ئەو کێشانە بکات؟**

گۆران بابا عەلی: بەڕای من کارەساتی ئەنفال هیچ گۆڕانێکی کولتوریی ئەوتۆی لێنەکەوتۆتەوە. ئەگەر کولتوور لە مانا بەرتەسکەکەیدا سەیربکەین، کە هونەر و دەربڕینە هونەرییەکان دەگرێتەوە، ئەوا ئەنفال بۆتەهۆی بەرهەم هێنانی کۆمەڵێکی یەکجار زۆر لە بەرهەم و چالاکیی هونەری. بەواتایەکی تر پانتاییەکی تاڕادەیەك گەورەی لە کایە هونەرییەکاندا داگیرکردووە. ئەمەش حاڵەتێکە لەدوای هەر کارەساتێکی لەوشێوەیە دێتەئاراوە. ڕەنگدانەوەی کارەساتە مرۆییەکان لە هونەردا بۆخۆی کارەساتێك لەو بوارەدا دەخوڵقێنێت. (لێرەدا لەنێوان دوو قەوسدا دەڵێم: بەبڕوای من واباشترە کایە هونەرییەکان، واتە هونەرمەندان خۆیان، هەوڵبدەن لەو کاریگەرییانە رزگاریانببێت. هەستی بەرپرسیاری لە دەربڕین بەرامبەر کارەساتێکی وا گەر ببێتە هۆی شێواندنی بوارە هونەرییەکان، ئەوا خۆی کارەساتە).

لەڕاستیدا من نازانم تا چ ڕادەیەك ئەنفال، بۆنمونە بەهۆی وێرانکردن و چۆڵکردنی دێهاتەکانەوە، زیانی ئابووریی لێکەوتۆتەوە. گەر مەبەستمان لە ئابووری، ئابووریی نەتەوەیی بێت. بێگومان زیانێکی ئابووریی گەورەی لە خەڵکی لادێکان و ئەو کەسانە داوە کە بەر شاڵاوەکان کەوتوون. بەڵکو گەورەترین زەرەرمەند ئەوانن. بەڵام ئاخۆ لەناوبردنی بەشێکی گەورەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی چ زیانێکی لە ئابووریی کوردستان داوە، من ناتوانم بەدڵنیاییەوە دەستنیشانی بکەم. پێموایە ئەوەی تا ئێستا دەربارەی ئەم لایەنە دەگوترێت زیاتر دەربڕینی هەست و سۆزە و لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی زانستی بینانەکراوە، چەند لێکۆڵینەوەیەك نەبێت. بەبڕوای من ئەگەر ئەو لادێیانە بشمانایە، یان هەمووی ئاوەدانبکرانایەوە و دەستیانبکردایەتەوە بە کشتوکاڵ، هێندە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەدەبوو بۆسەر ئابووریی کوردستان، گەر سەرنجی بازاڕەکانی ئێستا بدەین. بەمانای ئەم کوشتوکاڵە ناوخۆییە نەیدەتوانی مونافەسەی بەروبوومە هاوردەکان بکات. ئەو کەسانەشی گەڕاونەتەوە لادێکانیان و خەریکی کشتوکاڵن قازانجێکی ئەوتۆ لە بەرهەمەکانیان ناکەن. بەڵکو گەر سادەترین حساب بکرێت بۆ ئەو کات و وزەیەی ئەوان لەساڵێکدا سەرفی دەکەن لەبەرامبەر ئەو داهاتەی

لەساڵێکدا هەیانە، ئەوا ڕەنگە بکرێت لەزۆربەی ناوچەکاندا، بەتایبەتی لە گەرمیان، وەك بەفیڕۆدانی کات و وزەیەکی مرۆیی سەیربیکەین، گەر باس لە بەفیڕۆدانی سەرمایەیەکی مرۆیی نەکەین. ڕەنگە بکرێت کشتوکاڵ لە کوردستان بکرێتە سەرچاوەیەکی ئابووریی گرنگ، گەر بە مێتۆدی زانستی و نوێ بەڕێوەبچێت، نەك بە مێتۆدە تەقلیدیەکان کە جوتیارانی کوردستان کاری پێدەکەن. کەواتە هەر هەوڵێك بۆ ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکان و گێڕانەوەی ڕزگاربووانی ئەنفال و کەسوکاری قوربانیان بۆ لادێکانیان، چ لەلایەنی حکومەت و چ لەلایەنی ڕێکخراوانەوە بدرێت، گەر بەووردی حساب بۆ ئەم لایەنە نەکەن، ئەوا بێسوودە و بەفیڕۆدانی سەرمایەیە.

هەرچی کێشە کۆمەڵایەتیەکانە، ئەوا دەکرێت بڵێین ئەنفال بۆتە هۆکاری چەندان کێشەی کۆمەڵایەتیی گەورە بۆ قوربانیان و ڕەنگە تاڕادەیەکیش بۆ سەرجەمی کۆمەڵگای کوردی. واتە گەورەترین زیانی ئەنفال، جگە لە لەناوبردنی هەزاران مرۆڤ، کاریگەرە کۆمەڵایەتی و دەروونیەکانێتی بۆ قوربانیە ڕزگاربووەکان و کەسوکاریان و هەروەها بۆ کەسوکاری قوربانیە کوژراوەکان. لێرەدا هەوڵدەدەم زۆر بەخێرایی باسی هەندێك لەم کاریگەریانە بکەم. بەگشتی ڕزگاربووانی ئەنفال تائێستاش لە ئۆردوگاکانی کۆکردنەوەدا (مجمعات) دەژیین. ئەمانە کاتێك لە زیندانەکان بەردران یان بەشێوەیەك لەشێوەکان ڕزگاریان بوو، بەزۆرەملێ نێردران بۆ ئەو ئۆردوگایانە و بەجێهێڵران بۆ ئەوەی بێ هیچ کۆمەکێك خۆیان ژیانیان دەستپێبکەنەوە. تائێستاش زۆربەی هەرەزۆریان لە ناهەموارترین بارودۆخدا دەژین. هەرکەسێك سەر لەو ئۆردوگایانە بدات و ڕۆژێك تیایدا بمێنێتەوە، دەبینێت ئەو خەڵکە لە چی بارنەیەکی داخراودا دەژین و چ شەڕێك لەگەڵ ژیان دەکەن. ئەوەی حکومەتی هەرێمیش تا ئێستا بۆ ئەمانەی کردبێت گۆڕینی ناوی ئۆردوگاکانە بە ناوی کوردی و کردنیان بە ناحیە و دانانی مودیرناحیەیە بۆیان، کە ئەمانیش بەدەست کێشە هەرەزۆرەکانی ئەو ئۆردوگا-ناحیانەوە دەناڵێنن. گەر لە قوربانیانی ئەنفال بپرسیت، زۆربەی هەرەزۆریان دەڵێن کە ئەو ناحیانە بۆ ئەوان هەر ئۆردوگایە و تائێستاش ئاواتیان ئەوەیە ڕۆژێك لەڕۆژان لەوێ دەربچن. کەواتە هەر هەوڵێك بۆ چاککردنی بارودۆخی ژیاریی دانیشتوانی ئەو ئۆردوگا-ناحیانە، بەتایبەتی بۆ ڕزگاربووانی ئەنفال، بێهودەیە. ئەوان پێویستیان بە جێگایەکە چیدی ئەنفالیان بەبیرنەهێنێتەوە. ئەوان هێشتا زۆر بەسەختی لە ترۆما (کاریگەریە دەروونیەکان) ی ئەو

کارەساتەدا دەژین. شتێکی زۆر گرنگ کە تائێستا بۆ ئەم قوربانیانە نەکراوە و پێدەچێت لە کۆمەڵگای کوردیدا هێشتا هیچ گرنگیەکی نەبێت، چارەسەرکردنی ئەو ترۆمایانەیە.

گەورەترین زیانی کۆمەڵایەتی لە قوربانیانی ئەنفال تێکدانی پێکهاتەی خێزانی و شێوازی ژیانیانە. وەك دەزانین زۆربەی رزگاربووانی ئەنفال بریتیین لەو کەسانەی لەکاتی هێرشەکاندا پیربوون و زۆر لەوانەش لەماوەی بیست ساڵی رابووردوودا لەدونیادا نەماون. بەشێکی تری رزگاربووان ئەو ئافرەتانەن کە ئەو کاتە لاو بوون و بەشێوەیەك لەشێوەکان خۆیان و منداڵەکانیان رزگاریان بوو بەڵام مێردەکانیان هەرگیز نەگەڕانەوە. بەدەگمەن نەبێت، ئەمانە شویاننەکردۆتەوە و بەبێوەژنی ماونەتەوە و لە ناهەموارترین بارودۆخدا منداڵەکانیان بەخێوکردووە. بەشێکی تری رزگاربووانیش ئەوکاتە منداڵ یان لاو بوون و هێشتا شویان نەکردبوو یان ژنیان نەهێنابوو، لەزۆربەی حاڵەتدا باوکیان لەدەستداوە و هەندێکیشیان هەردوو باوك ودایکیان لەناوبراون. هیچ یەکێك لەم سێ گروپە دواتر توانای ئەوەی نەبووە سەرلەنوێ ژیانی دەستپێبکاتەوە. بەتایبەتی نەیانتوانیوە بگەڕێنەوە لادێکان و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بن، کاتێك ئەو هەلەشیان بۆ ڕەخسابێت. پیروپەککەوتەکان چیتر نەیاندەتوانی، بەلایەنی کەمەوە بێ کۆمەکی کەسانێکی لاوتر، لە لادێ و مەزراکانیاندا کاربکەن. بێوەژنەکانیش بەهەمانشێوە نەیاندەتوانی چیتر ژیانی لادێیانە دەستپێبکەنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی چەند منداڵێکیان کەوتبوو بەسەردا. هەرچی منداڵ و لاوەکانیشە هێندە شارەزای کشتوکاڵ نەبوون و ئەمانە دوای ئەنفال لەو ئۆردوگایانەدا پەروەردەبوون و زۆربەی زۆریان هێندە لە ژیانی لادێ شارەزان هێندەی هەرکەسێکی تر کە لەلادێدا پەروەردە نەبووە. بۆ هەموو ئەمانە، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا کە زۆر بەپیت نیین و کشتوکاڵ دێمیە و پشت بە باران دەبەستێت وەك لە گەرمیان، زەحمەتترین شت دەستکردنەوەیە بە ژیان لە لادێکاندا. هەرچەندە کەسانێکیش هەن زۆر بە تەحەداوە چوونەتەوە لادێکان.

ڕەچاوکردنی ئەم راستیانە زۆر گرنگە بۆ هەر هەنگاونانێك، چ لەلایەنی حکومەت و چ لەلایەنی رێکخراوانی سەر بە کۆمەڵگای مەدەنیەوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی ئەنفالکراوان و کۆمەککردنیان. گەر لە من دەپرسیت باشترین چارەسەر چییە، ئەوا دەڵێم زۆر بەسادەیی (دەتوانم بڵێم تەنها چارەسەری لۆژیکی) بەخشینی ژیانێکی ئاسایی و دابینکردنی دڵنیاییەکی کۆمەڵایەتییە بۆ بەلایەنی کەمەوە دوو نەوە

لە قوربانیانی ئەنفال. نەوەی یەکەم: بەتەمەنەکان و بێوەژنەکان (کە زۆربەی ئەوانیش ئێستا چوونەتە تەمەنەوە) و هەموو ئەوانەی لەسەردەمی ئەنفالدا لەسەروو تەمەنی شازدەساڵانەوە بوون. نەوەی دووەم: منداڵانی ئەنفالن، واتە هەموو ئەوانەی لەسەردەمی ئەنفالدا لەنێوان تەمەنی ساوایەتی و شازدەساڵیدابوون، یان لەو سەردەمەدا لەدایکبوون. ئەمانەش لاوترینیان ئێستا تەمەنی بیست ساڵە و بەتەمەنترینیان سیوشەش ساڵە.

هەرچی نەوەی یەکەمە مافی قەرەبووکردنەوەیەکی تەواوی هەیە، بەخشینی خانوویەکی باش (نەك زەوی) بە هەر یەکێك لەوانە، نەك لەچەشنی ئەوەی حکومەتی بەعس لە ئۆردوگاکاندا پێش ئەنفال و کاتی راگوێزانی گوندەکان بە لادێییەکانی دەبەخشی کە ئیهانەیەکی گەورەیە بە مرۆڤێك بکرێت. بەڵکو خانوویەك تیایدا هەموو هۆیەکانی خۆشگوزەرانی و کەلوپەلی ناوماڵی تێدابێت و لەدەرەوەی ئۆردوگا- ناحیەکاندا بێت (مەگەر خۆیان بیانەوێت لەوێ بمێننەوە.) هەروەها بڕینەوەی موچەیەکی مانگانە کە بەلایەنی کەمەوە لەئاستی موچەی فەرمانبەرێکی بالادا بێت (چونکە رەنگە تەنها بەو موچەیە کەسێك بتوانێت بەشێوەیەکی شایستە بژی.)

نەوەی دووەمیش بەپێی باری خێزانیی بەهەمانشێوە خانوویەکی پێببەخشرێت و بڕێکی هێندە پارەی پێبدرێت کە بتوانێت ژیانێکی ئاسودە بۆ خۆی و خێزانەکەی (گەر خێزانی هەبێت) دابینبکات. لێرەدا بواری ئەوە نییە حسابێکی وردی ئەمە بکرێت چەندی تێدەچێت بۆ حکومەت. چونکە گرنگترین هەنگاو ئەوەیە بزانرێت ئەمانە بەتەواوی چەندە کەسن. بەبڕوای من ژمارەکە هێندە نییە کە حکومەتێك لەبەرامبەریدا جۆشدابمێنێت. بەڵام بەهەر پێوەرێك بێت چ حکومەتی عێراقی و چ و حکومەتی کوردی بەرپرسیارن لە هێنانەدیی دەستبەجێی ئەم قەرەبووکردنەوەیە. هەرچی درەنگتر بکرێت هەرچی گرانتر دەکەوێت لەسەر حکومەت و کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانی هەرچی گەرەتردەبێت بۆ هەرچی زیاتر لە کەسوکاری قوربانیان. گەر دە ساڵ لەمەوبەر ئەم چارەسەرە بۆ نەوەی یەکەم بکرایە، ئێستا نەوەی دووەم بارودۆخی زۆر باشتر دەبوو و رەنگە زۆربەیان پێوویستییان بە قەرەبوویەکی ئەوتۆ نەبوایە، چونکە بەشێك بوون لە خێزانی نەوەی یەکەم. بەڵام گەر دوابخرێت بۆ چەند ساڵێکی تر، ئەوا گەر پێنج ساڵی تر لە من بپرسیت، دەڵێم نەوەی سێهەمیش، واتە منداڵانی نەوەی دووەم، مافی قەرەبووی لەو شێوەیەی هەیە.

یەکێك لە غەدرە گەورەکانی حکومەتی کوردی (لەگەڵیشیدا حکومەتی عێراقی) لە ئانفالکراوان ئەوەیە کە ساڵەهایە تەنها موچەیەکی ناچیز دەدەن بە تەنها یەك کەس لە خێزانێك، کە ئەویش کەسوکاری راستەوخۆی یەکێك لە قوربانیە کوژراوەکانە. ئەمەش خۆی چەندان کێشەی بۆ خودی حکومەت درووستکردووە. لەکاتێکدا دەبوو هەر تاکەکەسێکی رزگاربووی ئەنفال، لەمنداڵەوە بۆ گەورە، سەرچاوەیەکی بژێویی بۆ دابین بکرایە تابیانتوانیایە خۆیان لەسەر ئەوەوە ژیانی خۆیان پێکبهێنن. هەروەها من نازانم بەخشینی تەنها پارچە زەویەك بە تەنها یەك کەسی بەجێماوی قوربانیەکی کوژراوی ئەنفال چی لەژیانی ئەنفالکراوان دەگۆڕێت. ئەمە جگە لە کردەوەو ئامارژەیەکی سیاسی لەلایەن حکومەت یان حیزبێکەوە کە وادەزانێت خاکی نیشتمان موڵکی خۆیەتی تا بەئارەزووی خۆی دابەشیبکات، هیچی تر نییە.

من گەر لەسەر وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەردەوام بم، زۆر درێژدەبێتەوە، بۆیە لێرەدا دەوەستم.

**عەرعەر: ئەو کتێبو شاکارە گەورانەی لەسەر ئەنفال و جینۆسایدی کورد نوسراون و کراون بێگانەکان بۆیانیان نوسیوین و بۆیانیان کردووین، کورد چۆن دەتوانێت سوود لەوانە ببینێت و بەکاریان بهێنێت؟**

گۆران بابا عەلی: ناونانی ئەنفال بە جێنۆساید لەلایەن هەندێك رێکخراوی جیهانیەوە، وەك رێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ و رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی (ئەمنیستی ئینتەرناشناڵ) مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە مافی مرۆڤەوە هەیە. ئەمە گرنگیەکی یەکجار گەورەی هەیە. کورد وەك میللەت و نەتەوە دەتوانێت هەمیشە ئامارژە بەم دانپێدانانە بکات. هەرچی داننانی دادگای دێنهاخ (لاهای)شە لە هۆڵەندا بە ئەنفالدا وەك جێنۆساید گرنگیەکەی لەوەدایە کە دەکرێت بکرێت بە نمونەیەك بۆ لایەنانی تری یاسایی تا رەچاوی بکەن. چونکە زەحمەتترین شت لە حاڵەتی کۆمەڵکوژیدا داننانی یاساییە بەو حاڵەتەدا وەك جێنۆساید. بێگومان کاریگەریی ئەمە زیاتردەبوو گەر دادگایەکی جیهانی تایبەتی بۆ جێنۆساید دانی بەوەدا بنایە. بەڵام میللەتی کورد دەتوانێت هەمیشە ئامارژە بەم ناساندنە یاساییەش بکات.

لەسەر ئاستی دەوڵەتدا، تا ئێستا هیچ دەوڵەتێك بە فەرمی دانی بەمەدا نەناوە. ئێستا لە هۆڵەندا چەند پەرلەمەنتارێك لەهەوڵی ئەوەدان قەناعەت بە حکومەتی هۆڵەندی

بکەن وەك دەوڵەت بەفەرمی ئەنفال وەك جینۆساید بناسێنن. ئەم هەنگاوە گرنگە، لەبەرئەوەی دەشێت هانی دەوڵەتانی تری ئەوروپیش بدات ئەو هەنگاوە بنێن. گرنگیی ئەمەش لەوەدایە کە ئەوکاتە دەکرێت بەشێوەیەکی فەرمی داوا لەم دەوڵەتانە بکرێت بەدواداچوون بکەن لە بەشداریکردنی هەندێك کەسان و کۆمپانیادا لە فەراهەمکردنی کەرەسەی خاو بۆ دروستکردنی چەکی کیمیایی و بەکارهێنانی لە هێرشەکانی ئەنفال و هەڵەبجەدا. هەروەها ناچارکردنی ئەم کۆمپانیایانە بە قەرەبوکردنەوەی قوربانیان.

بێگومان کورد دەتوانێت هەموو ئەمانە بەکاربەێنێت بۆ پتەوکردنی ئاوات و ئامانجە نەتەوەییەکانی. بەڵام زۆرجاران رەخنەی ئەم رێکخراو و کەسایەتی و دەوڵەتانە ئەوەیە کە لەپشت هاوارەکانی سیاسیان و کەسانی تری کوردەوە دەربارەی ئەنفال و هەڵەبجە ئامانجێکی سیاسی هەیە بۆ پشگیریکردن لە هەوڵ و ئامانجەکانی کورد بۆ پێکهێنانی دەوڵەت و نەتەوە. هەرچەندە زۆر لەمانە ئەوە بە مافێکی کورد وەك نەتەوە دادەنێن، بەڵام داکۆکیکردنی ئەم کەس و لایەنانە لە ئەنفال بەمەبەستی داکۆکیکردن نییە لە کورد وەك نەتەوە و لەمەسەلەی کورد. بۆ کوردیش ئەوە زۆر گرنگە ئەم دوو مەسەلەیە تێکەڵنەکات. بەسیاسیکردنی ئەنفال زیانێکی گەورەی هەیە بۆ ئەنفال وەك مەسەلە.

**عەرعەر: دەزگا و کەناڵی راگەیاندنی کوردی چۆن مامەڵیان لەگەڵ ئەنفالدل کردووە؟ توانیویانە بەشێوەیەکی زانستیانەو تەواو کاری لەسەر بکەن؟**

گۆران بابا عەلی: تا ئێستا میدیای کوردی زۆر شتی دەربارەی ئەنفال خستۆتەڕوو. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە سۆز و لاواندنەوە و کڕوزانەوە زۆر زاڵە بەسەر زۆربەی ئەو بەرهەمانەدا. بێگومان کاری میدیاو رۆژنامەگەری و زۆر بەتایبەتیش کاری هونەرمەندان جیاوازە لەکاری لێکۆڵەرەوان و بوارە زانستیەکان. ئێمە ناتوانین لە میدیا، لە کەناڵە تەلەفزیۆنی و رادیۆییەکان و لە رۆژنامە و رۆژنامەوانان داوابکەین لێکۆڵینەوەی زانستی لەبابەتەکە بکەن. دواجار بەشێکی کاری رۆژنامەوانییش دەربڕینە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەم کارە رۆژنامەوانیانە بەپێی پرینسیپەکانی رۆژنامەوانی بکرێن و بەلایەنی کەمەوە رەچاوی بنەمای بابەتیبوون بکەن. رۆژنامەوانان دەتوانن لەمەدا زۆر سود لە لێکۆڵەرەوان ببینن. بەڵام لەڕاستیدا گەر رۆژنامەوانان کارەکەی خۆیان بەشێوەیەکی پیشەیی ئەنجامبدەن، دەتوانن ئەوان سودی زۆر بەلێکۆڵەرەوان و لێکۆڵینەوە زانستیەکان بگەیەنن.

# عومەر محەمەد:
# شەرمنی سیاسەتمەداری کورد لەئاستێکدایە ناشێت چیتر نەوەی داهاتوو چاوەروانی بکەن.



**چاوپێکەوتن: عەرعەر**

بۆ زانینی هەوڵەکانی کورد و رێکخراوە بیانیەکان لە بە جیهانی ناساندنی ئەنفال و چۆنیەتی کردنی ئەنفال بە دۆزێك کە بۆ بەرژەوەندیە نیشتیمانیەکان و خزمەتی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان بەکار بهێنرێت، هەروەها بۆ زانینی کار و ئەرکی ناوەندی چاك و چۆنیەتی کارکردنیان و گرنگی و شێوەی دەرکردنی ساڵنامەی ئەنفالستان، گۆڤاری عەرعەر ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ عومەر محەمەد سازکرد.

**عەرعەر: ئەمساڵ کە بیستەمینساڵیادی پەلامارەکانی ئەنفالە، جگە لە هەوڵی چەند رێکخراوێکی بیانی بۆ بە جیهانی ناساندنی ئەنفال و جینۆسایدی کورد، ئایا لەو ماوەیەدا کورد بۆ خۆی توانویەتی لەسەر ئاستی جیهانی کاربۆ ناساندنیان بکات؟**

عومەر محەمەد: چەند هەولێکی باش هەبوون، ئەمەش تا ئەو کاتەی کورد دەبێتە خاوەنی لۆبیەکی باش بۆ ئەو ئەرکەو بەشێوەیەکی پرۆفیشناڵ کاری بۆدەکات، دەتوانین بلێین هەوڵن‌و بەشبەحاڵی خۆشم بەهەوڵی باشیان دەزانم، کۆنگرەی ناساندنی جینۆساید لەهەولێر یەکێك بوو لەو هەوڵە جدیانەی پێموایە شتی باشی بەدواوە دەبێت، ئەگەر ڤایرۆسی ململانێی حزبی لێی نەداو هەوڵەکانی نەکوژێت، کۆنفرانسی شارەوانیەکان بۆ یادی بیست ساڵەی هەڵەبجە کارێکی باش بوو، ئەوەندە من ئاگاداربم

لەنەرویج کارکراوە، لە سویسرا ناوەندی چاكو ڕێكخراوی وادی ئەلمانی لەیادی بیست ساڵەدا كاری باشیانكرد، دوای ئەوە نابێت ئەوە لەبیربكەین هەوڵ بۆناساندنی جینۆساید ئامانجی خۆی هەیە، تۆ خەڵكی بۆكۆدەكەیتەوەو دۆستو هاوپەیمان پەیدا دەكەیت، هەندێك كەس ئەوەندە بە كورت بینیەوە تەماشای ئەو ئەركانە دەكەن، پێیان وایە هەرلەكۆنگرە دەبێت دەولەتی سەربەخۆی كورد رابگەیەنرێت. ئەمە تێنگەیشتنە لەئەركو ئامانجی كۆنگرەیەكی لەو شێوانەی لە كوردستانو لە دەرەوە ئەنجامدراون. ئەم كۆنگرانە هەر چۆنێك بێت لە شەرە پەرۆی سەرجادەكانو خۆبادانو بەڵێنی جێبەجینەكراوی بەرپرسەكان باشترە. بەڵام هێشتا ئەو هەولانە بەدحاڵی بوونو نەشارەزایی زۆریان پێوە دیارە، خەڵكانێك دێن وادەزانن هەر كە قژ زەردێك هاتو دوقسەی كرد ئیتر ئەو كۆنگرەیە زۆر سەركەوتووە، لەكاتێكدا مەرج نیە هەموو بێگانەكان شارەزای دۆزی كوردو تاوانەكانی دژی كورد بن، خۆ هەموو كەس یوست هیلتەرمانو هادرێكس نین چەندین ساڵی تەمەنی خۆیان بەكوردەوە خەریك بووبن.

**عەرعەر: جینۆسایدی كورد هیچی لەجینۆسایدی ئەرمەن و هۆلۆكۆست و رواندا و نەتەوەكانی تری جیهان كەمتر نیە و لەدوو دادگای باوەرپێكراودا وەكو جینۆساید دانی پێدا نراوە، ئایا كورد توانیویەتی سوود لەجینۆسایدەكەی وەربگرێت بۆ ئاسایشی نیشتیمانی كوردستان؟**

عومەر محەمەد: نەخێر.. نەیتوانیوە بەڵام دەشێت بتوانێت، جینۆسایدی ئەرمەن بەقەد جینۆسایدی كورد لەباری قانوونیەوە هەنگاوی نەناوەو نەچووەتە پێشەوە، لەكاتێكدا ئەوان وا بۆ سەد ساڵ دەچێت، خەریكن، جینۆسایدی كورد دوو دادگای تایبەتمەند ئیعترافیان پێكردووەو نەك هەرتاوانبارەكانی تەنانەت هاوكارو یاریدەدەرانیشی سزایان بەسەردا سەپێنراوە،ئەوەتا لە رووی یاسایی یەوە مەسەلەكە یەكلایی كراوەتەوەو تەمومژی لەسەر نەماوە، ئەگەر باسی كورد دەكەین دەبێت تەحدیدی بكەین كورد لەكوێ سودی لێببینێ؟ لەباری یاساییەوە ئەوە دەستكەوتێكە بریاری هەردوو دادگای باڵای تاوانەكانی عێراقو دادگای شاری لاهای سوودیان هەیە، بەڵام هەتا ئیستا نەخێر دەستكەوتەكانی وەرنەگیراون، بۆنمونە ئەو كاتە سودمەند دەبین كە دەولەتی عێراق وەكو ئەركێكی سیاسیو ئەخلاقی بەرانبەر بە بریاری دادگای ولاتەكەی داوای لێبوردن لە گەلی كورد بكاو بە مرسومێكی كۆماری ئەمە رابگەیەنێ، بەڵام نابێت ئەوەش لە یاد بكەین كەوا گەلی كورد لەدۆسێی جینۆساید سود مەندبووە، هەرچەندە ئەو سودمەند بوونە ئەوە نیە كە بەریزت مەبەستتە، بۆنمونە برایاری ٦٨٦ ی

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پشتێنەیەکی ئەمنی لەکاتێکدا صدام لەدەسەلأت دابوو بریارێکی گرنگ بوو، ئەوە لەئەنجامی ئەوەوە هات کەوا هەر گروپێکی جینۆسایدکراو پێویستی بەحەسانەی نیودەولەتی هەیە بۆ ئەوەی بەرپەلاماری تاوانی نیودەولەتی نەکەوێتەوە، نەتەوەیەکگرتووەکان لە سالی ١٩٩١ دوای ئاوارەیی خەلکی کوردستان بەم ئەرکە هەستا، بەلأم ئەو بریارە تەنها دیوە ئینسانیەکەی گرتەوە.

**عەرعەر: لەسەر ئاستی ناوخۆی کوردستان، ئەنفال و هەلەبجە تەنها لەکاتی یادەکانی قسەی لەسەردەکرێت‌و ناهۆشیاریەکی زانستی هەیە لەسەر ئەودوو کارەساتە، توانیومانە هێندەی قورسایی کارەساتەکان درك بە ئەنفال و هەلبجە بکەین؟ چی پێویستە بکرێت بۆ ئەوەی ئەنفال و هەلەبجە لەناوەندە زانستی و ئەکادیمیەکاندا ببێت بە بابەتێکی گشتگیر و هەمەلایەن؟**

عومەر محەمەد: پێموایە ئەوەمان تێپراندووە کە یادەکان بکەین بەدوکان، بازرگانەکانی ئەم یادانە خەریکی کاسبی ترن‌و خەلکیش لەو نیازە ناپەسەندە تێگەیشت، ئەوەی تۆ پێی دەلێیت ناهۆشیاری زانستی، خەتای خەلکی تیدا نیە، خەلك چەواشەکرابوو، بەلێنەکان زۆر گەورەتربوون لەوەی لەهەگبەدابوون، مەرج نیە کە هوشیاریمان لەسەر ئەنفال یان تاوانەکانی تر پەیداکرد، هەمووشتێکمان بەدەست هێنابێ نەخێر هوشیاری تەنا رێگای تەندروستمان نیشان دەدات کەچی بکەین باشەو کامە وەلا بنێین، بەلکو ئێمە وەکو کۆمەلگەی کوردی پێویستمان بەجورئەتە، مەبەستمە بلێم بتوانین لە دەرگای کۆمەلگەی نێودەولەتی بدەین، وەکو تاوانەکان لەدژمان گەورەن خۆمان بەکەم نەگرین، ئەوەی مەبەستمە لە جورئەت چاو لە سیاسیەکان نەکەین مەرج نیە هەموو شتێك بەوان بکرێت، راستە لەدەرگادانی کۆمەلگەی نێودەولەتی پێویستی بە سیاسەتی حەکیمانەهەیە، بەلأم شەرمنی سیاسەتمەداری کورد لە ئاستێکدایە ناشێت چیتر نەوەی داهاتوو چاوەروانی بکەن، هەتا ئێستا هەندێك کەس ناوێرن وەکو پێویست باسی ئەنفال بکەن بۆئەوەی ئەمریکیەکان دلیان نەرەنجێ، لەکاتێکدا لەسەدەی رابوردوودا راوێژکارێکی وەکو هێلتەرمان بە توندی رەخنەی لەسیاستی ئەمریکاو هەر پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجومەنی ئاسایش گرتووە، کەسێکی وەکو سەمانساپاوەر ئەگەرچی لەزانکۆکانی ئەمریکا مامۆستای زانستە مرۆڤایەتیەکانە و لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکایە، کەچی هەموو لایەنداریەکانی ئەمەریکای بۆرژێمی

صدامو هۆی بێدەنگی لەتاوانی جینۆسایدکردنی کورد بە راشکاوی خستووتە روو. ئەوەندەی پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە هۆشیاریمان لەبارەی تاوانەکەوە بەشێکی بەدەستهێنانی ئامانجەکەیە،بەڵام وەکو پێشتر ووتم هوشیاری زانستیو یاسایی هەموو شتێك نیە، من پرۆفیسۆرێكو فەیلەسوفێکی ترسنۆکم بۆچیە؟ چ خێرێك بۆ کۆمەڵگا دەداتەوە؟ ئێ خۆ بەنیازیش نین ئێمە ئیتر هەر بۆ مردووەکانمان بگرین، شینی ئێمە بۆ زیندووەکانە، مەعریفەش ئەگەر جورئەتێکی لەپشتەوە نەبێت، سوودی چیە، خۆ بەپێچەوانەوەشەوە هەر راستە بەچیدە چێت کەسێکی پرکێشو سەرسەخت بەڵام بێ مەعریفە بێت، بەکورتی ئێمە پێویستمانە بەوە بەرلەوەی ئەنفال بەدنیا بناسێنین ئەگەرچی ناسراویشە، کەم کەناڵی ئاسمانی دنیا هەیە دۆسێی ئەنفالیان نەگواستبێتەوەو رۆژنامەنوسان کاری رۆژانەیان لەسەر نەکردبێ، لەکاتی دادگایکردنەکەی ئەنفالدا، بەڵام پێویستەبەرلەوە خۆمان باش بیناسین.

**عەرعەر: خانەوادەی ئەنفالکراوەکان ئێستاش لەئۆردوگاکانداو لەبارێکی گوزەرانی خراپدا دەژینو بەدەست چەندین گرفتی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دەرونیو نەخۆشییە جەستەیو درێژخایەنەکانەوە دەناڵێنن، هاوکاریو چارەسەرکردنی ئەمان ئەکەوێتە ئەسۆی کێ چی لایەنێك؟**

عومەر محەمەد: تا ئەوکاتەی حکومەتی هەریمو رێکخراوەکان قەناعەت بەدەوڵەتی عێراق دەهێنن، یان فشاری دەخەنە سەر، بەناچاری ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، بەڵام لەراستیدا نەك هەر کەسوکاری قوربانیان بەڵکو کۆمەڵگەی کوردستان، راستروایە بلین گەلی کوردستان لە عێراق، لە رووی قانونیو ئەخلاقیەوە دەکەوێتە ئەستۆی دەولەتی عێراق، بەڵام باگریمانەی ئەوە بکەین حکومەتی عێراق نیازێکی شەرانگیزانەی هەیەو مل بەم مافە رەوایەی گەلی کورد نادات؟ ئەی حکومەتی هەرێم دەبێت فەرامۆشیان بکات؟ بێگومان ئەویش ئەرکێتی ئەرکێکی نیشتمانیو ئەخلاقی لەئەستۆیە دەبێت پێوەی پابەند بێت، دەبێت مشوری بریندارانی چەکی کیمیاوی بخوات، دەنا حکومەتی هەرێمی کوردستان متمانەی خۆی لەدەست دەدات، پێویستە گوندەکانو ئۆردوگاکان بە جۆرێك خزمەت گوزاریان بۆ بچێت مرۆڤ تیایدا هەست بەبەهای هاوڵاتی بوونو ئینسانیەتی خۆی بکات، دەنا پروپاگەندەو دروشم برینی بریندارا ن سارێژ ناکەن، دەمێکە ئەو بروایەم هەیە هەر دەسەڵاتێك رێز لە

زیندووەکان نەگرێت، ناتوانی وەفاداری شەهیدان و قوربانیانی ئەنفال و کیمیاباران بێت، من کە ژیانم لە تەنگژەو بێدەرەتانی و نەگبەتیدا بوو بەچی دەچێت ئەگەر گۆری باوکە شەهیدەکم بۆبکەن بە ڤییەلا؟

**عەرعەر: تۆ وەکو ئەندامێکی کارا لەناوەندی چاك کەرێکخراوێکی ئەکتیڤە لەبوارەکانی ئەنفال و هەڵبجە و جینۆسایدی نەتەوەی کورددا، ئەم رێکخراوە کۆمەڵێك کاری باشی کردووە لەو بوارانەدا بەڵام ئایا کارەکانی ناوەندەکەتان لەئاستی پێویستی و گەورەیی کارەساتەکاندان؟**

عومەر محەمەد: نەك ناوەندی چاك تەنانەت حکومەت و کۆمەڵگەی کوردیش لەئاستی گەورەیی تاوانەکاندانین، هەتاکو ئەمرۆ خەڵکمان هەیە لەناوناوەندی چاك ناتوانێ راڤەیەکی نیوەناچلی ئەنفال بکات، هێشتا لەئەنفال تێنەگەیشتووە، هێشتا پێی وایە، دەبێت لەتۆڵەی ئەنفال عەلی حەسەن مەجید بهێنرێتە هەڵەبجە لە سێدارە بدرێت، هێشتا پێی وایە تاوانی هەڵەبجە لەتاونی ئەنفال گەورەترە،لەکاتێکدا هەردووکیان یەك تاوانن، راستە دوو دۆسێی جیاوازن، بەڵام هەردوو تاوانەکە تاوانی نێودەوڵەتین، هەردوو تاوانەکە تاوانی جینۆسایدن،لەئەنفال و هەلەبجەدا هەرسێ پایەبنەڕەتیەکەی تاوانی جینۆساید ئامادەن( تاوانی دژی مرۆڤایەتی، تاوانی کۆمەڵکوژی، تاوانی جەنگ) بەڵام ئەنفال هەموو جۆرەکانی تاوانی جینۆسایدی تێدایە، تاوانی جینۆسایدی فیزیکی، جینۆسایدی کلتوری، جینۆسایدی ئابوری) کۆمەڵکوژی دەچێتە خانەی جینۆسایدی فیزیکیەوەو کوشتنی منداڵ و شێواندنی کلتورو مێژوو.سرینەوەی ئاسەوارومۆرکی نەتەوایەتی هەموویان دەچنە خانەی تاوانی دژی مرۆڤایەتیەوە. نابێت ئەوەش لەیادبکەین تاوانی جینۆساید بەزۆری ژمارەی قوربانیەکانی نیە، کەوا تیبگەین لەبەر ئەوەی ئەنفال زیاتر لە١٠٠٠٠٠ سەدهەزار کەسی تیدا کوژراوە گەورەترە لە هەلەبجە. نەخێر تاوانی ئەنفال نیازی پاکتاوکردنەکەی سرینەوەو تەنك کردنی شوناسی کورد بوون بوو، هەڵەبجە لەنیوان دوجەنگداو هێرش بوو بۆ سەر شارێك لە جەنگدا، بەڵام لەراستیدا لۆجیکی کۆمەڵکوژی هەڵەبجەش هەمان لۆجیکی ئەنفال بوو، هەمان ئەو نیازە کۆکوژیە بوو کە عەلی حەسەن مجید نمایندەو فەرماندەی بوو، ئەمەش لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی بەنێوشۆرشەوە رێگە پێدرابوو.

**عەرعەر: ناوەندی چاك تا چەند توانیویەتی گرنگی بە ئەرشیف کردن و توێژینەوەی توێری و مەیدانی بدات و ببێت بە سەنتەرێکی زانسیاری؟ حکومەتی هەرێمی کوردستان چەندە هاوکاری ناوەندەکەتان بووە لەو بوارانەو بوارەکانی تردا؟**

عومەر محەمەد: لەبەشی دووەمی پرسیارەکەتەوە دەست پێدەکەم، حکومەتی هەرێمی کوردستان، هیچ هاوکاریەکی ناوەندی چاکی نەکردووەو پێشموانیە بیکات، ئەگەرچی خۆشمان هیچ داواکاریەکمان لەحکومەت نەکردووە، رۆژێکم پێ شکنایەت داوای هاوکاریمان لەحکومەت کردبێت، تەنها دووجار نەبێت ئەویش هێنانی پرۆفیسۆرێکی نەمساوی و وەفدێکی نەرویجی بوون کە هەریەکەیان بەجیا هاتبوون، نەمساویەکە بۆئەوەی شایەتی لەسەر تاوانی هەڵەبجە بدات، نەرویجیەکەش بۆ ئەوەی کاریگەری تاوانی جینۆساید بەرێتەوە بۆ وڵاتی نەرویج، نەمساویەکە لەرێگەی وەزارەتی شەهیدو ئەنفالەوە بوو،خۆیان خەرجیان کێشا، بۆ نەرویجیەکەش راستەوخۆ بەنامەی رەسمی داوامان لەپارێزگای سلێمانی کرد هاوکاریمان بکەن، بەسوپاسەوە هاوکارییان کردین بەدابینکردنی ئۆتۆمبیلێك‌و خەرجی خواردنی میوانەکانمان، دەنا پارەی هۆتێلەکەشیان بۆخەرج نەکردین، ئەویش کەوتە سەر وەفدە نەرویجیەکە، لەبەر ئەوەی ئێمە هیچ داهاتێکمان لەبەر دەست نەبوو.

بۆ مەسەلەی ناوەندی چاکیش راستە ناوەندی چاك کاری باشی کردووە، بەڵام وەکو ئەوەی تۆ باسی دەکەیت بۆ کۆکردنەوەی ئەرشیف‌و دەزگایەکی دۆکۆمینتاری‌و سەنتەرێکی زانستی‌و دراسی، بەداخەوە نەك ناوەندی چاك هەتاکو ئێستا حکومەتی هەرێمیش گرنگی ئەو کارە نازانێ، یان دەیزانێت‌و خۆی لەقەرەنادات، بەراشکاوی دەیڵێم بەشێك لەکێشەکانی من لەگەڵ ناوەندی چاك لەسەرئەوەبوو کەئەوەندەی گرنگی بەبەیاننامەنوسین دەدا، بچێتە پای رێکخراوبوونی خۆی‌و ئەم کارانە دەست پێبکات، بەڵام ئەوەندە نەدەچووە سەر ئەوکارانەو ئیستاش هەرنەچووە، ئەگەرچی جارێك لەگەڵ کاك (دلێر محمد) پرۆژەیەکمان نوسی رێك ئەو مەجالانەی دەگرتەخۆ کەبەرێزتان مەبەستتانە، دیارە ئەو پرۆژەیە هەروا ئاسان نیەو بەناوەندێکی پەرش‌وبڵاوی وەکو چاکیش ئەنجام نادرێت، پرۆژەکەمان دایە وەزیری مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی ئەوسا سەروەختی دو ئیدارەیی بوو کاك (جەمیل عەبداڵ) بوو بەوەکالەت وەعدی پێداین زۆر بەجدی کاری بۆ بکات‌وپرۆژەکەی بەلاوە گرنگ بوو، ئێمەش تەنها مەرجمان ئەوەبوو سەربەخۆ بین‌و حکومەت هاوکاریمان بکات، لەدابینکردنی بیناو موچەی کارمەندەکانی، بەڵام ئەو وەعدەش بەدەردی زۆربەی وەعدەکانی تری حکومەت چوو، دەنا ناوەندی چاك ئەگەر بیەوێ کاری جدی بکات، ئەمرۆش نەبێت سبەی دەبێت بەو کارە هەستێت،

بەڵام خۆ ئەوە تەنها کاری ڕێکخراوێك نیە، بەڵکو کاری هەموانە بەحکومەتو ڕێکخراوەکانیشەوە.

**عەرعەر: گۆڤاری ئەنفالستان کەئەمساڵ ژمارە (٥)ی لێ دەردەچێتو یەکێکە لەو بڵاوکراوانەی کەتایبەتە بەکارەساتو پەلامارەکانی ئەنفال، تۆ وەك سەرنووسەری ئەو گۆڤارە زیاتر گرنگی بەچی لایەنێکی ئەنفال دەدەیت؟ خەڵكو دەزگا حکومیو حیزبییەکان تا چەند بەدەنگ گۆڤارەکەتانەوە دێت؟**

عومەر محەمەد: ئەنفالستان گرنگی بەهەموو لایەنەکانی ئەنفال دەدات، لەبەرئەوەی تایبەتنیە بەلایەنێکی تاوانەکە، تاوانی ئەنفال دۆسییەکی فرە ڕەهەندە، بەڵام لەرابوردوودا گرنگترین ڕەهەندی بەلای منەوە ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە بوون، کەیەخەی کەسوکاری قوربانیەکانی گرتبوو، ئەو خەڵکانە لەهەلومەرجێکی قورسی ژیاندابوون، (دیارە ئیستاش رزگاریان نەبووە، بەڵام تارادەیەك باشترە) ئەو خەڵکانەی من دەمدواندن زۆریان قسە پێبوو بەڵام کەناڵیان نەبوو قسەی تێدابکەن،کەناڵە حزبیو حکومیەکان تەنها لەبۆنە تایبەتیەکاندا دەیانهێنانە قسەو ئەو قسانەشیان سانسۆر دەکرد کەرەخنە ئامێز بوون بۆ حزبودەسەڵات، ئامانجی ئەنفالستان رونو ئاشکرایە، دەمانەوێت لەهەر گۆشەیەکەوە قسە هەبێت لەبارەی ئەنفالەوە بیکەین، چ ئەوانەی قوربانی راستەوخۆن چ ئەوانەی قوربانی ناراستەوخۆن، خەڵك هەیە کەسی ئەنفال نەکراوە بەڵام قوربانی ئەو تاوانەیە، سایەق کۆستەرێك ئێستا لەهەمووکات زیاتر هەست بە قوربانی خۆی دەکات، کە بەزۆرو بەبێگار بردوویانەو ماڵی خەڵکیان پێ بارکردووە، جاشێکی سوکەڵە بەهەمان شێوە ئەو لەسەرەتاوە وا تێوەگلاوە وەرەقەیەك دەنێتە گیرفانیو لەماڵی خۆی دادەنیشێو موچەکەشی موستەشارەکەی یان ئامر سریەکەی دەیخوات، بەلای زۆرەوە ١٥ رۆژ دەچێت لە رەبایەیەکی جاشدا دادەنیشێو بەم شێوەیە خۆی لە جەنگی عێراق ئێران دەدزێتەوە، بەڵام کاتێك بە ئاگادێتەوە لەناو بازنەی تاوانێکدایە، بەشدارە لە ئەنفال بەلای کەمەوە بێدەنگە لەتاوانێك کە بەپێش چاویەوە ئەنجام دەدرێت، لەوەش خراپتر پار من ئیستخباراتێکم موقابەلە کردووە دەلێت، من براکەی خۆم تەسلیم کردووە، من وام زانی خەلاتی منیشو ئەانەش دەکەن کەوا هاتوونەتەوەو لەرێگەی منەوە تسلیم بوون، بەڵام هەموویانیان بردو ئەنفالکرانو ئێستاش نەگەرانەوە ئەو کۆمەڵە خەڵکە برای خۆمیان لەگەڵدابوو، کەواتە ڕژێم زۆر بە سیستمو پلانێکی تۆکمەوە کاری لەسەر ئەنفال

کردووە، ئەو ویستی هەموو بەلای کەمەوە نیوەی گەلانی عێراق لەتاوانەکەوە بگلێنێ ئەو باش دەیزانی ئەو تاوانەی بەنیازە ئەنجامی بدات، تاوانێکی نائاساییەو سبەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لێی دێتە دەنگ، لەبەر ئەوەی تاوانەکە نیودەوڵەتیە. نەك هەر ئەنفالستان بەڵکو تەواوی ئەوکەسانەی کار لەسەر ئەنفال دەکەن پێویستە بەوردی کاری تێدابکەن چونکە بەرپەرچدانەوەی ئەنفال تەواو وابەستەیە بە هۆشیاری سیاسیو سیاکۆلۆژیو کۆمەڵایەتیەوە بەندە بەمافەکانی مرۆڤەوە، پێم سەیرە کەسانێك دێن گوایە داکۆکی لە کەسوکاری قوربانیان دەکەن، بەڵام بێهیچ لێپرسینەوەیەك لەویژدانی خۆیان تەرو وشك پێکەوە دەسوتێنن، ئەنفال بۆخۆی گەورەترین پێشیلکاری مافی مرۆڤ بوو، لەبەرانبەردا، ئەگەربمانەوێت بەراستی پەرچەکردارمان هەبێت ئەوانەی دەیانەوێت جارێکی تر ئەنفال دوبارەنەبێتەوە دەبێت بەراستی رێز لەمافی مرۆڤ بگرنو بەهای مرۆڤ لەلایان لەسەرەوەی هەموو بەهاکانی ترەوە بێت. بەکورتی تاوان بەتاوان چارەسەر ناکرێت باشترین کاکردن لەدژی ئەنفال پەرچەکرداری دژی بەعسیزمە، لەریشەکێشانی رەفتاری بەعسیزمە، بەچی دەچێت من دژی بەعس قسەبکەمو رەفتاری خۆم بەعسیانە بێت. بەچی دەچێت من هێرش بکەمە سەر ئەو کەسانەی دوێنێ بەشداری تاوانی ئەنفالیان کردووە، بەهەمان لۆژیکی بەعسەوە من دژایەتیان بکەم، باشترین رێزگرتن لە قوربانیان محاکمەکردنی گومانلێکراوانوتاوانبارانە، باشترین محاکمەش ئەوەیە تاوانباران مافی داکۆکی کردنیان لەخۆیان هەبێت، بۆئەوەی بەئازادانە بتوانن هەموو گۆشە تاریك و ئاشکرانەکراوەکان ئاشکرا بکەن، دادگایەکی توندوتیژ بۆ تاوانباران تەنها دڵی ئەوکەسانە ئاسودەدە کات کە لەرەفتادا توندو تیژن، بەڵام رەفتاری تەندروستو دادگای تەندروستو سەربەخۆ ئەگەر تاوانبارانیش بەسزای مەرگ نەگەیەنێ ئەوا رەفتاریان لە ریشە هەڵدەکێشێو ئەوانیش لەبەردەم مێژوو شەرمەزار دەکات، چی لەوە ئەستەمترە مرۆڤ بەشەرمەزاری بژیو دواجاریش بەشەرمەزاری بمرێ؟ مرۆڤی شەرمەزار رۆژی زیاد لەجارێك دەمرێ.

ئیستا گرنگترین لایەنی تاوانی ئەنفال لایەنی یاساییو تێگەیشتنێتی لە جۆی تاوانەکەو گەورەیی تاوانەکە، ئەرکی هەموو ئەوکەسانەیە کەدەیانەوێت ئەنفال بخوێننەوە رەگەزەکانی تاوانی جینۆسایدی تێدا بدۆزنەوەو جۆرەکانی شیکار بکەنو مەترسی دوبارەبوونەوەی بەهەموو دیوەکاندا لێکبدەنەوە.

سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکەشت، حکومەت بەدەنگ ئەنفالستانەوە نەهاتووە، جگە لەوەزارتی رۆشنبیریش هیچ کەسی تر بەهەندی نەگرتووە، بەڵام خەڵك باش پێشوازی لێدەکەن، لەهەموو ئەو شوێنانەی ئەنفال یان کیمیابارانی تێدا ئەنجامدراوە خەڵکێکی زۆر بە پەرۆشیەوەن، کۆمەکی دەکەن‌و بابەتی بۆدەنێرن، لەسەرەتاوە ئەم پەرۆشیە لە گەرمیانیەکانەوە دەستی پێکرد، دواتر پەلی هاویشت بۆهەڵەبجەو ئەمسالیش بۆ دۆلی جافایەتی‌و دۆڵی بالیسان‌و بادینان.

**عەرعەر: لە هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکەدا و لەلاپەڕەکانی کۆتاییدا ئاماژە بە چەند ناوێك دەدرێت کە یارمەتی دارایی گۆڤارەکە دەدەن بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی، ئامانج لەم کارەی تۆ چییە؟ئایا ئەو کەسانە کۆمەکەکانیان چۆن دەگەیەنن دەستان؟**

عومەر محەمەد: بێگومان ئەو کەسانەی لە لاپەرەکانی کۆتایدا لەخشتەیەکدا ناویان بلاو دەکرێتەوە لەبەرانبەردا بڕی ئەو کۆمەکانەش رادەگەیەنرێن، کە دەیبەخشنە ئەنفالستان، کۆمەکەکانیش جیاوازن لە ٥٠٠٠$ وە تیایدایە تا ٥٠٠ دیناری چاپی نوێ، ئامانج لەم بلاوکردنەوەیە چەند هۆیەکی رون‌و ئاشکران، یەکەم ئەوەیە گۆڤارەکە سەرچاوەی داراییەکەی ئاشکرابکرێت‌و دووەم ئەوەیە ئەمە ببێتە نەریتێك کەخەڵك فێری کاری هەرەوەزی ببێت لەم پرۆژانەدا، بێگومان ئەو نەریتەی ئەنفالستان زیاتر هاندانی کەسانێکە کە هاوکاری پرۆژەی ئەو راگەیاندنانە بکەن کە سەربە دەسەلاّت نین، بەو واتایەی دەسەلاّت باربۆیان ناکات، ئەمە بەو مانایە نیە کە یارمەتی حکومەت رەت دەکاتەوە، نەخێر بەپێچەوانەوە، ئەوەی لەئەنفالستاندا دەیبینی دەلالەتی ئەوەیە ئەگەر حکومەتیش هاوکاری پرۆژەیەك نەکات، خەڵك دەیکات، ئەگەرچی تموحی من وەکو خۆم زۆر لەوە زیاترە بەگۆڤارێکی ساڵانەوە بوەستم، بەدڵنیاییەوە ئەگەر توانای دارایی هەبوایە بەلای کەمەوە ئەنفالستان بەوەرزی دەردەچوو، نەك ساڵی جارێك، بەڵام ئەو کەسانەی هاوکاری ئەنفالستان دەکەن، زۆربەی هەرە زۆریان خەڵکی هەژارن، زۆربەشیان کەسوکاری ئەنفالکراوەکانن بەتایبەتی خەڵکی گەرمیان، ئەو داهاتەی دەیبەخشنە ئەنفالستان داهاتێکی زۆر نیە، بەلاّم دەلالەتێکی گەورەی هەیە، هەرچۆنێك بێت کارێکی گرنگە ئەنفالستان وەفاداری ئەو خەمخۆریەی ئەوکەسایەتیانەیەو هەر دەنگی ئەوانیش دەبێت.

کۆمەك کردن و گەشتنە دەستی بڕ پارەکان بێگرفت نیە، چونکە ئەم ولاّتە ولاّتێکی نۆرماڵ نیە خەڵك لەرێگەی ژمارەی حسابەوە کۆمەکت بۆ بنێرت، کۆکردنەوەی ئەو

داهاته زۆر زەحمەته، ڕێگەیەکی تەقلیدیو کلاسیکیه، تەنها لەڕێگەی ئەو هاوکارە دڵسۆزانەوەیە کەهەڵدەستن بەکۆکردنەوەی کۆمەکی ئەو ژمارەیەی ساڵنامەکە، لەدوای کاری نەخشە سازی کۆمەك لەکەس وەرناگرین، ئەمساڵ بەنیازنیم لەڕێگەی تەلەفۆنەوە کۆمەك قبوڵ بکەم، چونکە ئەوەش بۆخۆی گرفتێکی ترە، زۆرجار کەسەکان ناویان نوسراوە، بەڵام هەتا ئێستاش بڕی کۆمەمەکەیان نەگەیشتووەتە ئەنفالستان. واتە بەڵێنی زارەکی داوە، بەڵام جێبەجێی نەکردووە، ئەگەر حسابات هەبێت ئەوە لەسەر ساڵنامەکە ماڵە، بەڵام لەڕاستیدا نەگەیشتووە، هەتا ئەم لەحزەیە کەلەگەڵ بەڕێزتان قسەدەکەم کۆمەکی ژمارە سێ بڕێکی زۆری نەگەیشتووەتە دەستمان، هەروەها ژمارە (٤)یش بەهەمان شێوە نزیکی ٧٥٠٠٠٠ حەوسەدوپەنجا هەزار دیناری نەگەیشتووەتە دەستمان.

ئەوەی من مەبەستمە لەبڵاوکردنەوەی ناوی ئەو بەڕێزانە ئەوەیە ووردەوردە ئەو ساڵنامەیە بەڕاستی ببێتە بڵاوکراوەی خۆیانو خۆیان بەکاروبارییەوە هەستن، بەتایبەتی تریش مەبەستمە لە ڕۆژانی پیربوونو مردنی خۆمدا گەنجانی کەسوکاری قوربانیەکان خۆیان دەریبکەن و بەهەرەوەزی هەموو لایەکیان دەربچێت، نەك چاویان لەدەستی حزبومیزانیەی حکومەتەوە بێتو مەرجیان بەسەردا فەرزبکات.

**عەرعەر: کەس هەیە بەڕاشکاوی دژایەتی دەرکردنی ساڵنامەکە بکات.؟**

عومەر محەمەد: بێگومان هەیە، بەڵام ئەو کەسانە خەڵکانێك نین کۆسپی سیاسی دروست بکەن، هەندێکیان دژایەتیەکانیان لە ڕێگەی تۆمەت هەڵبەستنو پرتەو بۆڵەو هەندێکیان دەیانەوێت کارەکە بێ بایەخ بکەن، زۆربەشیان لەوانەن کە پێیان خۆش بووە جێدەستیان دیاربێت بێئەوەی کارێك بکەن، یان لەو ڕۆژنامەنوسانەن کە لەبری دەستخۆشی تانەیەکی هەیە. بەڵام من کاری خۆم دەکەمو خۆم بەو کەسانەوە سەرقاڵ ناکەم، ئەوانەشی خۆیان بەمنەوە سەرقاڵ دەکەن کارێکی خراپ دەکەنو خۆیان ماندو دەکەن لەبەر ئەوەی من دژایەتیان ناکەم، ئەوان هەنگاوێك هاتنە پێشەوە بۆ دۆستایەتی من دوو هەنگاو دەچمە پێشەوە، ئەگەر نەشهاتن دڵنیام سبەی پەشیمان دەبنەوە، لەبەر ئەوەی من بڕوام وایە ئەوانیش بە جۆرێك لە جۆرەکان قوربانیەکی تری ئەم کۆمەڵگایەن، خۆ مەرج نیە ئەوەی ئەنفال نەکرابوو قوربانی نەبێت، بە پێچەوانەوە هەمیشە قوربانی بەتەنیشتمانەوەیە.

# ئەو منداڵانەی
# بێ باوك هاتنە دنیاوە

ئا : عەرعەر



ئەو نازەی کە هەموو کەسێك لە منداڵیدا پێویستی پێیەتی تاوەکو بەو هەست و سۆزەوە گەورە بێت کەپێی دەوترێت سۆزی باوکایەتی، بەشێوەیەك کە هەموو باوکێکێك ئامادەیە لە پێناوی خۆشبەختی منداڵەکەی هەموو قوربانییەك بە جەستەی خۆی بدات. ئایە ئەگەر منداڵێك لەو سۆزە بێبەش بێت دەبێت جیاوازی لە گەڵ منداڵانی ئاسایی کۆمەڵگادا هەبێت، یان نەبوونی ئەو سۆزە چ کاریگەرییەکی دەروونی لە لای ئەو منداڵە بێبەشبووانەی سۆزی باوکایەتی بەجێ هێشتبی ، یان نەبوونی ئەم سۆزە دەبێت کاریگەری کردبێتە سەر هەڵسوکەوتی ئەم منداڵانە.

نیگار محەمەد ئەمین یەکێکە لە منداڵانەی کە سێ مانگ دوای مردنی باوکی لە دایکبووە ئێستا خوێندکارە لە پۆلی شەشەمی ئامادەیی وتی" کاتیك گەورە بووم بیستم باوکم نییە پرسیارم لە کەس و کارم کرد وتیان باوکت ئەنفالە لەوکاتەوە ئاشنای وشەی ئەنفال بووم، کە رژێمی سەدام لە ساڵی ١٩٨٨ زۆر دڕندانە کەوتە گیانی ئەو خەڵکەو

هەموویانی ئەنفال کردو وتیان باوکی تۆش بەر ئەو شاڵاوە کەوتووە" نیگار دەڵێت "ئەنفال بەڵای منەوە کارەساتێکی زۆر نامرۆڤانەو دڕندانە بوو کە دەرهەق بە گەلی کورد کرا، بڕوا ناکەم تا ئێستا کەس بتوانێ پێناسەی ئەنفال بکات"، ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد بێجگە لەو وێنەیەی لەسەر کاخەز بۆی بەجێماوە هیچ وێنەیەکی تری لا دروست نەبووە، وتی من لەگەڵ منداڵانی تر جیاوازیم هەیە چونکە هیچ کەسێك ناتوانیت شوێنی باوکم بگرێتەوەو سۆزی باوکایەتم پێببەخشێت وتیشی "ژیانی بێباوکی وەك نەبوونی ئەندامێکی لەش وایە بەبەردەوام ئازارم دەدات و لە ژیانێکی بێمانـاو هەژاری و پڕ دەردەسەری و نا ئومێدی دەژین"، نیگار ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کەتا ئێستا ئاوڕیان لێ نەدراوەتەوەو هاوکاری نەکراون بە پێی پێویست و هیچ کەس نەیتوانیووە لە نەهامەتییەکانیان کەم بکاتەوە، وتی" داواکارم لە حومەت لەمەودوا بتوانێ هاوکاریمان بکاتو برینەکانمان سارێژ بکات و جێگای باوکمان بۆ بگرێتەوە.

شادییە ئیسماعیل ناسراو بە (ئیڤا)، بۆیە بەو ناوەوە ناسراوە چونکە لە کاتی پرۆسەکەدا لە ئیڤادا لە دایك بووە کاتێك خەڵکەکەیان رادەگواست لە دێهاتەکانەوە بۆ تۆبزاوەو نوگرەسەلمان، شادییە دەڵێت "کاتێك کە گەورە بوو وەکو زەنگێك بە گوێچەکەیاندا چرپاندم و پێیان وتم شتێك هەیە بەناوی ئەنفالەوەو چەندان کەسی لە گەنجو پیرو منداڵیان راگواستووەو کەس نازانێت چییان بەسەردا هێناون"، ئاماژەی بۆ ئەوکاتانەش کرد کە لە نێو قوتابخانەدا بووەو زۆرجار پرسیاری لە خۆی کردووە بۆچی باوکی نییەو بەڵام پێیان دەوت باوکت ئەنفالە بۆیەش پێناسەی بۆ ئەنفال دەکردو وتی "ئەنفال لای من برینێکە هەرگیز سارێژ نابێت"، باسی ژیانی خۆی دەکرد و دەیوت من جیاوازییەکی زۆرم لەگەڵ منداڵانی تر هەیە، چونکە ئەوان بە نازی دادەو بابە گەورە بوون بەڵام من لە نازی هەردووکیان بێبەش بوومە وتی "زۆربەی ژیانم بە چەرمەسەری و تاڵی دەگوزەرێنم چونکە کەس نەبووە دەستێکی باوکانە یان دایکانە بەسەرمدا بێنێت"، شادیە رەخنەی لە کارەکانی حکومەت دەگرت و دەیوت تا ئێستا حکومەتی هەرێم نەیتوانیووە کەمێك یارمەتیمان بدات و لە ژیانی بێنازیدا کەمێك یارمەتیدەرمان بێت.

ئارام حەسەن نەزر یەکێکی تر بووە لەو منداڵانەی کە شەش مانگ دوای مردنی باوکی لە دایك بووبوو ئێستا لە ناحییەی شۆرش نیشتەجێیە وتی "کاتێك چومە ناو هاوڕێیان و باس باوکییان کرد ئەو کاتە زانیم باوکم ئەنفالە لەو کاتەوە زانیم من کەسێك

دوورم لە سۆزی باوکایەتی و بێبەشم لەو سۆزەی خودا بە هەرکەسێکی بەخشیووە" ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ژیانی بێ باوکی زۆر بە شێوەیەکی ناخۆش بەسەر بردووەو لە منداڵییەو تا ئێستا کە زۆربەی هۆکارەکان بۆ خراپی باری ئابووری ژیانیان دەگێڕایەوەو وتی "تا ئێستا هیچ کەسێك بە پێی پێویست یارمەتی نەداون" ، هێمای بۆ ئەوەش دەکرد کە ئێستا هیچ وێنەیەکی باوکی لەخەیاڵدا نییە جگە لە وێنەی کە لەماڵدا بەجێماوە، وتیشی "گومان لەوەدا نیە کە جیاوازی گەورە لە نێوان ژیانی ئێمەو ژیانی منداڵانی تردا هەیە، چونکە ئێمە هەر لەسەرەتاوە لە رووبەرووبونەوەی کێشەو گرفتەکانی ژیانماندا بووین و بۆ هەمیشەش وادەبین".

کەژاڵ محەمەد ئەمین یەکێکی ترە لەو منداڵە بێباوکانەو حەوت مانگ دوایی ئەنفالکردنی باوکی لە دایك بووەو خوێندکاری پۆلی پێنجەمی وێژەییەو وتی" لەو ساتەوەی ئەنفالم پێناسراوە، گەورەترین و دڵتەزێنترین کارەساتێکە کە هەرگیز لەبیرم لاناچێت بە تایبەت کاتێك زانیم باوکیشم ئەنفالە لەو ساتەوە هەستێکی تەواو ناخۆش لە ژیانمدا دروستبووە"، ئەو پێناسەی بۆ ئەنفال دەکرد و دەیوت" ئەنفال لای من دزینی سۆزی باوکایەتییە"، بەروویەکی تەواو بێزارو پڕ لە خەمەوە دەیوت" رژێمی بەعس بە زۆر باوکمیان لێسەند و لە میهرەبانی و سۆزی ئەو بێبەشیان کردم"، هەروەك ئاماژەی بۆ ئەوش کرد کە لە نێو هاورێکانیدا بووەو باسیان لەوە کردووە، کە باوکییان بردوونی بۆ بازاڕو جلی بۆ کڕیون و وتی" لەو کاتەدا بێدەنگ دەبووم و هەندێك جاریش دەگریام و ئاواتە خواز بووم وەکو ئەوان باوکم هەبوایە"، هێمای بۆ ئەوە کرد، کە تەنها لە وێنەدا باوکی بینیوە، بەڵام بە پێی ئەو وەسفەی کە دایك و کەسە نزیکەکانی بۆیان باس کردووە وێنەیەکی وەها لە زیهنیدا دروست بووە کە لە شێوەی کەسایەتی باوکیدا بووە، تیشکی خستە سەر ئەوەش کە نەبوونی باوك بەشێکی زۆر لە کەسایەتی منداڵ دەبات، ئەمەش وادەکات هەمیشە ئەگەر بە رەنگیشدا بێت منداڵانی بێباوك لەو منداڵانەی کە باوکییان هەیە جیاوازبن، وتی" بەڵام من تا رادەیەك دایکم توانیوییەتی جێگای باوکمان بۆ بگرێتەوەو ئەگەر کەمێکیش بێت لە سۆزی ئەومان پێ ببەخشێت هەمیشە ژیانی خۆی لە پێناو ئێمەدا بەخت کردووە".

نیان عادل چوار مانگ دوای باوکی لە دایك بووە، وتی "رۆژێکیان لە کۆڵان یاریم دەکرد و یەك لە هاورێکانم رای کرد و وتی باوکم هاتەوە، منیش یەکسەر ئەوەم بە بیردا

هات بۆ من باوكم نییە؟ كاتێك لە دایكم پرسی وتی باوكت ئەنفالە، دواتر وشەی ئەنفالی بۆ رون كردمەوە ئیتر لەو كاتەوە ئاشنای كارەساتی ئەنفال بووم و زانیم باوكیشم یەكێكە لە قوربانیانی ئەنفال و منیش ئەو كەسەم كە بێبەشم لەو سۆزەو هەتا كۆتایی ژیانم كەسێك نییە پێی بڵێم باوە!!!" وتیشی "من هیچ وێنەیەكی باوكم لە خەیاڵمدا دروست نەبووە لەبەر ئەوەی بۆ چركەیەكیش نەمبینیوە تابتوانم بە خەیاڵیش وێنەیەكم لادروست ببێت"، ئاماژەی بۆ ئەو جیاوازییە زۆرەش كرد كە لە نێوان ئەو و منداڵانی خاوەن باوك و دایكدا هەیەو وتی" جیاوازییەكی زۆر هەیە، چونكە ئەوان بە سۆزی دایك و باوك گەورە بوون، بەڵام ئێمە لە سۆزی باوكایەتی بێبەشین، كە ئەمەش لە رووی كەسێتییەوە كەلێنێكە لە ژیانمان"، وتیشی "نەبوونی باوك لە رووی مادیشەوە كاریگەری زۆری لەسەرم هەبووە، چونكە باوك هەموو پێویستییەكی منداڵ دابین دەكات، بەڵام من لەوە بێبەشم و ئەو ئەركە لەسەر شانی خۆمدایە"، بە بێزاریشەوە دەیوت" هەر لە منداڵییەوە كەوتومەتە ناو جەنجاڵی ژیانەوەو حكومەتی هەرێمیش نەیویستووە رۆژێك لە رۆژان سۆزی باوكایەتی بە من ببەخشێت و بە من بڵێت راستە بەعس تۆی لە سۆزی باوكایەتی بێبەش كرد بەڵام ئەمڕۆ هەر كێشەیەكت هەیە ئێمە دەتوانین چارەسەری بكەین و هاوكاریت بكەین"

# ئـەنـفـال
# بیرکردنەوەیانی بێ سەروشوێن کرد

**ئا: عەرعەر**



"چی بگێڕمەوە برام کێ دەتوانێ بیانگێڕێتەوە، ئەوە بەڵایەك بوو بەسەرماندا هات و بیرکردنەوەشمانی بێ سەروشوێن کرد" لەتەنیشت مێردە پیرەکەیەوە، بەدڵێکی پڕەوە مریەمە مالیك-ی 79 ساڵ دەیویست یادەوەرییە تاڵەکانی ڕۆژانی ئەنفالکردنیان بگێڕێتەوە، ئەو خاوەن چوار کوڕی بێسەروشوێنی پرۆسەی ئەنفالەو بەدرێژایی حەوت مانگ شاهێدی گەورەترین سوکایەتی و ئازاردانی زیندانەکانی (دوبز و تۆپزاواو نوگرە سەلمان)ە کە ئەوماوەیە جمەیان هاتووە لەژن و منداڵ و پیر و گەنجی ئەنفالکراوەکانی گەرمیان، پیریی تەواو بەرۆکی پێگرتووەو بەئەستەم دەنگی دەردێت، وەك خۆی دەڵێت زاکیرەی بەشی ئەوەی تێدا نەماوە هەموو ماجەڕا تاڵ و جەرگبڕەکانی داڕزێنەرترین پرۆسەی کوردقڕان بگێڕێتەوە.

مریەمەو محەمەد عەلی محێدینی هاوسەری لەشەش کوڕ ئێستا کوڕێکیان ماوەو لەیەکێك لەو خانووانەدا دەژین کە لەخوارووی رۆژهەلاّتی ناحیەی شۆڕشەوە بۆ کەسوکاری ئاوارەکان دروستکراوە، کەدەیانەوێت باس لەومانگە تالاّنە بکەن لەزیندانەکانی بەعسدا گوزەراندیان بەهەردووکیانەوە ناتوانن بەتەواوی بیگێڕنەوەو جارجار بیری یەکترییان دەخستەوە کە لەدوبز چییان بەسەرهات و پاش ئەوە ژینە مەرگەساتەکەی نوگرەسەلمان، ئەوان خەڵکی گوندی بانگۆلی ناوچەی جەبارەن و هەرلەوێدا کەوتنە بەر پەلاماری سوپای عەرەب و جاشە کوردەکانی بەعس، مامە حەمە پێیوایە ئەگەر جاشەکان نەبوونایە مەحاڵ بوو سوپای بەعس بتوانێت بەوشێوە بەرفراوان و گەورەیە خەڵك دەستگیربکاتو بەو پەڕی نیگەرانیەوە دەڵی "بەچاوساغی قەومە جاشەکانی خۆمان عەرەب هاتە سەرمان ئەگینا کەی دەیانتوانی بێنە ئەو دەشتەو ئەو هەموو خەڵکە کۆبکەنەوە"، پەیبردن و دۆزینەوەی تەواوی وردەکارییەکانی کارەساتی ئەنفال لەناوچەی گەرمیان، خەریکە بەرەو لەناوچوون دەچێت، چونکە زۆربەی ئەوانەی کەگەڕاونەتەوە ئێستا لەبەردەم پیری و ئازاری رابردوودا نزیکە بەچۆکدا بێن جگە لەچۆنێتی گواستنەوەیان و هەندێك شتی تر کەمیان توانای گێڕانەوەی تەواویان هەیە، مامە حەمە وتی "بۆ کێی بگێڕینەوە، بەچی دەچێت ئەوەندەمان باسکرد خۆشمان بێزاربووین هیچ سوودێکی نییە، چاوەڕوانیی کوڕەکانم کوێری کردم، قورسی کارەساتەکە کاسی کردووم و تامردن بەرمنادات، بەخوا ناتوانم گشتی بگێڕمەوە، چونکە بەس خوا دەتوانێ ئەو حیکاتانە تەواوبکات".

بەدەست جولاّنەوەی بەردەوام و هەناسەبڕکێوە مامە حەمەو پورە مریەمە بەردەوام بوون لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکانی خۆیان لەکاتی ئەنفالدا، مامە حەمە بەوە دەستیپێکرد کە بەچاوساغی قەومە جاشەکانی خۆیان جەیشی بەعس هاتە سەریان و گشتیان کۆکردنەوە لەگوندەکەی خۆیان (بانگۆلی)یەوە بەرەو قادرکەرەم و ئەوجار بۆ تۆپزاوا و دوبز تکریت و لەوێوەڕا بۆ مەملەکەتە دۆزەخ ئاساکەی نوگرەسەلمان ئەوەی زیاتر لەبیرەوەریدا مابێتەوە نوگرەسەلمانو حەجاجە بێویژدانەکەی ئەوێیە وتی "لەتۆپزاوا گەنجەکانمان لێ جیاکرانەوەو ژن و منداڵ و پیرەکان مانەوەو دەستیانکرد بەناونووسینمان ئیدی لەکاتی ناونووسیندا بە بەرچاومانەوە بەردەبوونە ئەو خەڵکە، بێویژدانانە قامچی و شەلاّقیان دەوەشاند بەبێ هۆ، پیری تێدابوو بەرگەی نەدەگرت

بەکاریگەرییەکەی دەبورایەوەو لەهۆش خۆی دەچوو، بەدرێژایی ئەو رێگایانەی ئێمەیان پێ دەگواستەوە نەئاویان پێ دەدایین نەخواردن و نەشیاندەهێشت تەنانەت میزیش بکەین دەیانگەیاندینە نوگرەسەلمان"، مامە حەمە گەشتە باسی نوگرەسەلمان مریەمەی خێزانی پێی بڕیو وتی "واوەیلا لەوجەهەنەمە دوژمنەکەشم نەبرێتە ئەوێ" ، مامە حەمەش دواتە گێڕانەوەکەی بەردەوامبوو وتی" هەشت هەزار گیراوی تێدابوو تەنها جێگەی ژیان نەبوو ئەو هەموو خەڵکە یەك تەنکەر ئاویان بۆ دەهێنا ئیدی هەرچی سوکایەتی بوو بەوخەڵکە دەکرا لەکاتی دابەشکردنی ئاوەکەدا، چەندین جار ژن و ئیختیارمان دەبینی بەدار دەیانکێشا بەسەریداو دەبورایەوە، لەرۆژانێکدا دوو یا زیاتر سەمونمان هەبوو بیخۆین ئەویش هێندە رەق بوو لەداری وشك دەچوو".

مامە حەمە دایکی لەنوگرەسەلمان دەمرێت و خۆی و چوار پیاوی تر تەنها (دە دەقیقە) دادەنێن بۆیان تابیکەن بەژێر خۆڵەوەو دەڵێ "دایکم بەرگەی ئەو ئازارەی نەگرت و لەبرساندا مرد خستمە چاڵێکی بچوکەوە کەنیو مەتر قوڵ بوو، چونکە هێندە کاتیان نەداینێ تا بەدەستووری شەرعی و عورفیانە بینێژین" سەری داخست وەك ئەوەی یادەوەرییەکی ناخۆش بێزاری بکات، چیرۆکی مەرگی دایکی گێڕایەوە وتی "ئەوەبوو حاڵی مردووەکانیشمان، نە بەزیندوویی و نە بەمردوویی نەیاندەهێشت وەك ئینسان بەڕێیبکەین"، پورە مریەمەش وتی "هەرگیز شێوەی دێوەزمە ئاسای حەجاجم بیرناچێتەوە، چونکە ئەوەی پێی بڵێیت بەشەرییەت و ویژدان لەوکابرایەدا نەبوو کەم رۆژ هبوو خەڵك بەدەستی ئەو گیانی دەرنەچوایە"، مامە حەمە لەدەمی وەرگرتەوەو وتی "بەرازێك بوو بێ وێنە ئێستاش سڵ لەوناوە عەبوسە دەکەمەوە" ئێمەش پرسیاری ئەوەمان کرد دەتوانی شێوەی حەجاجمان بۆ باسبکەی؟ مامە حەمە وتی "ئەرێ وەڵڵا مەگەر بەردەکەی ئەلحەد بیرم بەرێتەوە" ئەوجار دەستیکرد بەوێناکردنەوەی شێوەی حەجاج و وتی "پیاوێکی کەتەو زلە بەقەد حوشترێك دەبوو دەست و مەچەکێکی قەوی و تەمەنی نازانم چەند ساڵ تێپەڕی بوو رەش پێستێکی رەزاگران نازانم لای ئێمە وابوو لەوبڕوایەدا بووم خواش چارەی نەدەویست، ئەو هەموو رۆژێك دەهاتە قاعەکان و بەئارەزووی خۆی لەخەڵکی دەدا، هەرکەسی بەدڵ نەبوایە دەیبردە حەوشەو جلی لەبەر نەدەهێشت و بەدارێکەوە بەو گەرما سوتێنەرەی نوگرەسەلمان دەیبەستەوە تائێوارە، ئەو بووە هۆکاری مردنی زۆر خەڵك و راستەوخۆ خۆی خەڵکی دەکوشت بەبێ هیچ هۆیەك کەدەهاتە قاعەکان دەتوت گورگەو هێرش بۆسەر مەڕ دەبات".

لەحەوشەکەی ماڵی خۆیان تەنها ئەوەی بیرمابوو بۆمان بگێڕێتەوە کەئامۆزایەکی لەپرۆسەی ئەنفالدا بێسەروشوێن کراو پاش پرۆسەی ئازادیی بەکراس و شەرواڵەکەیدا ناسییانەوە رەحمە کەریمی تەمەن 65 ساڵ ئەگەرچی خۆی بەرپرۆسەکە نەکەوت، بەڵام زۆربەی کەسوکاری خۆی و مێردەکەی بێسەروشوێنی پرۆسەی نەگریسەکەی ئەنفالن.

ئەو ئێستا ماڵیان لەگەڕەکێکی شارۆچکەی شۆڕشی نزیک چەمچەماڵەو تەنها ئەوەندەی بیرماوە کەجەیش و جاش بەپاڵپشتی فڕۆکە هاتنە چەمچەماڵ و شۆڕشەوە دەستیان کرد بەرەشبگیریی ئەوکەسانەی لەئەنفالەکان خۆی حەشاردابوو لەو دوو شارۆچکەیەو جاشەکان هەڕەشەیان دەکرد هەر ماڵێك داڵدەیان بدات خانووەکەیان بەسەردا دەڕمێنن.

رەحمە بەدڵتەنگییەوە چیرۆکی ئامۆزایەکی باوکی دەگێڕێتەوە کە لەئەنفالەکاندا راپێچ دەکرێت و پاش چەند مانگێك لەزیندان لەگرتوخانەی (بادوش)ی نزیك شاری موسڵ بەزیندوویی دەخرێتە ناو سەبی چیمەنتۆو دوای پرۆسەی ئازادیی بەکراس و شەرواڵەکەیدا ناسرایەوە.

دلێر مەحمود تەمەن 25 ساڵ دانیشتووی ناحیەی شۆڕش، زۆر خۆی بەبەختەوەر دەزانێت کەئەو کەسانەی ئەنفالیان کرد ئەمڕۆ دادگایی کراون، دلێر لەوکاتەی بەرپرۆسەی ئەنفال کەوت تەمەنی حەوت ساڵ بووە، بۆیە ناتوانێت حیکایەتەکان بگێڕێتەوە وتی "ئێمە ئەو مەرگەساتەمان بەسەردا هات ئەو هەموو ئازارەی چەشتمان بەقەد ئەوە ناخۆش بوو دوژمنەکانمان دەبینی وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچوون، ئەوکاتە هەستمان بەبێکەسی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا تاوانبارانی ئەنفال لە سێدارە نادرێن و هەر جارەو بە بیانویەکەوە دوای دەخەن و ئێمەی پێدەخەڵتێنن" هەروەها وتی "داواکارم چی زوترە ئەو کەسانە لەسێدارە بدرێن".